
ئایینەکانی ڕێگای ئاوریشم
گۆڕانی کولتووری ئایینی لە سەرەتاوە تا سەدەی پانزەیەم
ریچارد س. فۆلتز
وەرگێڕانی: کاژیوە
www.iqra.ahlamontada.com

ریچارد س.فۆلتز

# ئایینەکانی ڕێگای ئاوریشم

## بازرگانی وشکانی و گۆڕانی کولتوری لە سەرەتاوە تا سەدەی پانزەیەم

وەرگێڕانی: کازیوە

❑ **ئایینەکانی ڕێگای ئاوریشم**
❑ **بازرگانی وشکانی و گۆڕانی کولتوری لە سەرەتاوە تا سەدەی پانزە**
❑ نووسینی: **ریچارد س.فۆلتز**
❑ وەرگێڕانی: **کازیوە**
❑ دەرهێنانی هونەری ناوەوەو بەرگ: **خەلیل هیدایەت مام شێخ ٤٩٢٤٢٦٣**
❑ نرخ ( ٤٠٠٠ ) دینار
❑ شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەلات _ هەولێر ٤٦٣٩٥٣١ ٠٧٥٠
❑ لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
❑ ژمارەی سپاردن(١٠٤٥) ساڵی ٢٠١١

بەڕێوەبەری هونەری دەزگا
**سەلام محەمەد رەسول**

ڕاوێژکاری دەزگا بۆ بەشی مێژوو
**د. محمد عبداللە کاکەسوور**

## بەشی یەکەم

## ڕێگەی ئاوریشم و ڕێبوارەکانی

لە کۆتایی دەیەکانی سەدەی نۆزدەهەم دا، سەرسامی ئەوروپییەکان بە ئەوپەری جیهان گەیشتە لوتکە. ئیمپراتۆرییەکانی بەریتانیاو فەرەنسا جیهانیان بەرفراوان کردبوو و کاربەدەستەکانیان لە شوێنە داگیر کراوەکانەوە شتومەك و چیرۆکی سەیرو سەمەرەیان بۆ دەناردن. شاعیرو وێنەکێشەکانیش لەسەر لاپەڕەو بومەکانیان، خەون‌و ئاواتەکانیان دەربارەی ڕۆژهەلاتی سەرنجڕاکێش تۆمار دەکرد.

دوورترین قوژبنەکانی جیهان، پێرستی دۆزراوەکانی توێژەرانی ئەورووپیی تەواو دەکرد، رووپێوی شاخەکانیان دەکردو سەرچاوەی رووبارە گەورەکانیان دەستنیشان دەکردو نەخشەکانیان دەکێشاوە. ئەورووپییەکان بۆ یەکەمجار دەخزانە ناو تەبەت‌و وولآت دوورەدەستەکانی تر، هەروەك چۆن کاربەدەستەکانی بەریتانیی‌و رووسی‌و ئەلمانی ریسکیان دەکردو دەچوونە دوورترین شوێنەکانی ئاسیای ناوەڕاست‌و هەولّیان دەدا ڕێگەی بانگەشەی داگیرکەریی خۆش بکەن.

مێژووی زاراوەی ڕێگەی ئاورێشم، هەڵبەتە نەك راستەقینەکەی، دەگاتەوە ئەم سەردەمە رۆمانتیکیە. لەراستیدا، تۆڕی بازرگانی سەروئاسیایی کە جیهانی دەریای ناوەڕاست بە ئاسیای رۆژئاوا دەبەستێتەوە زۆرتر لە چوارسەد ساڵ لەمەوبەر گەنجێتی خۆی تێپەراند بوو[١]، ئەکتەرێکی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە

تۆڕێکی پیلانگێری بەناوی گەمەی گەورە[1]ی دروست کرد، واتە فێردیناند فۆن ریشتۆفێن[2]، زاراوەی "رێگەی ئاوریشم"[3]ی لە (زمانی خۆجێیی ئەلمانی) دروست کرد، کە بەرەبەرە بۆبە پێشاندەری هەستێك لە شتە سەیرو سەمەرەکان.

رێگەی ئاوریشم نەك رێگەیەك بەڵکو کۆمەڵە رێگەیەکی لە خۆ دەگرت، لەراستیدا تورێك بوو لەو رێگەوبانەی کە بەگشتی روو بە رۆژهەلآتو رۆژئاوا دەچوو، بەلآم چەند لقێکی دەچووە ناو ئێرانی باشوورو ستێپسەکانی باکووری ئوراسیاو لە باشوورەوە بۆ هێندوکیش تاکوو نیمچەدوورگەی هیندستان دەکێشرا. پێدەچێ ریشتۆفێن یەکەم کەس بوو لە مێژوودا کە رێگەی وشکانی یان ئەو رێگانە کە کاراونچی پێدا دەرۆیشت بەشێوەی چەمکی "رێگەی ئاوریشم" دەرهێنا. بەلایەنی کەمەوە هیچ کەسێکی تر بیری لە وەها ناوێکی دڵنشین نەکردبووەوە.

بەلآم رێگەی ئاوریشم لەوکاتەوە کە وەك چەمکێك دارێژاوەتەوە، ئەندێشەی رۆژئاواییەکانی یەخسیری خۆی کردووە. کۆمەڵێك خەیاڵی لە شارە ئەفسوناوییو هۆزە سەیروسەمەرەکان، کێوو بیابانە ترسناکو کردارە

---

[1] . The Great Game. گەمەی گەورە چەمکێکە کە ئارتور کۆنۆلی Arthur Conolly بە دانەری دەزانن، بۆ وەسفی کێبرکێو ملمانی ئیمپراتوری بەریتانیاو ئیمپراتوری رووسیای تێزاری بەکاردێت بۆ بەدەستهێنانی سەروەری لە ئاسیای ناوەڕاستدا. رووسەکان بەم کێبرکێو ملمانییە ستراتیجیکەیان دەووت (کێبرکێی سێبەرەکان). بەگشتی سەردەمی کلاسیکی گەمەی گەورە دەگەڕێننەوە بۆ نزیکەی ١٨١٣ تا پەیماننامەی ١٩٠٧ رووسو بەریتانیا. دوابەدوای شۆرشی بۆلشفیکی ١٩١٧ سەردەمی دووەم دەستی پێکرد کە توندییەکەی کەمتر بوو. لە Wikipedia.org.و.

[2] . Ferdinand Von Richthofen

[3] . Seidenstraβe

سەرسوڕهێنەرەکانی دژەمەرگی ڕێبوارەکانی ڕێگەی دژواری دووری[1] پێ بەخشیوین.

لە سەرەتای سەدەی بیستەم راپۆرتەکانی دۆزەران (لەم جۆرە گەشتان) کۆمەڵێك پەرتووکی پرفرۆش بووە کە تاکوو ئیستاش هەر چاپ دەکرێن. زۆر چیرۆکی نووسراوە، فلیمی چیرۆکیو دیکۆمێنتی دروست کراوە، تۆری گەشتوگوزاریان دامەزراندووە، سەندوقی وەقفەکانی شوێنەوارناسییان رێکخستووەو کۆنفرانسی نێونەتەوەییان سازداوە، کە ناوەرۆکی هەموویان "ڕێگەی ئاوریشم" بووە. ڕێگەی ئاوریشم وەك هەموو زاراوەیەك کە جوانییەکەی پێناسەیەکی نادیاری هەیە دەتوانێ هەمان ئەو شتە بێ کە حەزمان لێیەتی، دەتوانی گەوهەری هەموو خەونەکانی ئێمە بێت.

چیرۆك نووسەکانی سەردەمیی ڕێگەی ئاوریشم چیرۆکەکانیان بە مەئوورییەتی چانگ چیانەوە[2] دەست پێ دەکەن. لە سالی (١٣٩ پ.ن) وۆدی[3] خاقانی خانەدانی هەن[4] لە چین، چانگ چیانی ناردە (سەرزەوییەکانی رۆژئاوایی) تاکوو لەگەڵ هۆزێکی خێڵەکی هیندو ئەورووپی، کە لەلای چینییەکان بە یوئەجی[5] ناسراون، ڕێککەوتنامەیەکی یەکێتی بنوسێ دژی کۆنفدراسیونی دانیشتوانی ستێپس[6] کە چینییەکان پێیان دەووت سیونگ نو[1]

---

[1] "ڕێگەی دژواری دوور" هەموو جێگەیەك بۆ ئینگلیزی long-dislanc:

بە بازارگانی از ایران بە تور　　　　بپیمودم این راه دشوار دور

(فیردۆسی)

[2]. Chang – ch'ien

[3]. Wu - ti

[4]. Han

[5]. Yueh chih

[6]. Steppe : بیابانی نیوەوشکانی بەرینی بزوێنی، لەگەڵ مێشەلانی پەرتەوازە، کە لە باشووری رۆژهەلاتی ئەورووپاو سیبریا دەبینرێ. لە ووشەی رووسی step بە واتای زەوی نشێو وەرگیراوە.و.

(لەوانەیە پێشینیانی هۆن/ خێونەکان[2] بوون). ئەم هۆزە بەهێرشکردنی جاروبارى بۆ سەر چینییەکان، کە تەنانەت دیواری گەورەی چینیش نەیدەتوانی ڕێگریان بێت، تەنگیان پێ هەڵچنی بوون. جانگ لە مەئوورییەتێکی کە پێی سپێردرا بوو ناکام بوو بەلاّم زۆر شت لەگەشتەکانی فێربوو کە ماوەی سێزدە ساڵی خایاندو لەوانەیە تاکوو باکوور ڕۆژئاوای هیندستانیش چووبێت. لەم ماوەدا سێونگ نۆوەکان گرتیانو زیندانیان کرد، بەلاّم ڕای کردو کاتی گەڕانەوەی بۆ وولاّتەکەی بەر لەوەی بتوانێ ڕاپۆرتەکەی پێشکەشی خاقان بکات، دووبارە گیراوو بەندکراوە.

نووسەرێك ووتویەتی مەئوورییەتی چانگ زۆرتر "مەئوورییەتێکی سیخۆری بوو لەگەڵ کەسانی بێ کەڵك[3]"وەك بالێوزێکی فەرمی.

ئەو چیرۆکانەی کە ئەم ڕێبوارەی ولاّتو هۆزەکانی ڕۆژئاوا[3] بۆ وودی وتبووی، دەرفەتێکی هەڵخەلەتێنەر بوو بۆ ئالوێری بازرگانی. لە ماوەی چەند ساڵدا بازرگانەکانی چینی مەترسی گەشتی دژواری ڕۆژئاوا لە ڕێگەی دالانی گانسۆ[4] بەدەوری بیابانی ترسناکی تاکلاماکان[5]و ئاسیای ناوەڕاست بە گیان کری.

---

[1] . Hsiung - nu

[2] . Hun

[3] ـ لەم پەرتووکەدا مەبەست لە ڕۆژئاوا واتە ئەو سەرزەوی و ولاّتانەیە کە لە ڕۆژئاوای چین دان، بۆ نمونە ئاسیای ناوەڕاست، هیند ئەگەر جگە لەوە بێ ئامازەی پێ دەکرێ.و

[4]- Gansu

[5]- Takla MakanK , نووسراوەی روومی دەستەواژەی چینی T'a-k'o-la-ma-kan Shan-mo تا۔ کو۔ لا ـ ماگەن ـ شەن مۆ، بیابانێك کە زۆرترین بەشی هەرێمی تاریم (طارم Tarim) پێك دێنێ.... (فەرهەنگی جوگرافیای وێبستێر).و

ڕەنگە لە ماوەی ٢٠ ساڵی داوتر، بازرگانی لەم ناوچەدا پەرەی سەندووە. وۆدی حەزی دەکرد بەتایبەتی ئەسبەکانی ناوچەی دایۆئان[1] بەدەست بێنیێ کە لەوانەیە هەمان دۆڵی فەرغانەی ئۆزبەکستانی ئەمڕۆ بێت کە چانگ چاوی پێکەوتبوو. چینییەکان بەم ئەسپانەیان دەووت "ئەسپەکانی ئاسمان" یان "ئەسپە ئاسمانییەکان" کە لە جیاتی عارەقە خوێنیان دەردەدا (نیشانەی جۆرە خۆرکەێکی پێستییە). بەڵام خەڵکی دایۆئان حەزیان لە فرۆشتنی ژمارەیەکی زۆری ئەم ئەسپانە نەدەکرد، لەئەنجامدا لەساڵی (١٠٤پ.ن) خاقانی هەن سوپایەکی گەورەی بە سەرکردایەتی گۆوانگ[2] ڕەوانەی ئەوێ کرد کە هەڵگری ئەم فەرمانە بوو کە بە زۆرەملی دەبێ ئەسپەکان بەدەست بێنێت. چونکە بژێوی سوپا بۆ ئەم ڕێگەیە کەم بوو، زۆربەیان بەهۆی برسێتییەوە گیانیان لەدەست دا.

وۆدی پشتگیرییەکی بەهێزی لێ کردنو پاش دووساڵ گەیشتنە شوێنی مەبەستو لەکۆتاییدا بەزۆری وایان لە دانیشتوانی دایۆئان کرد کە ناچاربوون پەیماننامەکە پەسەند بکەن. هەرچەند چینیەکان لە کۆتایی دا توانیان تەنیا سی دانە لە (ئەسپەکانی ئاسمان) ببەنە چین بەڵام بێگومان ئەو ڕێگە بازرگانییە کرابووەوەو بەڕیوەبردنی بەشی ڕۆژهەڵاتی ڕێگەکە کەوتبووە دەست بنەماڵەی هەن.

سەرەرای بەرجەستەبوونی ئەم ڕووداوە کە بە چڕوپڕی لە سەرچاوەکانی چینی دا باسی کراوە، لەوانەیە بازرگانی وشکانی سەرووئاسیایی زۆر زررتر لە سەردەمی هەن ڕۆژئاوای بە چین بەستبێتەوە. ﴿لە میسر ئاوریشمێکیان دۆزیوەتەوە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (١٠٠٠ پ.ن) و لە ئەورووپاش نزیکەی سێسەد ساڵ دواتر[4]﴾. بەڵام تاکو ئێستا کەسانێکی کەم

[1] - Ta-yuan

[2] - Li-kuang

هەن ـ ئەگەر هەر کەسانێك بووبێتن ـ کە توانیبێتیان ئەم گەشتە دووروودرێژ و ماندووکەرەی سەرووقارەییە وەك تاکە گەشتێك بگرنە بەر. لە قۆناغی دوابەدوای یەکدا ئاوریشم و کاڵا گرانبەهاکانی تریان دەگوازتەوە کە تا رادەیەك توری ئابووری و سیستێمی رامیاری جیاوازیان هەبوو.

ئەزموونی نیکۆلۆ، مافێئۆ مارکۆ پۆلۆ، کە هاتووچووی تەواوەتی مەودای نێوان ڤنیزا تاکوو چینی لە سەدەی سێزدە دا دەگرتەوە، ئەوەندە دوور بوو کە هاووڵاتییە ئیتالییەکان بروایان پێ نەدەکرد. پۆلۆکان سەرکەوتنەکەیان قەرزاری پاکس مەنگۆلیکا Pax mongolica یان ئاشتی و سەقامگیری مەنگۆلەکان بوون کە بۆ یەکەمجار لە مێژوودا ئوراسیایان هێنایە ژێر دەسەڵاتی دەسەڵاتێك. لە سەدەی دواتر دا کەسانی تریش، هەم ئاسیایی و هەم ئەورووپی، گەشتێکی وەها گەورەیان دەست پێکرد. تەنانەت بازرگانێکی ئیتالی سەدەی چواردە گەشتنامەی ئاسیای بۆ بازرگانەکان نووسی[5]. بەڵام بەگشتی ئەم جۆرە پەیوەندییە تاکە کەسییە راستەخۆیەی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا دەگمەن بوو.

رەهەندی مێژوویی بەم شێوە بوو کە رۆڵی زۆربەی بەشداربووان لە راگوازتنی شتومەك لە سەرانسەری ئاسیا دا بارێکی گوازێنەری هەبوو. لەوانەیە دەڵاڵەکانی ئاسیای ناوەراست بۆ سەرزەوییە نەناسراوەکانی رۆژئاوا یان رۆژهەڵات سەفریان کردبێت، تەنانەت لەوانەیە لەوێ نوسینگەی بازرگانیشیان دانابێت، بەڵام لە مێژوودا نموونەی بەڵگەدارمان نییە کە لەسەردەمی پێش مونگلۆلەکان کەسانێك بۆخۆیان راستەوخۆ ئاوریشم یان شتی تریان لە چینەوە بۆ وڵاتانی کەنارەکانی دەریای ناوەراست بردبێت[6]، بە پێداچوونەوە بە رابردوودا دیسان پەیوەندییە گشتییەکان ئاشکرا دەبن. هەر بۆیە، چون پەسەندمان کردووە کە ناونانی رێگەی ئاوریشم داهێنانێکی نوێیە، وەك چەمکێکی گشتی رایدەگرین کە نیشاندەری تورێکی ئالۆزە کە لە چەند رێگەیەکی کاروانچییەکانی سەرانسەری ئاسیا پێك هاتووە.

## زاناکان یاخود هەڵخەڵەتێنەرەکان

ئێمە هەم چەمکی ڕێگەی ئاوریشمو هەم زۆربەی زانستمان دەربارەی مێژووی ئەم ڕێگەیە قەرزباری کارگێڕ ـ دۆزەرانی سەرەتای سەدەی بیستەمین. زۆریان وەك ئۆرێل ستاین[1]، ئالبێرت فۆن لوکۆك[2]، پۆل پیلیۆ[3]و لەنگدۆن وارنێر[4] ﴿پروفیسوری زانکۆی هارڤارد کە مۆدێلی ئیندیانا جۆنزئیستیون سپیلبێرگ (دەرهێنەری سینەما بوو)﴾ زانا بوونو زۆر بە قوولی دڵبەستراوی مێژوو و فرهنگی ئەو ناوچانە دەبوون کە سەردانیان دەکرد. زۆرجاران نەك تەنیا بووجەی حکومەتو پاڵپشتی دیپلۆماتیك بەڵکو لەلایەن موزەخانەو زانکۆشەوە پشتیوانیان لێ دەکرا. ئەوانە کۆمەڵێك شوێنەوارناسی بەئەمەك بوون کە لە وانەیە هەمیشە وورد نەبووبن بەڵام بە هەوڵ و شارەزایی زۆر یان خود بە پارەو فرتوفێل، زۆر گەنجی تەلارسازیو وێنەکێشیو وێژەییان دۆزییەوە کە ناوەرۆکی ئایینیان هەبوو.

نموونەیەك لە یارمەتی ئەم پیاوانە بۆ مێژووی ئایینەکان ئەوەیە کە پێش چالاکییەکانیان، شتێکی زۆرمان دەربارەی ئایینی مانەوی نەدەزانی کە ڕۆژگارێك نەیتێکی گەورە بوو. ئەم ئایینیە گنۆسیە[5] لەسەرتاسەری کەنارەکانی مەدیتەرانەو ئاسیای ڕۆژئاوایی جەماوەرێکی زۆری بۆ خۆی ڕاکێشا تا رادەیەك کە لایەنگرانی مەسیحیو زەردەشتیو موسڵمان بە هەرەشەیەکی گەورەیان دەزانی بۆ مانەوەی نەریتەکانی خۆیان. لە ڕۆژئاوا زۆر بەتووندی ئایینی مانەوی بنبڕ کراو تاکو کۆتایی سەدەی شەشەم شوێنەواری بوونی لەناوبرا. مانەوییەکان تاکوو سەدەی دەیەم لە ناوچە هەستیارەکانی ئیسلامی مابوو

---

Aurel Stein - [1]
Albert von le Coq - [2]
Paul Pelliot - [3]
Langdon Warner - [4]
Gnostic - [5]

بەڵام ئەم ئاینە حەوسەد ساڵی تریش لە ڕێگەی ئاوریشم دا، لە دوورترین بەشی ڕۆژهەڵاتی ئەم ڕێگە، مایەوە.

چەند سەدەیەکی زۆر مانەوییەت تەنیا لە ڕێگەی مشتومڕی دوژمنەکانی (وەك ئەگوستینی پیرۆز، کە سەرەتا مانەوی بوو) دەناسرا، تاکو سەرەتای سەدەی بیستەم کە بەرهەمە نووسراوە ڕاستەقینەکانی مانەوی دۆزراونەوە کە لەژێر بیابانەکانی تورکستانی ڕۆژهەڵات واتە سینجیانگ/شین جیانی ئێستا، لەبیر کرابوونو پارێزراون. (دواتر لە میسریشدا نووسراوەکانی مانەوی دۆزرانەوە.) ئەم نووسراوانە لەگەڵ وێرانەکانی خانوو تەلارەکانو چەند پارچەیەکی دیوارە نیگارکێشراوەکان، پاشماوەی وولاتێکی مانەوی سەدەکانی نۆیەمو دەیەم بوونو ئەمەش پاش بەفەرمی بوونی ئەم ئاینە بوو لە ئیمپراتۆریەتی تورکی ئۆیغور دا.

نامەوێ بڵێم لە هەموو کاتێکدا زاناکانی سەرەتای سەدەی بیستەم مەبەستیان پاكو بێغەوش بووە. بۆ نموونە، ئۆرل ستاین تێدەگات کە ڕەببانێکی بووزیی کاتێك کە خەریکی چاککردنی غازی پەرەستگەیەك بووە، بەرێکەوت خەزێنەیەکی گەورەی نووسراوی دەستنووس دۆزیبووەوە. خۆی دەگەیەنێتە ئەوێو هانی ڕەببانەکە دەداتو دەبێتە خاوەنی دەستنووسەکان[1]، هەرچەندە ستاین ئەورووپی بوو بەڵام لەڕاستیدا شاگردی واتایی سیۆئان زانگ

[1]- لە ڕاستیدا "بزخری" (کەسێك کە کەلوپەلەکان بە کەمتر لە نرخی ڕاستقینەی خۆی دەکرێتەوە) دەکات. ستاینو هاوکارە چینییەکەی، جیانگ، ئەم ڕەببانە کە ناوی وانگ بوو هەڵدەخەلەتێننو بە چل دانە (نالی ئەسپی) زیو (نزیکەی ٥٠٠٠ ڕووپیە) هەموو دەستنووسراوەکان کە نزیکەی سێسەد بستەو نووسراوەکانی بووزیی چینیو نیگارو پەردەی بە زێر دووراو بوو، لە دەستیان دەرهێنا " ئەوەندە بۆ وانگ بەس بوو کە بگەڕێتەوە وولاتەکەیو هەموو ماوەی ژیانی لە ئارامی دا بژی" پاشان بە بەخشینی چوار (نالی ئەسپ)ی دیکە بوون بە خاوەنی ٥٠ بستەی تر لە دەقەکانی تەبەت.و وەرگیراو لە: Susan Whitefiled (2004): Aurel Stein and the Silk Road. P. 72

زیارەتکەری بووزیی بەناوبانگ بوو. بەهەمان شێوەکە زیارەتکەرەکەی سەدەی حەوتم زۆربەی بەرهەمەکانی سەنسکریتی رزگار کردو لە هیندەوە بردنی بۆ چین، ستاینیش پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد کە ئیستا ئەرکی ئەوە ئەم بەرهەمانە بباتە بەریتانیا. ستاین بیانو دێنێتەوەو دەڵێ "من خەریك بووم کارێکی خێرم دەکردو پاشماوەی بەرهەمی وێژەیی‌و هونەری دێرینی بووزیم بۆ زانستخوازی رۆژئاوایی رزگار دەکرد لە کاتێکدا خەڵکی نەزانی خۆجێیی لە رووی ئاگاییەوە بە تەمای خودا دایان نابوو و لە ئاکامدا لەناو دەچوون[8]."

فێن لوکۆك بەڵگەیەکی هاوشێوە دەخاتە روو بەڵام بە دەرئەنجامێکی خەماوی ترەوە، فەرمانی بە کرێکارەکانی دا تاکوو هەمووی ئەو دیوارانە دەربێنن کە دیوارنیگارەیەکی سەدەکانی ناوەراستی بووزیی‌و مانەوی لەسەر بوو بەڵام زۆر بە کەمتەرخەمی ئەم کارەیان کردو لە کاتی دەرهێنانی دیوارنیگارەکان‌و گوازتنەوەیان بۆ ئەلمانیا زۆربەی وێنەکان زیانی قورسیان بەرکەوت. لە کۆتایی شەڕی جیهانی دووهەمیش زیانێکی گەورەی تریان بەرکەوت، بە واتایەکی تر لەکاتی بوردومانی بەرلین لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە زۆربەیان لەناوچوون. ئەمرۆ تەنیا هەندێ چاپی رەنگی ئەو وێنە لەدەست چووانە ماوەتەوە کە فێن لوکۆك لەساڵی ١٩١٢ دەری هێنابوو[9]. سەرەرای ناوەرۆکی کەمتەرخەمی بانگهێشتەکەی ستاین، ئەمەش راستە کە رۆژئاواییەکان توێژینەوەیان لەسەر نووسراوەکانی رێگەی ئاوریشم ئەنجام داوە، هەرچەند بە هاریکاری زۆری زانایانی ژاپۆنی‌و چینیش بوو، بەڵام ئاشکرا بوو کە ئەم دەستنووسانە بە حەفدە زمانی جیاواز نووسرابوون کە زۆربەیان لەسەرەتای ئەم سەردەمە نەناسراو بوون. زۆربەیان پەرتووکی بووزین، بەڵام ژمارەیەکی بەرچاویان پەرتووکی مانەوی‌و مەسیحی نەستورین. ستاین بەڵگەیەکی بازرگانی سەدەی هەشتەمی یەهودیی دەستنووسی عیبری لەژێر خۆڵ دەرهێناوە کە کۆنترین نموونەی ناسراوی زمانی فارسی نوێی (ئیسلامییە)[10].

زماناسانی ئەورووپیی توانیان زۆربەی ئەم زمانانە بخوێننەوە کە لە مێژە لەبیر کراون و پاشان پرۆسەی وەرگێڕانیانی ئەم زمانانەیان بۆ سەر زمانە نوێیەکان دەست پێ کرد[1]. سەرەرای ئەمانە، ئێستا لێکۆڵینەوەی ئارکۆلۆجیکالی زۆر لە ڕۆژئاوای چین بە سەرپەرشتی و چاودێری دەسەلاتی چین ئەنجام دەدرێ. زۆربەی بابەتەکانی ئەم پەرتووکە قەرزاری دەستکەوتەکانی سەدەی بیستەمە کە بەهۆی هەوای ووشکی بیابانی چینی ڕۆژئاوا پارێزراون و بە هەوڵی زانا هاوچەرخەکانە ناوەرۆك و واتاکانیان روون کراوەتەوە.

نووسراوەکانی ئایینی و وێنە دۆزراوەکان لە تورکستانی ڕۆژهەلات (کە ئێستا بە زمانی چینی پێیان دەووترێ سینجیانگ) لەگەڵ بەڵگەکانی ئارکۆلۆجیکالی و نووسراوەکانی تر ئاسیای ناوەڕاست، گواهیییەکە بۆ تبایی سەیری ئەو بیرۆکە ئایینیانە کە لە مەسیحییەت و یەهودیت و ئایینی بووزیی و زەردەشت وەرگیراون. ئەم ئاوێتە لە تێکەلەیەکی تایبەت بە مانەوییەت دا دەردەکەوێ.

لە راستیدا واپێدەچێ کە لە سەردەمی پێش مۆدیرنیتەدا ڕۆژهەلاتی ئاسیای ناوەڕاست ببوو بە ئینجانەیەکی تاقیکاری[1] نەریتە ئایینییەکان، چونکە رۆڵی حەشارگەیێکی دوورکەوتووی هەبوو بۆ بیروباوەرە جیاوازەکان و لە سەردەمی مەنگۆلەکان لە رووی ئایینییەوە یەکێك لە شوێنە هەمەچەشنەکانی جیهان بوو. چۆنیەتی گۆرانی ئەم دەڤرە فرەئایینە بۆ ناوچە هاوتاکانی ئیسلامی جیهان، یەکێك لە ئالۆزترین دۆزەکانی مێژووی ڕێگەی ئاوریشمە.

## ئایین و بازرگانی

ئەمە ڕێکەوت نییە کە لە تەواوەتی مێژوودا بیرۆکەکان و تێکنۆلۆجیا لە ڕێگە بازرگانییەکاندا پەرەیان سەندووە و بازرگانەکان لە ریزی یەکەمین راگویزەرانی

[1]. melting pot

ئەوان دا بوون. لەم بوارە دا پێویست ئاوها بیربکرێتەوە کە بازرگانە گەڕۆکەکان تەنیا کاریان ئالوویری بازرگانیو ڕاگوازتنی کالآ نییە، بەڵکو لە ڕێگە دا لەگەڵ خەڵك هەڵسوکەوت دەکەن، ساتو سەودا دەکەن، کارتێکەریو وێناکانی ئەو خەڵكو دابونەریتانە لەگەڵ خۆیان دەبەنەوە ماڵ. تەنیا بازرگانەکان لە ڕێگە بازرگانییەکان دا هامووشۆ ناکەن، کۆمەڵێك لە ڕێبوارەکانی تریش لەم ڕێگایانە سود وەردەگرن کە چالاکی بازرگانییان تێدا دەکرێ. بازرگانەکانی جیهانی نوێ هێزی پێشخەری پشتەوەی پیشەسازی هێڵە ئاسمانییەکانن، تەنانەت ئەگەر ڕێبواری ئاسایی زۆر بیر لەم پەیوەندییە نەکاتەوە. هەروەها توری شارێگەکانی نێوان پارێزگاکان وەك ئامرازێك بۆ پەرەپێدانی گواستنەوە ئوتۆمبێلە گەورەکان دروستکرا ـ ئەم بیرۆکە دەبێتە هۆی ئەوەی کاتێك لەم ئوتوبانانە دا دەهاژۆنو بای ترێیلێرەکانتان بەر دەکەویو هەوڵ دەدەن سوکانی ئوتۆمبیلەکەتان کۆنترۆل بکەن، ئاوا هاتنەخوارەتان سوکتر بێت.

لەم ساڵانەی دوایی دا گرنگییەی زۆر دراوە بە ڕۆلی بازرگانی مەودا دوورو درێژەکان یان (ڕێگەی دژواری دوور) لە نیگارکێشی چەماوەیی[1] دا[12]. ئەم پەرتووکە کە بابەتە سەرەکییەکەی نمونەی تایبەتی پەرەسەندنی بیروباوەرەکانی ئایینییە، ئەوە دەخاتەڕوو کە دینەکان لە ڕێگاکانی بازرگانی وشکانی ئاسایی سەردەمەکانی پێش مۆدرێنیتە چۆن لەگەڵ بازرگانەکانو کاڵاکانیان هاوتەریب بوون. ئەم چیرۆکە سەربوردەی کۆچ، چاوپێکەوتن، کاردانەوەی دوولایەنەو وەلامەکان، گونجانو گۆڕانی نەبراوەیە. هەرچەند پێویستە خوێنەر سەرنجی ئەوە بدات کە ئەمە تەنیا بەشێکی جوولاوی مێژوویی زۆر بەرفراوانتری هەڵسوکەوتو ئالووگۆری بازرگانیو گرۆیی فرهنگییە. ئەگەر چی بازرگانی لە ڕێگەی دژواری دوور خۆی لە خۆیدا ڕوونکردنەوەی چەندێتیو چۆنێتی پەرەسەندنو تەشەنەکردنی ئایینیەکان

[1]. Cross-pollination

لەناو ئاسیا نییە یان بۆچی ئاسیاییەکان گرۆیان دەبن، بەڵام لێرەدا دۆخێك دێتە ئاراوە کە فاکتەرێکی گرنگە، ئەوەندە گرنگ کە ببێتە ناونیشانی نووسینی پەرتوکێك.

هەرچەندە ئەمرۆ هەندی لە نەریتە ئایینییەکانی ئەم چیرۆکە (مەسیحییەت، ئیسلام، یهودییەتو ئایینی بووزیی) ناسراون، بەڵام ئەگەر بێتوو بەشێکی زۆر لەوانەی کە دەربارەی هێما نوێیەکانیان دەزانین لە بواری ڕێگەی ئاوریشم لەخۆ دووریان بخەینەوە، بێگومان بە هەڵەدا چووین. ئەگەر چی زۆرجار باسی (مەڵبەندی مەسیحییت)، (جیهانی ئیسلام) و هاوشێوەی ئەمانە دەکەین بەڵام ئایینەکانی دامەزراو تاکەبەردی[1] و سەقامگیر نین کە هەرکامیان تەنیا لە سنوری دەسەڵاتی تایبەت بەخۆیان مابێتنەوە. لەڕاستیدا ئایینەکان وەکوو ئۆرگانیزمەکان وان: ڕۆژێك لەدایك دەبن، گەشەدەکەنو پێدەگەن، گورانکاری جۆراوجۆر بەسەریاندا تێپەر دەبێت، خۆیان لەگەڵ ژینگە دەگونجێنن، لەگەڵ جیرانەکان دەمەقالێیان دەبێت، ئەزموونی خودۆزینەوەی ئازاردەر دەبینن، ڕۆژگاری خۆشو ناخۆشیان هەیە. لەوانەیە لە جێگایەك وەك خانەکان دابەش بنو هەرکامیان ژیانێکی نوێ بگرێتە بەر. بەدرێژایی کات چونکە خۆیان نیشان داوە لەوانەیە لە بارێکی بڕوابەخۆبوونی پێگەیشتوو دا بمێننەوە. هەندێ جاریش لە کۆتایی دا دەمرن. ئەمانە تەنیا بەتایبەت لە چین دا دەتاوێنەوە. هیچ شتێك ناتوانێ گەوهەری هاوپەیکەری نەریتەکانی ئایینیی باشتر لە نمونە ئەزموونییەکانی ڕێگەی ئاوریشم وێنا بکات.

ڕێگەی ئاوریشم تەنیا ڕەهەندێك نەبوو کە تێیدا ئایینەکان دەستیان بەرز کردبێتەوەو سوار بووبنو چووبێتنە ڕۆژهەلات، بەڵکوو ئەم ڕێگەیە وەك دابونەریتی فۆرمدەرو بگۆر بوو. لە کۆتایی ئەم گەشتە پڕ جموجۆلە دا هیچ ئایینێك وەکوو خۆیو بەدەست لێنەدراوی نەدەماوە. کاریگەری فۆرمدەری

[1]. Monolithic

سەرەکی پێگەیشتنی سەرەتایی بزوتنەوەکانی مەهایانەو دیارپاك[1]، کە تارادەیەکی زۆر بوونە بەشێك لە شارستانیەتی ئاسیای ڕۆژهەلاَت، دەبێ لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کۆنترین ئایینی بوزیی لە ڕێگەی ئاوریشم دا بدۆزرێتەوە.

مانەوییەت کە لە ڕۆژهەلاَت (ئاسیاو رووم) دا ببوە خەباتێکی ژێرزەوینی، لە سەدەی هەشتەم دا وەك هێزێکی رامیاری بەهێز لە تورکستانی ڕۆژهەلاَت دا وەدەرکەوت، دواتر بەرەبەرە لەگەڵ جەماوەریی ئایینی رەمەکییانەی چینی تێکەلاَو دەبێت. مەسیحییەتی نەستوری کە وەك نوێگەریو هۆگری لە مەلبەندی بیزەنتی دەدەکرێو بەرەو ڕۆژهەلاَت دەرواتو سەدان هەزار کەس لە هۆزەکانی ستێپسی ئوراسیایی دێنێتە ژێر ڕەکێفی خۆی، چەند سەدە دواتر وەك خەونیاخۆشی یەکەمین بانگهێشتکەرانی کاسولیك لە چین وەدەر دەکەوێ. ئەمانە دەبینن کە مەسیحییەتی نەستوری وەك مەسیحییەتی ناسراوی ڕۆژهەلاَت زۆر بەئاسانی جێگیر بووە.

ئیسلام کە بە یارمەتی هێزی نیزامی عەرەبەکان بەرەوپێش چووبوو، لە ڕێگەی ئاوریشم لە سەدەی هەشتەم وەدەر دەکەوێو دوابەدوای شەڕی تەراز لە ساڵی ٧٥١ لە نیوەی ڕێگە دا ڕادەوستێ. ئیسلام راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ وەك ئایینەکانی پێش خۆی لە ڕێگەی بازرگانییەوە دەبردرێتە ڕۆژهەلاَت. ئەم نەریتە نوێیە بەهەمان شێوەی خاوەنداریتی عەرەبەکان نامێنێتەوە: بەلکو دەبێتە سامانی ئێرانییەکان، تورکەکانو چینییەکانو لە فەرهەنگەکانی ئەوان خۆی تێر دەکات. جگە لەمانە، بیرۆکەکانیش ئەگەر بیانهەوێ وکوو تاکەکان لە هەرێمەکانی بێگانە دا بمێننەوە پێویستە زوقو لایەنگری نوێ پەیدا بکەن.

---

[1]. Pure Land

هەبوونی ڕێگەو چالاکییە بازرگانییەکان کە نەبراوانە هەر لە کۆنەوە فەرهەنگە جیاوازەکانی بەیەکەوە دەبەستەوە بەو واتایە بوو کە بیرۆکە ئایینیەکان (وەك تەکنولۆجیاو رەهەندەکانی تری فەرهەنگ) دەیانتوانی زۆر بەئاسانی لە تورەکانی بازرگانی کە ئۆراسیاشی دەگرتەوە، پەرە بستێنن. لەڕاستیدا لەوانەیە ئەم پەرەسەندنە وەك ئاوێکی رەوان کە رووبارەکان دەدۆزێتەوە وەها بووبێت پێشی ناگیرێ. بەلاّم پێوەندی نێوان ئاین ـ بازرگانی لە دوولایەنەوە بەهێز دەکرا. بۆ نمونە، پەرەسەندنی ئایینی بووزیی داواکاری بۆ ئاوریشمی زیادکرد چونکە لە ئایینی بووزیی دا زۆر بەکاردەهات، پاڵنەری چالاکی بازرگانی لە ڕێگەی دژواری دوور، بە پلەی یەکەم ببوو بە ئاسانکەری پەرەسەندنی ئایینی بووزیی[13].

## ئەزموونی کاروان

لە ئاسیای پێش مۆدێرنیتە ئەگەر کەسێك ویستبای لە شوێنێکەوە بچێتە شوێنێکی تر، ژیرانەترین ڕێگەیەك (لە ڕاستیدا تەنیا ڕێگەیەك) کە گەرەنتی دەکرد ڕێبوارێك لەم گەشتە دا گیانی ساغ بەدەر بباتو بەساغی بگاتە شوێنی مەبەست ڕۆیشتن لەگەڵ کاروانێك بوو کە بەرەو هەمان رەهەند دەچوو. سەفەرکردن زۆر قورس‌و پڕ لە مەترسی بوو بەتایبەت ئەگەر کەسێك ویستبای بچێتە شوێنێك کە دوور بێت لە جێگای پرچەماوەر.

ئاسیای ناوەکی[1] ڕێگەی دووورودرێژی لەناو سەرزەوییە نامیهرەبانەکان دا هەیەو زۆر بێ ئاوەو دانیشتووەکانی کەمن کە زۆربەی کاتەکان مەودا دوورەکان لەیەکدی جودایان دەکاتەوە. بەرزترین‌و نالەبارترین کێوەکانی جیهان وەك بەربەستێکە لەسەر ڕێگەی نێوان کەنارەکانی مەدیتەرانە بۆ چین، هەروەها

[1]. مەبەست لە (ئاسیای ناوەکی) مەغۆلستان، ئاسیای ناوەڕاستی رۆژهەلاتی‌و سیبریای باشوورە. (نووسەر)

وشکترینو بەرفراوانترین بیابانەکانو هەرێمێکی لە ڕادەبەدەر وشکانی کە لە هاوینو زستان دا سەفەرکردن زۆر دژوار دەکات[1].

لە ڕووی سروشتییەوە دڕترین ناوچەکان بریتین لەوانەی کە زیاتر لە هەمووان لە دەزگاکانی دیوانی دوورنو ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی لەم ناوچانە دا زۆرترین هێرش بکرێتە سەر کاروانو کاراونچییەکانو ماڵو سامانیان تالان بکرێت[2]. کاروانەکان بەشێوازی جۆراوجۆر بەرەنگاری هەمووی ئەم کێشانە دەبوونەوە، لە کەنار کاروانەکان دا ایمنی هەبوو و هەر کاروانێك لە هەر سەفەرێکی دا سەدانو هەزاران ڕێبواری لەگەڵ بوو. ئەوان بە ڕێگەی کاروانچییەکان دا دەڕۆیشتنو ئەگەری بزربوونیان زۆر کەم بوو، ڕۆژانە مەودایەکی دیاریکراویان دەبری، لە شوێنێکی دیاریکراو مزلیان دادەنا کە دانیشتوانی ئەو ناوچانە چاوەڕوانیان بوونو پێداویستیەکانیان دابین دەکردن. زۆربەی ئالوگۆرە بازرگانییەکان لە ئەستۆی سەۆکی کاروانەکان بوو چونکە پێشتر لەم ڕێگانە دا سەفەریان کردبوو و شارەزاو ناسراو بوون، هەربۆیە هەوڵیان دەدا کە لایەنگری دانیشتوانی ئەو ناوچانە بەدەست بێنن کە کاروانەکان لە سەرزەوییەکانیان تێدەپەرین. هەندێجار کاروانەکان بۆ پاراستنی خۆیان بەتایبەتی لە شوێنە مەترسیەدارەکان دا سوپایەکیان لەگەڵ بوو.

خەمرکەکانی ڕێگەی ئاوریشم ـ مەڕو، بەلخ، بۆخارا، سەمەرقەند، کاشغەر، تورفان، خۆتەنو ئەوانەی تر ـ بوونو برەویان بەهۆی تێپەرینی کاروانەکان

---

[1] . سەرنجی چەند نمونەیەك بدەن بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی دژواری ئەم ڕێگەیانە:

| | | |
|---|---|---|
| همان مرحله است این بیابان دور | که گم شد درو لشکر سلم و تور | (فردوسی) |
| ندانی که ویران شود کاروان گه | چو برخیزد آمد شد کاروانی؟ | (منوچهری) |
| چرا دل بر این کاروان گه نهیم؟ | که یاران برفتند و ما بر رهیم | (سعدی) |
| ملول از همرهان بودن طریق کاروانی نیست | بکش دشواری منزل به عهد آسانی | (حافظ) |

[2] . (خەڵکێکن پیشەیان دزیو بڕینی کاروانەو ڕووخسار جوانن) (حدود العالم) (نمونەکان لە فەرهەنگی گەورەی گورتان). و.

بوو. چەند کاروانسەرایەکیان بوو کە ژمارەیەکی زۆری ڕێبوارەکان دەیانتوانی تێدا بخەون و شەوێك یان چەند شەو لەوێ مزل بخەن و هیلاکییان بحەسێننەوە، هەندێ شتومەکی پێویستو کەلوپەلی خۆجێیی ئەو ناوچە بکڕن و هاوردەکانی خۆشیان بە دانیشتوانی ئەو ناوچانە بفرۆشن. زۆرجار تەنانەت ئالوگۆڕیان بەو چوارپێیانەش دەکرد کە باریان لێ نابوون تاکوو چوارپێی چالاك و گورجوگۆڵ و تازەپشوو وەرگرن یان ئەسپێك بفرۆشن و ئێسترێك بکڕن چونکە بۆ سەفری دواتریان بەسوودتر بوو.

کاروانچییەکان زۆرتر شتومەکەکانیان بە ئەسپ و ئێسترو ولاغ رادەگوازت. لەبیاباندا وشتریان بەکاردێنا: لەباشوری رۆژئاوای ئاسیا وشتری یەك دووگەو لە بەرزاییە ساردترەکانی ئاسیای ناوەکی سودیان لە بۆختییەکان[1] وەردەگرت. لە خراپترین دۆخەکاندا یەك/یاك[2] یان هایناگ[3] بەکاردەهێنرا کە دوورەگەیەك بوو لە نێوان یاکێکی نێرو مانگای مێ. ولاغ و ئێستر بار هەلگربوون، بەلام ئەسپ و جوانەگاو و شتر ئەرابەیان رادەکێشا. خێرایی - کە بە هەنگاوی وشتر دەپێورا - زۆر خاو بوو: لە کاتژمێرێکدا چوار مایل (٦٤٣٦ مەتر، هەندێك زۆرتر لە فەرسەخێك) بەبێ بار، دوونیو تا سێ مایل بە بارەوە. ناوەندی باری وشترێك نزیکەی سێسەد پاوەند (١٣٧ کلیۆ) بوو. بەم خێراییەوە کاروانێك دەیتوانی تەنیا رۆژی سێ مایل رێ بپێوێت[14].

لەگەڵ ئەو رێك و پێکییە کە کاروان هەیبوو دیسان بەلاو کارەسات کەم نەبوو. لەوانە بوو تەنانەت پلاندارترین کاروانیش تووشی لەدەستدانی ئاوی جەستە، مردن بەهۆی برسێتی یان هێلاك بوون، بێت. زۆرجار وەهابوو کە کاروانێك لە رەنوی بەفر یان زیخ دا بزر دەبوو. تەنانەت کاوانە گەورەکانیش لە هێرشی

---

[1]. Bactrian
[2]. Yak
[3]. Hainag

جەردەو چەتەكان ئاسوودە نەبوون. بەگشتی سەفەركردن جگە لە تێچوونەكانی بریتی بوو لە مەترسی لە دەستدانی گیان. ئەگەر واز لە چیرۆكە سەیروسەمەرەكان بێنین، مرۆڤی ژێر هیوای دەخوازت تا ئەو جێگەی دەتوانی لە ماجرا خۆی دووربخاتەوە، خوداخودای بوو جارێكی دیكە بە ساغی بگاتەوە ماڵەوە !

ئاشكرایە كە هاتوچۆی بازرگانەكان لە ڕێگەی دژواری دوور دا بە پلەی یەكەم هۆكاری بازرگانی هەبوو. چونكە بۆ بەشێكی زۆری گەشتەكە جگە لە بازرگانەكان هیچ كەسێك نە ئەو ماڵو سامانەی هەبوو نەك پاڵنەر یان بوێرییەكی وەها كە گەشتێكی ئاوا پڕ لە مەترسی بكات لەكاتێكدا بەرهەمەكەشی نادیار بوو. لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە كە بۆچی ئەو شتومەكانەی لە ڕێگەی ئاوریشم دا رادەگوێزران بە بەراورو لەگەڵ قەبارەیان ئەوەندە بەنرخو گران بوون. بەلەبەر چاوگرتنی هەوڵێكی ئاوا ترسناك پێویست بوو بازرگان زۆر خۆراگر بێت تاكوو سودێكی زۆر لە شتەكانی بەدەست بێنێتو ئەمەش هۆكارێك بوو كە وای دەكرد ئەم سەفەرە ئەرزشی ئەو هەمووە رەنجەی هەبێت.

تەنانەت ئەو خەڵكەش كە بەمەبەستی تریش جگە لە بازرگانی دەهاتنە جەرگەی كاروانەكانەوە هەمان حال و رۆژیان هەبوو. مەئمورییەتە دیپلۆماتیكەكان پێبەپێی كاروانەكان ئەنجام دەدرا، و هەندێجاریش ئەو كەسانەی حەزو بەهرەی تایبەتیان هەبوو یان وایان بیردەكردەوە كە هەیانە، ڕێگەی بارەگا دوورەكانیان دەگرتەبەر بەو هیوایە كە گەورەكەیان كریارێكی دیكە پەیدا بكەن. هەندێك لە ڕێبوارەكانیش گیان سەختەكان بوون كە سەفەریان دەكرد تاكوو ئاگری كونجكۆلیان دامركێنن. كەسانێكیش بوون كە حەزی زانستیان هەبوو بەمەستی توێژینەوە سەفەریان دەكرد.

لەگـــەڵ پەیـــدابوونی ئایینـــەکانی مزگێنیـــدەر، بانگێـــشتکەرەکانیش وەدەرکـەوتن. سـەرەتا بووزییـەکان، پاشـان مەسـیحیو مانەوییـەکانو لـە کۆتاییشدا سۆفییە موسلمانەکان هاتنە جەرگەی کاروانـەکان کـە ئـەوانو (کـالا واتایان) ببەنە سەرزەوییە نوێیەکان. نەریتە ئایینییەکان لە گەشتەکەی رێگەی ئاوریشم دا بەرەو رۆژهـەلات لـە پەرەسـەندن دا بـوونو لـە درێـژایی رێگەکـە دا ریشەیان دادەکووتـا، رێبوارەکـانیش زیـاتر لـە جـاران دەیـانتوانی تەنانـەت لـە شـوێنە زۆر دوورەدەسـتەکانیش هاوئایینـەکانیان پەیـدا بکـەنو یارمـەتی رێبوارەکانیان دەداو لـە بەرامبـەریش دا رێبوارەکـان پێوەنـدی لەگـەڵ جیهـانی دەرەوەیان بۆ ئەوان بە خەلات دەهێنا.

پەرەسـەندنی نەریتـە ئایینییـەکانی لـە سەرانـسەری ئاسـیا دا یـەکێك لـە پاڵنـەرەکانی سـەفەری ئـایینی یـان زیـارەتی بـوو. بـۆ نموونـە، کاتێـك ئـایینی بووزیی لە چین خۆی گرت، بەرەبەرە لە ناخی بووزییەکان دا هەستی پێوەنـدی گرتنی راستەوخۆ لەگەڵ سەرچاوەکانی نەریتەکەیان لە هیندستان دروست بوو. ربنانەکانی چینی، کە بە ناوبانگترینیان فاسـیان لـە سـدەی پێنجـەمو سـیوئان زانگ لە سەدەی حەوتەم بوو، بە رێگەی ئاسیای ناوەڕاست لە رێگـەی ئاوریـشم دا سـەفەریان کـرد تـاکوو گەیـشتنە نیمـچەدوورگەی هیندسـتان. بەرەبـەرە زیارتکەرەکانی بووزیی ژاپۆنیو کۆریش وەدەرکەوتن[15] و تا سەدەی سـێزدەیەم تورکـە مـسیحییەکانیش وەك ربنـان سـئۆما[1]/ ابـن صـوماو مریدەکـەی بـەناوی مارکووس لە مەغۆلستانەوە بەرەو رۆژئاوا بۆ فەلەستین بەرێ کەوتن.

لە سەدەی دەیەمـەوە تەنانـەت پێـشتریش، پیرانـی سـۆفی دەهاتنـە ریـزی کاروانـەکانی رێگـەی ئاوریـشم تـاکوو بیرۆکـە ئیـسلامییەکان بـەرەو رۆژئـاوا لـە ئاسیای ناوەکیو چین بلاوبکەنەوە. زۆرجار ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ناوچەکان دەبوونە مریدیان، لەوانەشە خەڵك زیاتر لەبەر کراماتیان گرۆییـان دەبـوون نـەك

[1]. Rabban Sauma

لەبەر پەیڕەوەکانی قانونی[1] ئایینەکەیان. کاتێك ئەم پیرە خاوەن کراماتانە کۆچی دواییان دەکرد بەمەبەستی ڕێزلێنان مریدەکانیان گومبەزیان لەسەر گۆرەکانیان دروست دەکرد کە دواتر دەبووە زیارەتگە.

بەلاّم تەنیا یان خود تەنانەت بە پلەی یەکەم، بیرۆکە ئایینییەکان لە ڕێگەی بانگهێشتەوە لە ڕێگەی ئاوریشم دا بلاّو نەدەبوونەوە. کۆنترین سیستێمەکانی ئایینییە گەڕۆکەکان کە ئەم ڕێگەیان بەرەو ڕۆژئاوا گرتبووە بەر، واتە سیستێمەکانی ئێرانیو عیبرانی، باوەری مزگێنیدەروو بانگهێشتکەر نەبوون. تەنانەت ئەو ئایینانەی کە بەناو بانگهێشتکەر بوون نوێئایینەکانیان وەك نەریتە بیگانەکانی جیهانی لە ڕێگەی متمانەوە کۆ دەکردەوە نەك لە ڕێگەی بانگهێشتی چالاکیانەوە.

ئەمە دیاردە کە جێری بێنتلی[2] زۆر بەجێ ناوی ناوە (نوێ ئایینی لە ڕێگەی هاونشینی دڵخوازانە[16].) بەم پێیە، کۆمەڵەکانی خۆجێیی بەتایبەت لە ناوچە پەراوێزەکان حەزیان دەکرد بازرگان بێگانەکان ببینن چونکە خاڵی پێوەندی ئەوان لەگەڵ جیهانی دەرەوە بوون - جیهانێك کە وێناکردنی وەك شتێکی زۆر پێشکەوتوو مودرێنتر لە شوێنی پەراوێزی ژیانی تاك بوو، دژوار نەبوو. بەم شێوەش هەر تاکێکی خۆجێیی کە ئالاو والای بێگانەکانی پەسەند دەکرد (ئایین بەتایبەتی نمونەیەکی ئاشکرایەتی) هەستی دەکرد لەگەڵ جیهانی گەورەتر دەرەوە هاوپەیوەندییەکی زۆرتری هەیە، لەوانەیە خەڵکی تریش هەمان هەستیان بووبێت.

ڕوویەکی گرنگی ئەم گرۆیی بوونە بۆ کەسێك کە کاری بازرگانی بوو، پاراستنی بەهێزترینو فراوانترین هاوپێوەندی لەگەڵ هاوکارە بازرگانەکانی بوو.

---

[1]. Canonical
[2]. Jerry Bently

کۆمەڵە نمونەیەکی زۆری مێژووی جیهان دەتوانن ئەم خاڵە زیاتر روون بکەنەوە. بۆ نمونە پەرەسەندنی ئیسلام لە رێگەی بیابانو دەورووبەری ئۆقیانوسی هیند دەگەرێننەوە بۆ سەرکەوتنی موسلمانەکان ، یەك لەبەر زاڵبوونیان بەسەر تورە بازرگانییەکانی ئەو ناوچانەو ئەوەی تریان بەهۆی دەسەلاتی یاسای شەرع لە بازارو امتیازات گوونجاوو بارودۆخیماڵیاتی کە لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی موسڵمانەکان بازرگانە موسڵمانەکانیشی دەگرتەوە[17]. ئەم مۆدێلە لە سەدەی هەشتەم لە ئاسیای ناوەڕاست دەستی پێکردو کاری پێکرا، بەلام بەر لە ئیسلامیش پرۆسەیەکی هاوشێوە لەوێ لەئارادا بوو. بەدڵنیاییەوە ئەمە رێکەوت نییە لەو سەدەمانە دا کە ئایینی بووزیی، مانەوییەتو مەسیحییەتی نەستوری لە رێگەی ئاسیای ناوەکییەوە پەرەپێدانی ئایینەکانیان ئەزموون دەکرد کاتێك سەرکەوتوو دەبوون کە کۆمەڵەکانی بازرگانی ئەو نەریتانەیان پەسەند کردبا.

## سەغدییەکان

یەکەمین ئەکتەرەکانی ئەم سیناریۆ چەندفەرهەنگییە خەڵکانی دانیشتووی ماوراءالنهرن[1] کە کەموزۆر ئۆزبەکستانی ئێستا دەگرێتەوە. ناوچەیەکی ووشك بەلام پڕبەرهەمی ئاسیای ناوەڕاستە کە کەوتۆتە نێوان دوو رووباری گەورە: یەکیان ئامودەریا[2] (لای یۆنانییەکان بە ئۆکسۆس[3]و لای موسڵمانەکان بە جەیحوون بەناوبانگە) و ئەوەی تریان سیردەریایە (جەکسارتێس[4]، سیحون). یەکەمین دانیشتوانی ئەم دیارە ووشکە لە یەکەمین هۆزەکان بوون کە پەرەیان بە ئاودێری دا. لە سێ هەزارە زیاتر کشتوکاڵ لەوێ پێشکەوت تاکوو رووسەکان

---

[1]. Transoxiana

[2]. (دەریا) بە واتای (رووباری گەورە وەك دەریای نیل، دەریای سێند). و.

[3]. ئۆکسۆس Oxus یان بە وەخش/وەخشاب گۆدەکەن کە ئاورێژی باکووری ئامودارپایە. و.

[4]. Jaxartes/ Iaxartes

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا دەسەڵاتی خۆیانیان بەسەر دا سەپاندن‌و ئەو وڵاتانەیان کردە وڵاتێکی تاك بەرهەمی لۆکە کە خۆڵ خراپ دەکات‌و ئاو کەم دەکاتەوە، دەسەڵاتەکانی پاش سۆڤیەتی ئاسیای ناوەڕاست تاکو ئێستاش لەسەر هەمان شێوەیە دەڕۆن‌و درێژەیان پێداوە.

هەرچەندە ئاودێری مانەوەی ماوراءالنهری گەرەنتی دەکرد بەڵام برەوی ئەو پێوەندی بە بازرگانییەوە هەبوو. ئەم ناوچە کە دەکەوتە نێوان مەدیتەرانەو مەڵبەندەکانی شارستانیەتی ئاسیای ڕۆژهەڵات‌و هۆزەکانی دانیشتووی ئەو ناوچە لە باشترین بارەکان دا ناوبژیکەر بوون‌و بەدرێژایی مێژوو وەڵامی ئەم بانگهێشتەیان داوەتەوە. هەر لە کۆنەوە خەڵکانی ماوراءالنهر وەکوو رووخسارە سەرەکییەکانی بازرگانی سەروئاسیایی وەدەر دەکەون، و وەدەرکەوتنی ڕۆڵی راگوێزەری فەرهەنگ‌و ئەندێشەکانیان پاش ئاشکرابوونی ڕۆڵی بازرگانییانە[18].

هەر لە کۆنەوە دانیشتوانی سەرەکی ماوراءالنهر لە رەچەلەکێکی ئێرانی بەناوی سغدیی پێك هاتبوون[19]. هۆزێکی یەکجێنیشتووی هیندوئەورووپی کە بەستراوی هاوسا رەوەندەکانیان بەناوی سەکە/سەکا[1] بوون‌و بەزمانی سەغدیی قسەیان دەکرد کە یەکێکە لە زمانە ئێرانییەکانەو تاکوو ئێستاش بەشێوەی یەغنابی لە ناوچە پەراوێزەکانی تاجیکێستان هەرماوە.

چەند سەدەیەك بازرگانەکانی سەغدیی سەرکەوتووترین بازرگانەکانی ئاسیا بوون‌و کەسب‌و کاری بازرگانییان خاڵی سەرەکی پێوەندی نێوان ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا بوو، ئەوان وەکوو زەردەواڵەی فەرهەنگیی بوون کە بیرۆکەو نەریتەکانی شارستانیەتێکیان دەپرژاندە ناو شارستانیەتێکی دیکەوە.ئایینی بووزیی چەند سەدە پێش سەردەمی زایینی لەناو باکترییەکان[2] ریشەی داکووتا. ئەمانە

---

[1] . Saka
[2] . Bactrian

هۆزێکی دیکەی ئێرانی بوون کە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی هیند دەژیان، جێگایەك کە ئێستا ئەفغانستانە. سەغدییەکان لە باکتریا[1] (ناوچەی بەلخی کۆن) دەژیان یان ئالوویری بازرگانیان دەکرد. ئەم ناوچە ئایینی بووزیی وەرگرتو لە تەواوەتی ڕێگەی ئاوریشم تاکوو دەگاتە چین پەیرەوکەی لەناو هەموو ڕەوەندەکانی بازرگانیی دا پەرەپێدا. سەغدییەکانی دواتر نوێئایینە بە گورەکانی مانەوەییەت یان مەسیحییەتی نەستوری بوونو لەناو کۆمەڵانی بازرگانییان لە ناوەوەی ئاسیا دا بوون بەنوێنەرانی ئەم ئایینانە.

سەغدییەکان بەهۆی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکانیانەوە دەیانتوانی بە زمانەکانی بێگانە بدوێنو زۆربەیان خوێندەوار بوون. زۆرجار کاریان وەرگێران بوو. نووسەرەکان سەغدیی بوونو زیاتر نووسراوەکانی ئایینی بووزیی، مانەوییەتو مەسیحییان وەردەگێراوە سەر زمانە جۆراوجۆرەکانی ڕێگەی ئاوریشم بەشێوەی ڕاستەوخۆو هەروەها لە زمانی سەغدییەوە، لە پرکریتەکان (زاراوەی خۆجێیی)، ئارامی یان پارتی، بۆ باکتریایی، تەخاری/طخاری، خۆتەنی، تورکی یان چینی. هەر بەم هۆیەش بوو کە سەغدییەکان تەکنۆلۆجیای دروستکردنی کاغەزیان لە چینەوە هێنا بۆ ڕۆژهەڵاتو تاکوو سەردەمی ئیسلامی شاری دێرینی سەمەرقەند لە سەغد لە تەواوی جیهاندا بۆ باشی کاغەزەکەی بەناوبانگ بوو.

لە ساڵی ١٩٠٧ سێر ئۆرێل ستاین کارگێر ـ دۆزەری بەریتانیایی کۆنترین نمونەی ناسراوی کاغەزی کەتانی[2] لە چوارچێوە تاریمی چینی نوێ پەیدا کرد کە مێژووکەی دەگەیشتەوە سەدەی چوارەم، ئاوێتەیەك بوو لە نامەکانی بازرگانی

[1] . Bactria

[2] . Rag paper کاغەزێکە لە لەتوکوتی پارچەی نخی یان کەتان دروستیان دەکردەدەیانکردە هەویر، پتەوترو بەرەگرتر لە کاغەزێك بوو کە بە هەویری دارو ریشاڵی تر دروست دەکراو زۆریش گران بوو. و.

کە بە زمانی سەغدییو دەسنووسی ئارامی نووسرا بوو. ستاین لە راپۆرتی وەقدە دۆزەرەوەکەی دا دەربارەی دۆزینەوەی نووسراوەکانی بووزیی سەغدیی دەڵێ کە ((پێویستە ئەم توخمە ئێرانییە رۆڵێکی گەورەی هەبێ لە بانگەشەکردنی ئایینی بووزیی لە (ڕێگەی باکووری) کۆندا کە زمانی تایبەت بەخۆیو پەرتووکەکەی تا سنورەکانی خودی چین گەیاند!))[21] رۆڵی سەغدییەکان لە پەرەپێدانی نەریتەکانی ئایینی تریش بە هەمان رێژە گرنگ بوو.

لە سەدەی هەشتەم لەشکری موسلمانان کە لە کۆچەرەکانی عەرەبو نوێموسلمانی خۆجێیی ئێرانی پێك هاتبوو کە پێگەکەیان خۆراسان بوو، بەرە بەرە سەرزەوییەکانی سەغدیان لە ئاسیای ناوەڕاست داگیرکردو ئەوانیان راکێشاو سپاردیانە دەستی ئیمپراتوری موسلمانی جێنشینی بەغدا. سەرەتا هەڵبژێردراوەکان دەسەڵاتدارو پیاوماقوڵانو پاشان وردەوردە کۆمەڵەی خەڵك روویان لە ئیسلام کرد تا جێگایەك کە لە سەدەی پانزدە بەدواوە جەماوەری یەکجێنیشتووی خۆجێیی ئاسیای ناوەڕاست بە تەواوەتی موسلمان ببوو.

پێدەچێ تەنانەت بەرلەوە هێزی ئیسلام لە ئاسیای ناوەڕاست یەکگرتوو بێت، بازرگانەکانی سەغدیی لە رێزی یەکەمینو بەگورترین نوێئایینەکانی ئەم ئایینە نوێیە بوون. بینینی ئەو توخمە پراکتیکییە کە لە پشتەوەی ئەم پرسەدا خۆی حەشار داوە زۆر دژوار نییە. بەو واتایە کە کۆنترۆڵی تورێکی بازرگانی کە ئاسیای ناوەڕاستی بە جیهانی مەدیتەرانە دەبەستەوە لە دەستی موسلمانەکان دا بوو، ئەگەر بازرگانەکانی سەغدیی ویستبایان لەم رێرەو دا پیشەکەیان بپارێزن، پێویست بوو ببن بە بەشێك لەو نەریتە زاڵە کە کۆمەڵە سوودێکی هەبوو. کاتێك کە وولاتی خودی بازرگانەکانی ئاسیای ناوەڕاست کەوتە ژێر دەسەلاتی موسلمانەکان (و بازارەکانیشیان لەژێر رەکێفی یاسای شەرع) پاڵنەری دیاریان هەبوو کە چیتر بە دەوری رێگە کۆنەکاندا نەسورێنەوە.

کاتێك سەغدییەکانی ئاسیای ناوەڕاستو ڕۆژهەلاَت باوەریان بە ئیسلام هێنا، ئەم مۆدێلە چەسپاوە بووە هۆی گرۆیی بوونی شرکای دیکەشیان لە بازرگانی دا کە ئەوانیش سەغدییەکانی دروتترین ناوچەکانی ڕۆژهەلاَت بوون. ئەمەش ئاسانکارێك بوو بۆ موسلمانەکانی غیرسەغدیی کە بتوانن چالاکیان هەبێ لەگەلّ بازرگانەکانی سەغدیی کە سەرزەوییەکانیان لەژێر دەسەلاَتی موسلمانەکان بوو، بەشێوەیەك کاتێك ئیسلام گەیشتە چین، نەك تەنیا سەغدییە مووسلمانەکان بەلّکوو موسلمانەکانی ئێرانیو عەرەبیش هەلّگری ئەم ئایینە بوون.*

بەم شێوەیە لە سەدەی هەشتەم سەغدییەکانو خەلّکانی تری ئاسیای ناوەڕاست ئیسلامیان پەسەند کردو بەتاسەوە لە فۆرم گرتنی فەرهەنگی ئیسلامی دا بەشداریان کرد. بەلاَم کاتێك ئیسلام گەیشتە ئاسیای ناوەڕاست بە هێلەگی فەرهەنگی ئێرانی دابیژرا بوو، کاریگەری بەرجەستەی غیرعەرەبی پێوە دیار بوو. بەرچاوترین دەستکەوتی موسلمانەکانی عەرەب لە دەیەکانی (٦٤٠) تێکشکاندنو هەلّمژینی تەواوەتی پاشایەتی ساسانی ئێرانی بوو. لە (٧٥٠) دا (ڕاپەرینی عەباسی) ناوەندی هێزو دەسەلاَتی ئیسلامی بەرەو ڕۆژهەلاَت بۆ جیهانی ئێرانی برد. پاشان ئیمپراتوریەتی نوێی عەباسی لە زۆر ڕووەو راستییەکانی ڕامیاریو فەرهەنگی پێشووی ئێرانییان لەژێر ناوەرۆکێکی ئیسلامی نوێ پاراست. لە ڕووی تایبەتییەوە ئیسلام لە ڕادەبەدەر بوو بە ئێرانی: تارادەیەکی زۆر یاسا، پیتۆل، ئەدەبیات، هونەرو سۆفیایەتی ئیسلامی لە جیهانی فەرهەنگی ئێرانی پەرەیان سەند[22].

* (مەبەست لە موسلمانەکانی ئێرانی، موسلمانەکانی ئێرانی ڕۆژئاوا یان خودی ئێرانە. هەلبەتە هەردوو هەر ئێرانین، بەلاَم هەر کامیان مێژوویەکی جیاوازیان هەیەو بە بڕوای من لەو کاتە دا شوناسیشیان جیاواز بووە.) (نووسەر)

بەم پێیەش ئیسلامێك کە پاش چەند سەدە هاتە ناو ئاسیای ناوەڕاستەوەو گۆڕانی بەسەر دا هات واتە وێنەیەکی بە ئێرانی کراوی ئیسلام بوو. ئاینو فەرهەنگی ئیسلامی زۆرتر لە ڕێگەی زمانی فارسی بە خەڵکی ئاسیای ناوەڕاست گەیشت. بەڵام لە میسرو سوریا زمانەکانی سامی خۆجێیی بەرەبەرە ڕێگەیان بە زمانی عەرەبی دا، لە ئاسیای ناوەڕاستیش زمانی سەغدییو زمانەکانی تری ئێرانیش بەرەبەرە لەگەڵ زمانی فارسی ئاوێتە بوون. هەرچەندە ئاسیای ناوەڕاست هەندێجار لە هەخامەنشییەکانەوە تاکوو دەگاتە ئەشکانییو ساسانییەکان ببوو بە بەشێك لە پاشایەتی پێشوو ببوو بە ئێرانی، بەڵام لەژێر ڕکێفی پێشەوایی ئیسلامی دا بوو کە ناسنامە خۆجێییان نادیار بوو و ئاسیای ناوەڕاست بوو بە بەشێکی سەرەکی جیهانی ئێرانی. لەراستیدا لە سەدەی دەیەم بنەماڵەیەکی ئێرانی نوێ واتە سامانییەکان لە بۆخارا، ئاسیای ناوەڕاستیان کردبوو بە مەڵبەندی ئەو جیهانە[23]، ئەمە تاکوو چەند سەدە دواتریش هەر درێژەی بوو.

## زمان و بانگهێشت

تێرامانو هەڵبژاردنی زمان خاڵی ڕەهەندی پەرەسەندنی ئایینەکانە. وا دیارە نەریتەکانی ئێرانیو عبرانی تەنیا لە ڕێگەی ئاوریشم دا بانگهێشتیان بۆ ئایینەکان نەدەکرد بەڵکوو وەك باوەرەکانی کۆمەڵانی ئێرانیو یەهودییە کۆچەرەکان لەوێ مانەوە. زۆربەی نووسراوە پیرۆزەکانی ئایینی زەردەشتیو یەهودیی بەو زمانانە بوون کە زۆربەی شوێنکەوتەکانی چیتر قسەیان پێ نەدەکرا یان لێیان تێنەدەگەیشتن، لەکاتێکدا کە بزووتنەوەکانی بانگەشەکردنی چالاکی ئایینەکانی تر وەك بوودییو مەسیحی هۆشیارانە هوڵیان دەدا بەسودورگرتن لە ئامۆژگاری ئایینیو وەرگێرانی نووسراوەکانیان بۆ زمانەکانی خۆجێیی خەڵکێکی زیاتر گرۆیی ئایینەکەیان بکەن.

لەگەڵ هەمووی ئەمانەشدا، یەکەمین وەرگێرانی نووسراوەکانی عیبریی بۆ زمانێکی باو واتە سەبعینیەی[1] یۆنانی، لە تەواوەتی سەردەمی رۆمی دا نەریتی عیبرانی کە وەك شێوەیەکی یەهودیی پێگەیشت، نوێئاییێنێکی زۆری کۆکردەوە، لە راستیدا پێدەچێت کە مێژووی ئەم ئایینە هیچ کاتێك گەشەیەکی وەهای بە خۆیەوە نەدیتبێت. بەپێچەوانەوە، سەربوردەی یەهودییەت لە رێگەی ئاوریشم لە قۆناغی دواتری ژیانی دا، سەربوردەی کۆمەڵەکانی پەراوێزو ولاناویەیە کە هەوڵ دەدەن ناوەرۆکی ئایینییان بپارێزن. تراژیدیای ئەم رەوەندە هۆکاری سەرەکی رەفتاری ئێستای زانایانی یەهودیی ناوەندەکانی سەدەی بیستەمە، لە بواری هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی یەهودیی چینی کۆن.

چ کاتێکو بۆچی گرۆیی یەهودییەت بوون بەرەبەرە بەرەو نەمان چوو، لە چوارچێوەی بابەتی ئەم پەرتووکە دا نییە، بەڵام لەوانەیە بکرێ زۆر بەکورتی ئاماژەی پێبکرێ. لەوایە بەم شێوە بێت کە بەدوای وێران بوونی پەرستگەی دووهەم بەدەستی رووەمیەکان لە ساڵی ٧٠ زایینی، دەبێتە ئاراستەیەکی تلمودی لە دۆخی بەرگری نوێنەری یەهودییەت. ئەم دۆزە، لە هەر باسێکی پەیوەندیدار بە نەریتێکی ئایینییەوە، گرنگی تێرامان لەم خاڵە بەرجەستە دەکاتەوە کە بزانین ئەم نەریتە لەناو بازنەی گرنگی مێژووی پەرەسەندنی خۆی لە کوێ راوەستاوە.

پەرەسەندنی ئیسلام لە ئاسیای ناوەڕاست نمونەیەکی تایبەت دەربارەی زمان بەدەستەوە دەدات، کە لەوانەیە لە ئاکام دا لەگەڵ ئەم مۆدێلە یەك بگرنەوە. ووتوویانە کە هیچ نەریتێکی ئایینی وەك ئیسلام پشتی بە پەرتووکە ئایینییەکەی نەبەستووە، و چون موسڵمانەکان لەم باوەرە دان کە ناکرێ وەرگێراوی قورئان لە جیاتی خودی قورئان پەسەند بکەن، هەربۆیە پێدەچێ ئیسلام زۆر گرێدراوی زمانی عەرەبی بێت.

---

[1] . Septuagint

هەرچەند پێدەچێ بەدڵنیاییەوە ئەمە ڕاستە، بەڵام لەڕاستیدا زمان عـەرەبی بە ئەندازەی زمانی فارسی لە گوازتنەوەی ئیسلام بۆ هۆزەکانی ڕێگەی ئاوریشم ڕۆڵی نەبووە. وەرگێری *مێژووی بۆخارای جەعفەر نەرشەخی* واتە قوبادی کە لە عەرەبیەوە وەریگێراوەتـە سـەر زمـانی، لـە پـێش ووتـاری پەرتووکەکـە دا دەنووسێ: ((زۆربەی خەڵك حەز لـە خوێندنـەوەی پـەرتووکی عـەرەبی ناکـەن، هاوڕێکانم داوایان لێم کرد ئەم پەرتووکە وەرگێڕمەوە سەر زمانی فارسـی.[*25]))
هـەروەها ئیـسلامێك کـە لـەناو ڕەوەنـدەکانی سـتێپس دا فێـری خـەڵك دەکـرا زۆرجار بە پیرێکی خـاوەن کەرامـەت پـشت ئەسـتور بـوو، نـەك نووسـراوەکانی عـەرەبیی، ئـەم پیرانـی تەریقەتانـە بـە زمانـەکانی خـۆجێیی، وەك تـووركی، ئامۆژگاری ئایینیان بە خەڵك دەبەخشی.

بەگـشتی وا پێدەچـێ لـە نێـوان سـەرکەوتنی ئایینێـك بـۆ بەدەسـتهێنانی کۆمەڵێك نوێئایین لـە لایـەكو وەرگێرانـی ئـەو ئایینـە لـە وەرگێڕانـی گەوهـەرە ڕاستەقینەکەیەوە بـۆ زمـانی خـۆجێیی لـە لایـەکی تـرەوە، پەیوەنـدیی هەیـە. جێگـای ئاماژەکردنـە کـە وەرگێرانـی ووشەبەووشـە وەرگێرانێکـی سـەرکەوتوو نییە، پێویستە بۆ هێماو چەمکەکان هاوچەشنی[1] واتادار دابنرێ. زۆرجـار لـەناو کۆمەڵـەی دەسـتەواژەکانی فەرهـەنگیی دا وەهـا هاوچەشـنێکی تێـدا نییـە کـە لەگەڵ زمانەکانی تـر یەکدی بگرنـەوەو پێویـستە دروسـت بکـرێن. بـەم شـێوە بەئاسانی دەبینرێ کە چۆن گەوهەری نەریتەکانی ئایینیی لە ڕێگـەی ئاوریـشم، هەندێجار بە شێوەیەکی بنەرەتی، لە ئەنجامی پرۆسـەی وەگـیران بـەر ئـاوەژوو بۆتەوە.

* تاریخ بخارا، تصحیح مدرس رضوی. ١٣٦٣: ٤٠. و.

1. Analog

## هاوسه‌رگیری تێكه‌ڵاوو و ڕۆڵی ژنان له‌ فێركردنی ئایین

زۆربه‌ی ڕێبواره‌كانی ڕێگه‌ی دژواری دوور پیاو بوون. زۆرجار ڕوویداوه‌ بازرگانه‌ گه‌ڕۆكه‌كان له‌گه‌ڵ ژنانی خۆجێیی په‌یوه‌ندییان بووه‌ یان هاوسه‌رگیرییان كردووه‌. ئاوها بڵێین كه‌ به‌شێوه‌یه‌كی فه‌رمی زۆربه‌ی فه‌رهه‌نگه‌كان لایه‌نگریی ئه‌وه‌ن كه‌ منداڵانی وه‌ها خزمایه‌تییه‌كی تێكه‌ڵاو ده‌بێ به‌ ئه‌ندامانی كۆمه‌ڵگای باوك دابنرێن، به‌ڵام له‌ڕاستیدا ئه‌وه‌ دایك بوو كه‌ زۆرتر كاریگه‌ری له‌سه‌ر په‌روه‌رده‌ی ئایینی منداڵه‌كانی داده‌نا.

به‌ڵگه‌ی ئه‌م ئاسته‌ نافه‌رمییه‌ی گوازتنه‌وه‌ی نه‌ریتی ئایینی زۆر كه‌متر له‌وه‌یه‌ كه‌ له‌ مێژووی پیاوانه‌ دا ڕه‌نگی داوه‌ته‌وه‌، هه‌ربۆیه‌ ده‌بێ له‌ ڕووی به‌ڵگه‌كانی دووهه‌مه‌وه‌ دروست بكرێنه‌وه‌. بۆیه‌ ده‌ربڕینی ڕاوبۆچوون ده‌رباره‌ی ڕۆڵو دزه‌كردنی ژنان به‌شێوه‌یه‌ك كه‌ بتوانرێ به‌ڕوونی بسه‌لمێنرێن، زۆر ئاسته‌مه‌، له‌گه‌ڵ هه‌مووی ئه‌مانه‌شدا، ژماره‌یه‌كی زۆری مێژوونووسه‌كان هه‌وڵ ده‌ده‌ن وێنایه‌ك له‌هه‌ر سه‌رچاوه‌یه‌كه‌وه‌ كه‌ ده‌توانن وه‌رگرنو ته‌واو بكه‌ن.

توێژینه‌وه‌ی مه‌یدانی مرۆڤناسی سێرگێیی پولیاكۆڤ[1] كه‌ له‌ ماوه‌ی چوار ده‌یه‌ی كۆتایی سه‌رده‌می یه‌كێتی سۆڤیه‌ت له‌ تاجیكێستان ئه‌نجام دراوه‌، ڕۆڵی ژنان له‌ گوازتنه‌وه‌ی نه‌ریته‌ ئایینییه‌كان بۆ منداڵه‌كانیان ڕوون ده‌كاته‌وه‌[26]. پولیاكۆڤ نیشانی ده‌دات كه‌ چۆن ته‌نانه‌ت له‌ كاتێكدا كه‌ پیاوان وازیان له‌ مزگه‌وت هێنابوو، ئیسلام - یان ووردتر بڵێین خوبابوونی خۆجێیی گشتگیری ئه‌و - به‌درێژایی هه‌فتا ساڵ بێباوه‌ری فه‌رمی به‌هێز مایه‌وه‌، ئه‌مه‌ش له‌ ڕێگه‌ی فه‌رهه‌نگی په‌رستینی چاكو پیرو سه‌ردانی گومبه‌زه‌كان مابووه‌وه‌، ئه‌م فه‌رهه‌نگه‌ تاراده‌یه‌كی زۆر له‌ مه‌ڵبه‌ندی ده‌سه‌ڵاتی ژنان دا بوو.

---

[1] . Sergei Poliakov

هەرچەند سەرپەرشتیارانی شوێنە پیرۆزەکان وەك مامۆستاو ڕاگوێزەر پیاوبوون، بەڵام لەراستیدا ئەمە ژنان بوون کە دەچوونە چاك وپیرەکانو زۆرجاریش بۆ ئەوەی منداڵیان بێت دوعایان دەکرد. هاورێیەکی ئەمریکی من لەم دواییانە لەگەڵ هاوسەرەکەی لە ئۆزبەکیستان سەردانی یەکێك لەم پەرستگانەیان کردبوو، مجێورەکە وازانیبوو ئەمانە چوونەتە ئەویٚ بۆ ئەوەی دوعا بکەن منداڵیان بێت، ئەویش سورەتی فاتیحای بۆیان خوێندبوو. هاورێکم دواتر وەك نوکتە ئەم ڕوودوەی دەگێراوە چونکە لەبەرنامەیان دا نەبوو کە منداڵیان ببێت. بەڵام خاتوون پاش چوارمانگ زگی پڕبوو!

دیارە ژنان بەتەنیا سەردانی ئەم زیارەتگانەیان دەکردو لەم چاوپێکەوتنانە دا بوو کە متولییەکە کاری ڕاهێنەری ئایینی ئەنجام دەدا. زانستێك کە لە ڕێگەی سیستێمێکی ئاوهاوە دەگوازراوە زۆرتر لەسەر بنەمای فەرهەنگی پشتاوپشت بوو وەك لە نووسراوە یاساییەکان، هەر ئەم فەرهەنگە پشتاوپشتە کە لە ژنانەوە بۆ منداڵەکانیان دەگوازراوە، بڕبڕەی ژیانی ئایینی ئاسیای ناوەڕاستی لە سەرەانسەری سەردەمی سۆڤیەت دا پێك دەهێنا.

ریچارد ئیتۆنی[1] مێژوونوس باسی سیستێمێکی هاوشێوەی بۆ گوازتنەوەو بلاوکردنەوەی زمانو هێماخوازی ئیسلامی لە باشووری هیند دەکات کە بەلایەنی کەمەوە مێژووکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شانزدەیەمو لەوانەیە زووتریش[27]. لە وێژەی دەشتەکی ئەم ناوچەیە دەردەکەویٚ کە پەرەسەندنی ئیسلام - یان ئەگەر ووردتری کەینەوە، بیروکەو هیماکانی ئیسلام - لەناو جەماوەری هیندی دا تارادەیەکی زۆر لەلایەن خزمەتگوزارانی پیاوچاکە سۆفییەکان ئاسان کرابوو، ئەمانە بە زمانی خۆجێیی ڕستنی (ئیسلامییان) دروست دەکردو فێری ژنانیان دەکرد کە لە کاتی تەشی ڕەستن، چێشت لێنان یان گووتنی لایەلایە یان لە زەماوەندە بیلێنەوە. لەوێوە کە مەرج نەبوو بۆ

1 . Richard Eaton

خوێندنەوەی ئەم هەڵبەستانە بە فەرمی ددان بەوە دا بنێن کە ئیماندارن، زۆر خێرا بلاوبوونەوەو بوون بە پێکهاتەیەکی گرنگی فەرهەنگی رەمەکییانە. بەم شێوە چەمك‌و هێما ئیسلامییەکان رێگەیان بەرەو کۆمەڵگای هیندی کراوە، هەربۆیە ناسینەوەی موسلمان لە هیندو بەپێی دەستەواژە ئایینییەکان کارێکی ئاسان نەبوو. وەها جیاوازییەکی هاوبەش لە ئاستی گوندەکان لە سەردەمی بەریتانیا زیاتر ئاشکرابوو چونکە دەسەلاتی داگیرکەر بەدوای ئەوە بوو کە سەرژمێرییەك ئەنجام بداتو لەسەر ئەو بنەمایە خەڵك پۆلێن بکات.

تەنانەت تاکو ئێستا لە هێندستان هیندو، مەسیحی، جەین‌و سیکەکان دەبنیرێن کە دەچنە زیارەتی گومبەزی پیاوچاکە موسلمانەکان‌و هەروەها کۆمەڵە موسلمانانێکیش دەبێنرێ کە سەردانی گومبەزی ئەوان دەکەن. هەرچەند پیاوانیش لە فەرهەنگی چاك‌و پیرەکان دا بەشداران، بەتایبەت لە جەژنەکان، بەلام کاریگەری رەوەندی رۆژانەی مزگەوتیان زیاتر پێوە دیارە، بەلام ژنان زۆرتر لە رێگەی گومبەزەکانەوە بیردۆزەکانی (ئیسلامی) وەردەگرن.

هەرچەند لەم دواییانە دایە کە مێژووی[1] ژنان کەم‌وزۆر بەشێوەیەکی دروستکەر خۆی بەسەر روانگەی سەقامگیری پیاوسالاری دا نیشان دەدات، بەلام ئەگەر ئەوە هەیە کە مۆدێلی ژن تەوەریی پەروەردەی ئایینی ناو خێزان لە زۆربەی بوارەکانی مێژوو دا جیاوازی هەبێ، کە ئەمە بابەتی توێژینەوەی داهاتوویە، بەلام کەسێك کە بەشوێن زانینی هێما دۆناودۆنەکانی ئاویتەکردنی ئایینە، کە بەردەوام لە ناخی کۆمەڵگە فرەفەرهەنگیی‌و جیهان‌وولاتی رێگەی ئاوریشم هەڵدەقولێت، پێویستە رۆڵی ژنان لەبەرچاو بێ‌و لە بیر نەکرێ.

---

[1]. نووسەر لێرە دا نووکتەیەك بەکاردێنێت بەم واتایە history کە بەواتای (مێژوو) یەو بەشێوەی his-story (چیرۆکی ئەو- پیاو) دەیهێنێت.و.

## دۆزەکانی مێژووییەکی تر

تەنیا رێگری تێگەشیتن لە مێژووی ئایین، مێژووە نەنووسراوەکانی ژنان نییە، بەڵکوو کێشەیەکی بنەرەتی دیکە، پێناسەی خودی نەریتەکانی ئایینیو دەستنیشان کردنی ئەمەیە کە دەکرێ کام یەك لەم بیردۆزەکانی ئایینی بە هەر کام لەوانە ببەسترێتەوە. بەتایبەت هەرچەندە زۆرتر لە مێژوو دا بچینە پێشەوەو زیاتر ئاگاداری ئالوگۆرەکانی ئەم نەریتانە بین، رووبەروو زۆر بابەت دەبینەوە کە بە هیچ شێوەیەك دیار نییە کام فەرهەنگ لەکام فەرهەنگ وەریگرتووە. زۆرێك لە بیرۆکە هاوبەشەکانی نێوان ئیسرائیلییەکانی سامیی کۆنو ئێرانییەکانی هیندوئەورووپیی دەبینرێ.

کێشەیەکی دیکەشمان هەیەو ئەویش بریتیە لە دەستنیشان کردنی ناوەرۆکی هەر نەریتێکی دیاریکراوە. باوەرو رفتارە ئایینیی تونانەت لە پانتاییە کورتەکانی کاتو شوێن، لە ناوسنورەکانی نەریتێك کە بە تاقانە دەیناسین، جیاوازن، بەم شێوە هەر هەوڵدانێك کە بیروراو کردارێك لە پێناسەیەکی تایبەتدا سنوردار بکات، بێگوومان تارادەیەك کارەکەی دەستکرد دەبێ. بۆ نموونە ئەگەر یەهوەپەرستەکان کۆن بە یەهوی یان مەزدیسنانێکی کۆن بە زەردەشتی دابنێن، درێژەمان بەشتەکان داوە یان لەوانەیە زۆر ناکاڵمان کردوون[1]. هەربەم شێوەش ئاستەمە بیرورای بووزییەکانی پارتی/ ئەشکانی سەدەی دووەم یان نەستوورییە توورکەکانی سەدەی سێزدەیەم لەگەڵ پێناسەکانی پێوەری نوێی ئایینی بووزیی یان مەسیحییەت ئاشت بکرێنەوە.

رەهەندی سێیەمی دۆزی ئەم گووتەزایە ئەمەیەکە: زۆرتر ئەگەری ئەوە لە ئارادایە کە خەڵك لەکاتو شوێنی دیاریکراو، بیروباوەرو کردارە جیاوازەکانی خۆیان دەرنەبرببێ. جێگەیەك هەیە کە شایەتحاڵێکمان بۆ بوونی نەریتێکی

---

[1] .Anachronizing

دیاریکراو هەیە، بەڵام دیار نییە ئەو خەڵکانەی ئێمە مەبەستمانە خۆیان بە شوێنکەوتەی هەمان نەریتی هاوشێوەی سەردەمی ئێستا زانیبێت. بۆ نموونە کاتێك هەندێ شت لە ئاسیای ناوەڕاستی سەدەی پێنجەم بەدەست دێنین کە بەستراوی ئایینی بووزیین‌و بەپێی بەڵگەیەکی دیکە بە زەردەشتی دادەنێین، لەوانەیە بەم دەرئەنجامە جۆراوجۆرانە بگەین:

١. دوو کۆمەڵەی خۆجێیی بووزیی‌و زەردەشتی لەوێ بوونیان بووە.
٢. هەر دوو کۆمەڵەکە هەبوون بەڵام یەکێکیان بێگانەو ئەوەی تریان خۆجێیی بوو.
٣. ئایینی خۆجێ یان ناوچەیی تێکەلەیەك بوو لە ئایینی بووزیی‌و زەزدەشتی
٤. یان ئایینی سەرەکی ئەو ناوچە، هەرچەندە تاکوو ئێستاش هەر درێژەی هەیە، بەڵام توخمەکانی بووزیی‌و زەردەشتی دەکاتە یەك. قەبوولکردنی هەریەك لەم لێکدانەوانە ئەگەر لە کردار دا نامکن نەبێ ئەوە زۆر دژوارە.

ئەمە بەرەو دۆزیکی چارەسەر نەکراوی دیکەمان دەبات کە پێوەندی بە سنوورەکانی گرۆیی بوون بە نەریتێکی تایبەت بە کاتو شوێنێکی دیاریکراو یان بە نوێنەرایەتی ڕێژەیی ئەو لە چوارچێوەی کۆمەڵگاوە هەیە. تەنانەت کاتێك کە بەڵگەی باوەڕپێکراوو بەهێزمان هەیە سەبارەت بە بوونی نەریتێك کە ناوەڕۆکەکەی دەناسرێتەوە ـ بۆنموونە پەرستگەیەك کە لە کتێبخانەکەیدا شوێنەواری یاسایی‌و لەسەر دیوارەکانی رووخسارنیگاری پێوەرە ـ دیسان ناتوانین بە ووردی بگەینە ئەنجام کە ئەم نەریتە تا چ رادەیەك گشتیگر بووە.

دەزانین لە سەدەکانی هەشتەم‌و نۆیەم دا ئایینی مانەوی بە یارمەتی پاشاکانی ئۆیغور پێگەیەکی فەرمی بەدەست هێنا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە

ئەم ئایینە ببوو بە ئایینێکی حکوومی ناکریّ هەمووی جەماوەر گرۆیی بووبێتن چونکە هەندیّ بەلّگەمان هەیە کە لە هەمان کاتدا لە کۆمەلّگای ئۆیغور دا بووزییەکانو مەسیحییەکان بوونیان بووەو هەروەها ئایینی نەریتی شەمەنی تورکیش هەر مابوو.

هەروەها راستەکە لەناوچوونی ئایینی زەردەشتی، بووزیی، مانەویو مەسیحی لە رێگەی ئاوریشم راستییەکی مێژوییە بەلاّم شوێن پیّ گرتنی بە ووردی کارێکی دژوارە. نەبوونی بەلّگەکان کە تەواو بوو، بە بڕانێکی رێژەیی دەتوانین بلّێین ئەو نەریتە تا ئەو کاتە لەناو چووە. بەلاّم ئەگەر بۆ نموونە هیچ شوێنەوارێکی نەستووری لە ئاسیای ناوەڕاست پەیدا نەکەین کە مێژووکەی بگاتە پاش ناوەڕاستەکانی سەدەی چواردە، لێیان تێناگەین کە ژمارەی ئەو مسیحییانەی کە دواترین بەرهەمەکانیان خوولقاندووە، چەندە بووەو هەروەها دواترین نەستورییەك کە بەپێی ئایینەکەی رەفتاری دەکرد چ کاتێك مردووە یان بۆتە موسلمان.

تاکوو سەدەی شانزدەیەم چیتر ناکری لە چین دا مانەوییەت بە نەریتێکی بالاّ دەست دابنریّ بەلاّم لەم سالاّنەی دواییدا پەرستگەیەکی مانەوەی لە پارێگای فۆچییان دۆزراوەتەوە[28]. دیارە کە دەبیّ لە بواری بوونو مانەوەی بیرۆکەی ئایینی لە رێگەی ئاوریشم دا یان لە هەر جێگەیەك لە مێژووی جیهان دا، خۆنەگرانە نزیکیان بینەوە.

## بەشی دووەم

## ئایین و بازرگانی لە ئۆراسیای کۆن

بەڵگەکانی شوێنەوارناسی نیشاندەری ئەوەن کە بنەماکانی رامیاریی لەسەر بنەمای شارسازی بەرەبەرە لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایین لە ناوچەی جەیحوون پەرەی گرت. بەرەو باکوور لەناو هێڵی بەرینی سەرزەوییەکانی ستێپس کە تاکوو قارەی ئاسیا کێشراون واتە تەواوەتی رێگەکە لە سەرەوەی دەریای رەشەوە تا سنورەکانی چین، فەرهەنگی سەرەکی رەوەندی یان نیوەرەوەندی بوو. لەگەڵ ئەوەی کە شارنشینی پەرەی دەستاند، هۆزەکانی شوانی چێوداری ستێپسی ئۆراسیا[1] بە شارستانییەتێکی تختەقاپو کراوەوە بەشداری شەریکایەتییەکی دوورودرێژ بوون کە ٢٥٠٠ساڵ، تاکوو سەدەی بیستەم،درێژەی خایاند واتە تاکوو کاتێك کە دەسەڵاتەکانی (نوێی بوو) بەرەبەرە بەزۆر گرووپی رەوەندەکانیان دووبارە تختەقاپو دەکردو کۆتاییان بە شێوەی ژیانی دێرینیان هێنا.

بارتۆلد[2] خاورناسی گەورەی رووسی، ناوی ئەم پەیوەندییە هاوژینییەی ناوە(ستێپس و کشتوکاڵ). ئەم چەمکە لەناو زۆربەی ئەو کەسانەدا کە لێکۆڵینەوە لەسەر مێژووی کۆمەڵایەتی ئاسیای ناوەڕاست ئەنجام دەدەن، ماوەتەوە. بەپێی ئەم مۆدێلە، مێژووی ئاسیای ناوەڕاست تارادەیەکی زۆر لەگەڵ پویایی پەیوەندییەکانی رەوەندی ـ یەکجێنیشینی پێناسە دەکرێ، هەرچەند ئەم پەیوەندییانە زۆرجار دوژمنانەو شەرئەنگێزانەن بەڵام هەمیشە بەشێوەیەکی دوولایەنە بە یەکەوە بەستراون.

---

1 . Eurasia: ئەورووپا ـ ئاسیا. ناوێکە کە وەك قارە دراوە بە ئەورووپا ـ ئاسیاو دوورگەکانی نزیك قەراخەکانی ئەم قارەش دەگرێتەوە.و.

2 . V.V. Bartold

واتــای ئــەم پەیوەندییانــە، بەتایبــەتی، ئەوەیــە کــە هــۆزە شــوانییەکان کەرەســتەی خــاو وەك خــووریو پیــستەیان بەدەســت دەێنــا کــە دانیــشتوانی خەمڕکــەکان بــەکاریان دێنــا وەك کــاڵای دووبــارە بەدەســت هــاتوو لــە ڕێگــە ئالووگۆری بازرگانییەوە. لە ئاستێکی دیکە دا ڕەوەنــدەکان هێرشــیان دەکــردە هۆزەکانی یەکجێنیشتوو و سامانەکانیان لێ تاڵان دەکردن، وەك ئــەو گورگانــەی کە هەڵدەکۆتنە سەر هێلانەی مرشیكو کەڵەشــێر[1]. بەقــەدەر پێویــست هــەڵیان دەگــرتو دەگەڕانــەوە ستێپــسەکان. هەنــدێجاریش گــیرودەی وەسوســـەی شارســتانیەت دەبــوونو دەمانــەوەو تێیــدا دەتوانــەوە. زۆرجــاریش وەك چــینی دەسەڵاتداری نوێ جێگایەنیان دەگرتەوەو بەم شێوە خوێنو هێزێکــی تازەیــان دەرژاندە ناو ئەو کۆمەڵگایــە کــە بــەرەو دارمــان دەچــوو. داگیرکــەرانێك کــە لــە ستێپــسەکانەوە دەهــاتنو تختــەقاپو بــوونی درگــای شــارەکانیان هەڵدەبــژارد، بەناچار کلتوری دوراوەکانیان وەردەگرتو دەبوونــە قارەمــانو لایــەنگرانی ئــەو فەرهەنگە. ئەم نمونە چەندین جار لە ماوەی سێ هەزارە دا دووبارە بۆتەوە.

زۆرجار هۆزەکانی باڵادەست ستێپسی ئۆراسیا سەر بە بنەماڵەکانی ئێرانیــی زمان یان توورکەکان بوون. ئەگەرچی زمانەکانی ئێرانی سەر بە هیندوئــەورپین، لە زاراوەکانی توورکی ئالتایی جیــاوازن، بــەڵام ناسینەوەی خــودی قــسەکەران کــارێکی وەهــا ئاســان نییــە، چــونکە مێــژووی هاوبەشــیان، تایبەتمەنــدیو بیرکردنــەوەو شــیوازی هاوبەشــی ژیــانی بۆیــان هێناوەتــە ئــاراوە. ئــەم میراتــە هاوبەشە، زمانەکانی ئێرانی و تورکیش دەگرێتەوە، وەها کە تاکوو ئەمڕۆش لــە دووزمانی (مەبەست لە دووزمانی واتە خەڵکی هەندێ لە ناوچەکان بە دوو زمانی جیاواز قسە دەکەن) لە چەند بەشێکی ئاسیای ناوەراست دەبینرێ.

ئەمە دەربارەی بیروباوەرو کردای ئایینیو ئەفسانەکانیش راستــە. زۆربــەی چــەمکەکانی ئــایینی هــۆزە کۆنــەکانی ئێرانیــی لەگــەڵ مــۆدیلی ئــایینی هیندوئەورووپیو پێکهاتی کۆمەڵایــەتی بەباشــی ڕێــك دەکــەون، هــەروەك جــورج

دۆمیزێل[١]، هیندوئەورووپی ناسی خەڵکی فەرانساو خەڵکانی تر سەرلە نوێ دروستیان کردۆتەوە[2]. بەڵام زۆرجار ئەم دیاردە لەناو هۆزەکانی ئورال - ئالتایش دەبینرێت. ووتوویانە هۆزەکانی دیکەی ستێپس لە دوورترین شوێنەکانی ڕۆژهەلأت ئەم دیاردە بەرفراوانانە وەك ئەسپ شوانی[٢]، ئاگرپەرستی، لەژێر ئاسمان دانانی مردووەکان، و چەمکی جیهانشایی هەدیەی ئاسمانخودایان لە ئارییەکانی هیندوئەوریپی وەرگرت بەڵام ئەمە تارادەیەکی زۆر جێگای باس‌و خواستە[3].

ئایین لە کۆمەڵگاکانی ئوراسیای کۆن دا هەروەك کۆمەڵگا سەرەتاییەکانی تر لە ڕێگەی ئایینەکانی ژیانی ڕۆژانەوە دەردەکەوێ، وەك ئامادەبوون بۆ ڕاوکردن، نەریتەکانی بەخاکسپاردنی مردووەکان‌و بابەتی هاوشێوەی تر. پاشماوەکانی ئارکۆلۆجیکالی، یەکەمین سەرچاوەی ژیانەوەی داب‌ونەریت‌و باوەرە ئایینییەکانی کۆنن. پێکهاتی سێ‌بەشی کۆمەڵگای هیندوئەورووپی، لە پیاوانی ئایینی‌و شەرکەران و شوانەکان، ئەمە گریمانی دۆمزیلە، پێدەچێ کە لە کۆنترین بناغەکانی کۆشکی داشلی[٣] (لە ئەفغانستانی باکوور) و شوێنە دۆزراوەکانی دیکە رەنگی دابێتەوە. پێدەچێ ئەمانە لە شێوەی سێیانە پیرۆزەکان بن: سێ درگا، نۆ تاوەر[4]. لە پشکنینی گورەگانیش هەندێ بەڵگە بەدەست هاتووە کە ئامارە بە قوربانی کردنی ئاژەڵەکان دەکات بەتایبەت ئەسپ‌و هەروەها سەگ‌و جوانەگا. ئەم گورانە چوارچێوەکەیان دارە وەك

---

[1]. Georges Dumezil

[2]. رەوەندی ئەسپداری. نومادیسم: بەخێوکردنی چوارپێی، ناسەقامگیری شوێنی نیشتەجێبوون، بەبێ شار، بێ شارستانیەت، کۆچکردنی وەرزی بۆ بەدەستهێنانی ئاوو مێرگزار، کۆچکردنی گەورە بۆ سەرزەوییە نوێیەکان، تایبەتمەندی ژیانی رەوەندی یەکەمین قۆناغی رەورەوەداریی‌و پاشان ئەسپداری‌و بەخێوکردنی ئەسپ دێتە گۆر. بۆ نمونە هەزارەی یەکەمی پ.ز بە سەردەمی ئەسپداری دادەنرێ. و.

[3]. Dashly

ئـەوەی کـە لـە ڕێگـوێـدا[1] بـاس کـراوە. ڕیگـوێـدا نووسـراوەکانی کۆچـەرانی هیندوئەورووپی کۆنە بۆ هیند، ئەم هۆزە هیندوئارییی ناو دەبرێن.

ئێرانییەکانی دانیشتووی ستێپس، هاوتەریب لەگەڵ فەرهەنگی هینـدی بـاس کـراوە لـە ڕێگـوێـدا، زۆر پـشتیان بـە ڕەورەوەکـانی ئەسـپراکێش بەسـتبوو، بەتایبەت لە شەڕدا لەوانەیە ئەم ئـامێرە تەکنۆلۆجییـە لـە بەخـشینی توانـا بـە هیندوئارییـــەکان زۆر گرنگـــی هـــەبووبێت لـــە ژێردەســـتەکردنی بـــاکووری نیچمەدوورگەی هیند. لەراستیدا لە ستێپسەکانی باکووری ئاسـیای ناوەڕاسـت ـ لەوانەیە ناوچەی ئۆکرانیای ئێستا ـ بۆ یەکەمجار ئەسـپیان دەسـتەمۆ کـردو بـە ڕەورەوەیان بەست، هەرچەند ڕەنگە سوارکاری ئەسـپ لـە داهێنانـەکانی دواتـر بووبێت[6]. ئەمە واتادارە کە ئێرانییەکانی سەردەمی کۆن باوەڕەیـان هـەبوو کـە گیان بە ڕەورەوەیەك جیهان بەجێ دێلێت کە ئەسپ رایدەکێشێت.

بیرو باوەڕی تر کە تایبەتـە بـە ئێرانییـەکانی دێـرین لـە ڕاپۆرتـەکانی کـۆنی یونانیی دا باسیان لێوە کراوە کە لای خێڵە دۆناودونەکان، بەتایبەت سـەکاکان، ناسرا بوون[7]. سەکاکان بروایان وەها بـوو کـە ئـامێرە گرنگـەکان وەك کەڵـەوە، گاسن‌و نێزەو جامی نیگارکێشراو، خودا پێدراون. کۆمـەڵێك بڕوایـان بـە ئەسـپ هەبوو بەم باوەرەوە کە ئەسپ ناوبژێکە لە نێوان ئەم جیهانەو جیهانەکـەی تـر. دووبـــارە بوونـــەوەی وینـــەی ئەســـپ لـــە نیگارەکـــانی[2] هونـــەری ســـەکایی دا نیـشاندەری ڕێزدانـانی ئێرانییـەکانی ستێپسە بـۆ ئەسـپو ئـەم مۆتیڤیـە[3] لـە هونەری بەخاکسپاردنی ستێپسییەکان، بەلایەنی کەمەوە تا سەدەی شەشـەمی زایینی دەبینرێ.

[1]. Rig Veda
[2]. Motif
[3]. Theme

هێرۆدۆت[1] باسی نەریتی قوربانی کردنی ئەسپ، قەدەغەبوونی ئاو، دروستکردنی جامی شەراب لە کەلەسەری دوژمنە کوژراوەکان، لەناو سەکاکان دەکات، تەواوی ئەم دابونەریتانە لە نێوان هۆزە جۆراوجۆرەکانی دواتری تورکیش دەبینرێ[8].

سەکاکان ئایینێکی ئاگرو ئایینێکی خۆر/هوریشیان هەبوو. هێرۆدۆت لە تۆمیریس[2]، مەلەکەی هۆزی (ماساگێت[3]/ ماساژێت) دەگێڕێتەوە کە سوێندی بە (هور، سەروەری ئێمە) دەخواردو لە زمانی ئەوانەوە باس دەکات کە (هور تەنیا خودایەکە کە ئەوان دەیپەرستن‌و ئەسپی بۆ قوربانی دەکەن. بەم بیرۆکە کە چالاکترین ئاژەڵ پێشکەش بە چالاکترین خوداکان دەکەن.[9])

هێرۆدۆت لە شوێنێکی دیکە دا دەڵێ خاتووخودایەك بەناوی تەبیتی[4] هەبوو کە لەگەڵ هێستیای[5] یونانی بەرامبەری دادەنێت[10]. لە ڕوانگەی یونانییەکانەوە، سەکاکان ڕووخسارو قوربانگەو پەرستگەیان بەکاردێنا. باسی ڕوخسارێکی بەناوبانگیان دەکرد بەناوی ئێنارێ[6] کە ژنێکی غەیبوێژ بوو. نووسەرەکانی یونانیی ئاماژە دەکەن بە دابونەریتی چڕوپڕی ناشتن‌و بەخاکسپاردن‌و هەروەها هەوڵی پاراستنی گۆڕی باب‌وباپیران لە لای سەکاکان[11]. هێرۆدۆت باسی هۆزێکی سەکایی دەکات بەناوی ئارگیپای[7] کە بنەکەیەکی پیرۆزی تایبەتیان هەبوو کە لە هێرشی هۆزەکانی دراوسێ دەیپاراستن‌و توانای ئەوەی پێ دەبەخشین کە لە پلەی دادوەر لە دانوستانەکانیان دا ناو بژیکەر بن[12].

1 . Herodotus
2 . Tomyris
3 . Massagatae
4 . Tabiti
5 . Hestia
6 . Enaree
7. Arrgippaei

چالاکی ئایینی خۆجێیی، هەروەك یونانی کۆن، لە جیهانی ئێرانی دا زۆرتر جەختی لەسەر پەرەستینی پاڵەوانێکی ئۆستورەیی دەکرد. لە بۆخارا ئایینی سەرەکی زیاتر لەسەر رووخساری پاڵەوانێتی سیاوەش چڕ دەبووەوە[1]. دواتر لە شاهنامەی فێردۆسی دا وەدەر دەکەوێ. فێردۆسیش وەك هاوتا یونانییەکی خۆی، هۆمێر[2]، ئەم ئۆستورەی لە نەریتە پشتاوپشتە دێرینەکانەوە هەڵێنجاوە.

بە گشتی هۆزەکانی ئێرانیی حەزیان لە داگیرکردنی رۆژئاوای ستێپسی ئۆراسیا بوو و هۆزەکانی ئالتایی حەزیان لە داگیرکردنی رۆژهەڵات بوو، هەرچەند گروپەکانی ئالتایی لە ناوچە شاخاوییەکانی ئورالو شوێنەکانی تر بوون و هیندوئەورووپییەکانیش لە رۆژهەڵات تاکوو دەگاتە هەرێمی تاریمی سینجیانگی نوێ[13]. بەم شێوە بۆ ارجاعات بۆ هۆزەکانی ئالتایی دەبێ بگەڕێینەوە لای سەرچاوەکانی چینی. کۆنترین باس دەربارەی سیۆنگ نۆکان (سەدەی سێیەمی پ.ز تا سەدەی دووەمی زایینیی) دەڵێ وەکوو چینییەکان بەپێی ساڵنامەیەکی ئایینی وەرزی قوربانیان پێشکەشی بابو باپیرانیانو خوداکانی ئاسمانو زەوی دەکرد. جگە لەمانە پێش ئامادەکردنی هەر جۆرە مانۆرێکی نیزامی راوێژیان لەگەڵ مانگ و ئەستێرەکان دەکرد[14].

سەرچاوەیەکی زۆر دواییتر لەسەر زمانی هەناردەیەکی سەدەی شەشەمی یونانی بۆ ئاسیای ناوەڕاست، باسی نەریتێکی بەخاکسپاردنی تورکەکان دەکات کە شینگێڕەکان شوختیان بەسەر دەموچاویان دەهێناو وەك ئێرانییەکانی کۆن، ئەسپو خزمەتکارەکانیان قوربانی دەکرد. لە کۆنترین بەردنووسە

[1] . لەوانەیە نووسەر لێرە دا ئاماژە بکات بە تاریخ بخارا: «... و خەڵکی بۆخارا سەروەی زۆریان هەیە بۆ لاواندنەوەی سیاوەش پاش کووژرانی وەها کە لە هەموو پارێزگاکانیان باوە. و بەزمگێران کردوویانە بە سروودو دەیڵێنەوەو گێرەوەکان بە گریانی مۆغەکان ناوی دەبەن. ئەمە قسەی زیاتر لە سێهەزار ساڵە، کەواتە ئەم چواردیوارەی (چواردیواری ارگ بۆخارا) بەپێی گێراوەی ئەو دامەزراندووە.» (تاریخ بخارا، ١٣٦٣: ٢٣)

[2] . Homer

ناسراوەکانی تووركی کە لەسەر ئەستونگە بەردینەکانی قەراغی رووباری ئۆرخون[1] لە مەغۆلستانی ئیستا دۆزراونەتەوەو مێژووەکەی دەگاتە سەدەی حەوتەم، زانیاری پووختری تێدا هاتووە. ئەم بەردنووسەها ئاماژە دەکەن بە خودای ئاسمان یان تەنگری[2] و هەروەها شاخێکی پیرۆز بەناوی ئوتۆکان[3]. تەنگەرییان بە هەمان خودای مەزنی هۆزەکانی ئالتایی داناوەو لەناو موسلمانەکانی ئێستای تورکیا وەك هاومانا (الله) ماوەتەوە.

## زەردەشت

لە خالێکی بەر لە مێژوو - کە کاتەکەی بە روونی دیار نییە - پێغەمبەرێك سەری هەڵدا. هەندێك بروایان وایە کە زەرەتووشتەرە[4]، کە زۆرتر بە زەردەشت/ زەرتۆشت بەناوبانگە، لە سەدەی سیانزدەی پ.ز و بە بڕوای هەندێکی تر لە سەدەی شەشەمی پ.ز دەژیا. ئایینی زەردەشت، نەریتێکی ئایینیی کە بنەماکانی دەگاتەوە پەیڕەوەکانی زەردەشت، ئیستا کۆمەڵە نوێنەرێکی کەمی لە شێوەی کۆمەڵەی بچووکی ئیماندارن لە هیند بەتایبەت بۆمبەی، ئێرانو ئەمریکای باکوور هەیە. هەندێ لە نووسراوەکان بەتایبەت هەڵبەستەکان سەربە خودی زەردەشت لە ئەڤێستا، پەرتووکی پیرۆزی زەردەشتیەکان، پارێزراونو بە گاتە/ گاهگاەکان ناسراون. ئەم هەڵبەستانە لە زمانی سەنسکریتی وێدایی نزیکنو چەندین سەدە سینگ بەسینگ پارێزراوونو لە سەدەکانی سەرەتای چاخی مەسیحی لە ئەڤیستا دا نووسران.

زەردەشت ئامۆژگاری ئایینی بوو، لەوانەیە لە خێزانێکی روحانییەوە کە دەیوست کردارە ئایینییەکانی کۆمەڵگاکەی چاك بکاتەوە. ئەو دژی هەندێ

---

1. Orkhon
2. .Tangri
3. . Otukan

4. Zarathushtra: خاوەنی ووشتری زەرد. و.

گرۆیی تایبەت بوو کە لە نێوان هۆزەکانی جۆراوجۆری هیندوئەورووپی دا هاوبەش بوو، وەك قوربانی کردنی مانگاو ئایینی خواردنەوەی هەئومە/ هومە[١] (سەن. سۆمە[٢])، خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەرە کە زۆرجار بە بەزمو خۆشیی کۆتایی پێدەهات[17]. (لە ریگوێدا، پاش ئیندرە[٣]، سۆمە دووهەمین خودای گرنگە.) هەروەها پێغەمبەر لەناو خوداکانی[٤] ئێرانی خودایەك یان ئەهۆرەی[٥] (سن. ئەسۆرە[٦]) بۆ پەرستنی هەڵبژاردو ناوی نا ئەهۆرەمەزدا/ ئورمەزد یان (سەروەری دانا) و خوداکانی تری ئێرانی وەك ئەهورەکانو دەئێڤەکانی[٧] (سەن. دێڤە[٨]) دەبەزاندە ئاستی شەیتانو دێوەزمەکان: ووشەی ئینگلیزی **Devil** (دێوەزمە، شەیتان، گیانی ناپاك) هەروەك خودی ئەم چەمکە، بنەچەیەکی ئێرانی هەیە[18].

بەم شێوە گۆیا زەردەشت وەك موسا، کە لەگەڵی هاوچەرخ بوو، لە ژمارەی یەکەمین پێغەمبەرەکانی جیهان بوو کە تووی یەك پەرستی[٩] چاند. بەڵام خەونەکانی ئەو لە خەونەکانی بنیئیسرائیلی کۆن جیاواز بوو، چونکە خراپەی لەگەڵ هەبوونی خوداوارە/ خولقێنەرێکی[١٠] خراپە، یان ئەنگەرە مەینیۆ[١١] (شەیتان) روون دەکردەوە. هەربۆیە زۆرجار ئایینی زەردەشتیان بە ئایینێکی دووفاقە/ دووانەیی داناوە نەك دینێکی یەك پەرستی.

1 . Haoma
2 . Soma
3 . Indra
4 . Pantheon
5 . Ahura
6 . Asura
7 . Daeva
8 . Deva
9 . Monotheism
10 . Divinity
11 . Angra Mainyu

زۆر جار گریمانەکە ئەوەیە کە هۆزە دۆناودۆنەکانی ئێرانیی (ئێرانی گەورە) ـ ناوچەیەکی فەرهەنگی کە میسۆپۆتامیاو قەوقاز تا خوارزم، ماوراءالنهر، باکتریا و پامیری دەگرتەوەو پارسەکان، میدیەکان، پارتییەکانو سەغدییەکانو ئەوانەی تریشی دەگرتەوە ـ هەموویان لە سەردەمی پێشوئیسلامی دا (زەردەشتی) بوون. وەك لەم دواییانە دا نووسەرێك نووسیویەتی ((پاش گرۆیی بوونی وێشتاسب شا (گێشتاسب)، وایان بیر دەکردەوە کە هەمووی ئێران بوونەتە زەردەشتیو وایان دەزانی هەتا کۆتایی پاشایەتی ساسانی هەر بەم شێوە بەردەوام دەبی.[19])) زاناکانی تریش بەپێی ئەم ڕوانگەوە هەمووی جیهانی ئێرانی کۆنیان بە زەردەشتی دادەناو بۆ پشتگیری ئەم گشتاندنە گشتییە گۆیا هیچ بەڵگەیەك لە دەست دا نەبوو یان ئەگەر بوو زۆر کەم بوو[20].

هەربۆیە پێویستە زۆر بە پارێزەوە لەم گووتەگشتییانە نزیك بینەوە. ئایینی زەردەشتی وەك یهودییەت ڕیشەی کۆنی هەیە، بەلام لە بنەڕەتەوە بەرهەمی سەدەی مەسیحییەتە. ئایینی زەردەشتی سەرەتا لە سەدەی سێیەمی زایینی وەك ئایینێکی فەرمی حکومەتی پاشایەتی ئێرانی ساسانی ڕێکخرا، واتە شوێنێك لە نێوان هەزار تا پێنج سەد ساڵ پاش زەردەشت. بە بەراوورد لەگەڵ ئەو بەڵگانەی کە لە ئایینی زەردەشتی ساسانی لەبەر دەستمانە، شتێکی وەها سەبارەت بە بیروباوەڕو کردارە ئایینییەکانی هۆزەکانی ئێرانی چاخە سەرەتایی دانیشتوانی ئاسیای ناوەڕاست نازانین.

جگە لەمانە، ئەوەی لە ئایینی زەردەشتی سەردەمی ساسانی ناسراوە بەباوەڕو کردارە ئایینیەکانی ئێرانی کۆن نابەسترێتەوە. لە هیچ سەرچاوەیەکی ناسراوی هەخامەنشی دا تەنانەت ئاماژەیەکیش بە ناوی پێغەمبەر زەردەشت ناکرێ. ئاشکرایە کە دەبێ ئاگادار بین نەریتی (زەردەشتی) ساسانیی بەسەر

ئێرانییەکانی سەردەمی هەخامەنشیو ئەشکانی نەگشتێنین. ئەم خاڵە زۆرتر لە هەمووان دەربارەی ئاسیای ناوەڕاست دروستە.

بەڵام دەکرێ لە واتایەکی بەرفراواندا دەربارەی ئایینی ئێرانی قسە بکرێ ئەویش لە ڕێگەی ناسینی ڕەگەزێکی دیاریکراو کە پێوەندی بە (سەرجەم) ئایینی ئێرانی ئۆستورەکان، خوداکان، هیماکانو ئایینەکانەوە هەیە. کاتێك دەکرێ لە بوارەکانی خۆجێی جۆراوجۆر ئایینی ئێرانی تێبگەین کە تارادەیەکی زۆر لە تووخمە دروستکراوەکانی ئەم کۆکراوانە وەرگیراوە. ئەم پێکهاتە بەپێی کاتو شوێن جیاوازە لەگەڵ تووخمی جۆراوجۆر کە کێشێکی کەمتر یان زیاتریان هەیە یان هەر نییانە، و هەروەها لەگەڵ تووخمە جۆراوجۆرەکانی ناوچەیی غیرئێرانی کە دزەیان کردۆتە ناویەوە.

پێدەچێ پێشو پاش زەردەشت زۆربەی جەماوەری ئێرانی خۆریان بە وێنەی بینراوی ئەهورامەزدا دەناسی. لە بەردنووسەکانی ئاشووری دا وێنەی ئەسەرە مەزەش[1] (ئەسۆرە مەزدەسە[2] پێش ـ ئێرانی[3]) هاتووە، و لە زمانی سەکایی دا بە خۆریان دەووت ئورمەسدە[4]. [22] خۆرو هاوتا زەوییەکەی واتە ئاگر، هەردووکیان بۆ پاككردنەوە بەکاردێن. شایەنی باسە کە هێندوئارییەکان ئاگنی واتە خودای ئاگریان دەپەرستو کرداری پاككردنەوەی جەنازەی مردووەکان لەناو هێمەکانی سوتاندنی مردووەکانیش ریشەکەی بۆ ئەم مەبەستی دەگەڕێتەوە، بەهەمان شێوەش کرداری ئێرانی دانانی پاشماوەی مردووکان لەژێر تیشکی خۆر. هەروەك نووسەرێك نووسیویەتی، ((...ئاگرو ڕووناکی فاکتەری پاككەرەوەن، مادەی مردوو لەناو دەبەنو گیانی نامادی

---

1 . Asara Mazas
2 . Asura Mazdas
3 . Poroto-Iranian
4 . Urmaysde

بەرەو بەهەشت دەبەن. خودی بە هەشتیش لەهەردوو بابەتەکە دا بە جێگای رووناکی دەزانن[23].))

لە جیهانی ئایینی ئێرانی دا ئایینێکی مانگیش دەبینرێ. مانگ لەگەڵ رووخساری جوانەگایەکی ئاسمانی بە یەك شت دادەنرا، ئەمە لە سەردەمەکانی کۆن بەتایبەت لە میسۆپۆتامیا باو بوو. لە زمانی ئاڤێستایی بە مانگ دەووترێ گائۆچیسرە[1] واتە ((خاوەنی تووی مانگا[2])). بەپێی ئۆستورەی ئێرانی هەموو گیانلەبەرەکانی رووی زەوییی لەم ((تووخمە)) لەدایکبوونو هەمووی روەکەکانیش لە ئەنجامی تکانی سپێرمی مانگا بۆ سەر زەوی رووڤاون.

بەڵگەیەك لە ئالیتن تەپەی[3] تورکەمەنستانی ئێستا دۆزراوەتەوە سەبارەت بە مانگاپەرستی لە سەرەتای هەزارەی دووەمی پ.ز . ووتراوە مزگەوتی ماخ بۆخارا، کە لە سەرچاوەکانی سەرەتای ئیسلامی ئاماژەی پێکراوە، سەرەتا پەرستگەی مانگ (قس، "مانگی" فارسی) بووە[4].[٢٤]

لە سەردەمی دەسەڵاتی هەخامەنێشی دا چەند خودای ئێرانی، کە زەردەشت هەوڵی دا بوو دایانبەزێنێتە نزمترین ئاستی پلەی شەیتانی گەرانەوە سەر خوداکانی ئایینی ئێرانی، تەنانەت لە سەرزەوییەکانی ناوەڕاستی پارسیش. هێشتا داریوش پاشای هەخامەنێش دەیتوانی بەشێوەیەکی

---

[1] . Gao chithra

[2] . (توخم) لێرەدا بە واتای (مەنی) دێت. بەپێی قامووسی دهخودا، لێکدراوەی "گاوچهر" لە فارسی ئێستا دا واتە "خاوەنی دەموچاوو نەخشی مانگا". "چهر" لە ئەڤێستاییو پەهلەوی دا بە واتای تووخمو نژادو اصلو خود دێت. (برهان قاطع، تصحیح معین، ذیل چهر، و یشت ها، پورداوود، ج٢، ص ٢١١). بەڵام "چهر" بەواتای "باوك" یان اصل هێشتا لای "کۆمشییەکان" (قومسییەکان)ی دانیشتووی باشووری شاری ساری باوە. و.

[3] . Altin Tape

[4] . بۆ وەرگرتنی زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم مزگەوتەی بۆخارا سەیری بازاری ماخ بکەن لە *تاریخ بخارای نرشخی*، ١٣٧٦: ٢٩-٣٠. و.

رەخنەئامێز دەربارەی سەکاکانو ئیلامییەکان بڵێ کە ((ئەوانە ئەهورامەزدا ناپەرستن[25]))، ئەمەش نیشانەی گرنگی پێدانی فەرمەی هەخامەنشییەکانە بەو خودایە.

پێدەچێ کە هەخامەنشییەکان هەوڵیان داوە لە ئاسیای ناوەڕاست ساڵنامەکەیان بەسەر رعیەتەکانیان دا بسەپێنن، بەڵام دیار نییە کە توانیبێتیان کارێکیان کردبێ. سەغدییەکان ناوی مانگەکانی خۆیانیان لە جیاتیان داناو ناوی تازەیان بۆ رۆژەکانی ئەندرگاه یان خمسەی مسترقە[١] سازکرد وەك ئێران ناسێك دەڵێ ((گۆشەنیگایەکی بچووکی بە ئەمێشە [٢]سپێنتە/ ئەمشە سپەندان (نەمرانی زۆر بەخشەندە)، چینێك لە خوداکان)ی نیشان دەدات و ئاسیاریی لەگەڵ گاتەکان نییە[26].))

یەکێك لە خودا بە ناوبانگەکانی ئاسیای ناوەڕاست بەگە[٣] (قس. سن. بەگهە[٤]، رووسی: بۆگ[٥]) بوو، خودای پەیوەست بە شەرابو هاوسەرگیری[27]. نامەکانی کۆنی سەغدیی، بەڵگەنامە دۆزراوەکانی لولەنی[٦] سینجیانگ دۆزراونەتەوە کە لەوانەیە مێژووکەی بگاتە نزیك ٣١٣ ز، واتە پێش ئەوەی ئایینی بووزیی، مەسیحییەتو مانەویت لەلای سەغدییەکان جێگیر بێت، تەنیا باسی (سەروەری پەرستگە[٧]) دەکەن نەك گەورەی مۆغەکان[٨]، و ئەمەش تێماندەگەینێت کە یەکەم دانەیان لە جیهانی سەغدیی دا تەنانەت هەتا سەرەتای سەردەمی ساسانییەکانیش لە هەمووان گرنگتر بوو[28]. چەندجار ناوی

---

1 . Epagomenae
2 . Amesha Spenta
3 . Baga
4 . Bagha
5 . Bog
6 . Lou-lan
7 . Vgnpt
8 . Mogrt

خاتووخودای نەنایی[1] ( بەرامبەر بە ئاناهیتا/ ناهید یان ڤێنوس)[2] دووبارە بۆتەوە. شەیتان ناوێکی سەغدیی تایبەتی هەیە واتە شیم مۆ[3] کە راستەوخۆ لە ئەنگرەمەنیۆی ئەڤێستایی وەرگیراوە[29].

## ڕووبەڕووبوونەوەی ئایینی ئێرانی و یەهودیی

هێزەکانی ڕۆژهەلات لە دوو قۆناغی گرنگدا کە لە سەدەی هەشتەمی پ.ز دەستی پێکردو لە سەدەی شەشەم دا کۆتایی پێهات، وولاتی ئیسرائیلیان لەناو برد کە داوودشا/ حەزرەتی داوود لە سەدەی دەیەمی پ.ز لە فەلەستین بونیاتی کردبوو. ئاشوورییەکانی وولاتی باکووری لە سالّی ۷۲۲ ئیسرائیلیان تێك ڕووخاندو بە زۆرەملی کۆچیان بە دانیشتوانی کرد بۆ بەشەکانی تری ئیمپراتۆریەکەی خۆیان. پەرتووکی دووەمی پاشاکان (لە سەردەمی کۆن) دەلّێ ((اسباط دەیانەی ئیسرائیلی لە حەلەح و خابووری ڕووباری جۆزان برد بۆ شارەکانی مێدییەکان و لەوێ نیشتەجێی کردن)). (۱۸:۱۱) چونکە دوو شوێنی یەکەم دەکەوتە خوراسانەوە، ووتوویانە دەبێ بوونی ئیسرائیل/ بنی ئیسرائیل لە ئاسیای ناوەڕاست لەم کاتەوە لە بەرچاو بگیرێ[30]. هەربۆیە ووتوویانە کە لەوانەیە ئەم تعبیدیان دێرینانە خەریکی بازرگانی بووبێتن لە ویشکایی دژواری دوور دا[31]. ئەگەری گریمانی وەها گوونجاو نییە بەلاّم بەلّگەیەکی پتەوی نییە.

وولاتی باشوور یەهودا[4] توانی لەرێگەی دیپلۆماسییەوە سەدەو نیوێکی تریش بەرگە بگرێ و درێژە بخایەنێت. بەلاّم لە سالّی ۵۸۷ هێزێکی تر واتە بابیلییەکان، کۆتاییان بە سەربەخۆیی یەهودا هێناو ئورشەلیم و پەرەستگەکەیان تێك ڕووخاند، کە لە سەردەمی حەزرەتی سولەیمانەوە

1 . Nanai
2 . Venus
3 . Shimmu
4 . Judah

(ســـەدەی دەیـــەمی پ.ز) ناوەنـــدی قوربـــانیی کردنـــەکانی پێواروێژانـــەی ئیسرائیلییەکان بوو. بابێلییەکان وەکوو ئاشوورییەکانی بقیةالسیف یەهودایان بە دیلی بردە بین النهرین.

کەمتر لە ٣٠ساڵی دواتر، لە ساڵی ٥٥٩ سوپایەکی ئێرانـی کـە فرماندەکـەی کورشی گەورە بوو، بابلیان داگیرکردو هۆزە جوراوجۆرە دیلکراوەکانی ئەوێیان ئازاد کرد بەتایبەت یەهودییەکان. زۆربەی ئەم یەهودییانەی کە ڕێگەیان پێ درا بگەڕینەوە وولاتی خۆیان، وەك هاوولاتییـەکی ئـازادی پاشـایەتی نـوێی پارسـی بابلیان بۆ مانەوە هەڵبژارد یان هەوڵیان دا بەختی خۆیـان لـەو سـەرزەوییانە دا تاقی بکەنەوە کە لەژێر دەسەلاتی پارسـییەکان بـوو. زۆربـەیان بـەرەو ڕۆژئـاوا ڕۆیشتن‌و لە خـودی ئێـران دا نیـشتەجێ بـوون‌و بناغـەی کۆمـەڵانی یـەهودییان دامەزراند کە تاکوو ئەمڕۆ بەتایبەت لە شارەکانی هەمەدان (ئـەکباتانی کـۆن) و ئیسفەهان دەژین. لەوێوە کە کورش لـە ڕۆژئـاواش دا هـەتاکوو باکتریـاو سـەغد هەنـدێ شـوێنی داگیرکـرد لەوانەیـە هەنـدێك لـە یەهودییـەکانی بـابلی لـەو پارێزگایانەش دا نیشتەجێ بوو بێتن.

پەرتووکی ئەستێر لە چەند جێگا دا دەڵـێ (٣:٦،٨، ٨:٥، ١٢،و ٩:٢٠) کە یەهودییەکان (لە هەمووی پارێزگاکـان)ی پاشـایەتی ئێـران دەژیـان. جـەماوری ئێستای یەهودیی بۆخاراو سەمەرقەند بەتایبەتی، حەز دەکـەن مێژووکـەیان بـۆ سـەردەمی ئاشـوورییەکان بگەڕێننـەوەو خۆیـان بـە بـەرەی اسـباطی دەیانـە دابنـێن[32]. هەرچـەندە سـەعدیە گـائۆن فیـۆمی[1] لەسـەدەی دەیـەم ددانـی بـەم سەرچاوە دا ناوە[33]، بەڵام جگە لـە پـەرتووکی ئەسـتێر بەڵگەیـەکی ڕاسـتەوخۆ نییە بۆ پشت ڕاست کردنەوەی هـەبوونی یەهودییـەکان لـە ئاسـیای ناوەڕاسـت بەرلە سەردەمی پاشایەتی هەخامەنشییەکان.

---

[1]. Saadia Gaon Fayyum یـان سـعدیە بـن جـوزف، لـە عـەرەبی دا بـە سـعید بـن یوسـف الفیومی (٨٨٢-٩٤٢) ناسراوە. و.

لەم دواییانەدا هەوڵیان داوە هەندێ بەڵگە بهێننەوە کە سەمەرقەند وەك شوێنی نیشتەجێ بوونی پەنابەرە یەهودییەکان دامەزیندراوەو بنەماکەشی هەندێ ریشەناسی رەمەکییانە (سەمەر + قەند = شاری سامێری) و هەندێ بەڵگەی ترە. هەرچەند هەندێ لە نمونەکانی سەرنجراکێشن بەلآم سەفسەتەی ئاشکرای نمونەکانی تر ئەم بەڵگانە لاواز دەکات[1]. بۆ نموونە نوسەرێك چونکە فارسی نەزانیوە، دەڵێ نەورۆزی فارسی لە نۆرەی[2] عێبری بەواتای (ئاگر) وەرگێراوە[34]. ئاشکرایە کە سەمەرقەند هەتا پێش داگیرکرانی بە دەستی ئەسکەندەر لە ساڵی (٣٢٩ـ٣٢٧ پ.ن) شارێکی گرنگ بوو. ئاریان[3] ڕووداونووسی ئەسکەندەر بە مەرەکەندە[4] ناوی دەبات. بەم پێیە ئەفسانەی ئیسلامیی کە دەڵێ، دوو کەس لە کۆیلەکانی ئەسکەندەر بە ناوەکانی سەمەرو قەمەر ئەم شارەیان دامەزراند، وەك هەمان بەڵگەی یەهودیی جێی متمانە نییە.

ئەگەری ئەوە هەیە کە زۆربەی پەنابەرە یەهودیی نیشتەجێیەکان پاش ئەوەی تبعید کراون لە سەرزەوییەکانی ئێران بازرگانییان کردبێتە پیشەی خۆیان. ئەمە لگەڵ مودێلەکانی دواتریان یەکدی دەگرنەوە کە لەگەڵ خزمەکانیان یان یەهودییەکانی دیکە دا لەبەشەکانی تری پاشایەتی ئێرانی یان جێگەکانی تر توری بازرگانی ساز بکەن. سەرچاوەکانی ڕوومی نیشان دەدەن کە لە سەردەمی ئەشکانی دا، یەهودییەکانی فەلەستین‌و بابیلی، هەردووك خەریکی بازرگانی ئاوریشم بوون لە چینەوە. ئەو ناوە عیبرییانەی کە لەسەر پارچە گلینەکانی مەرودەبینرێن‌و مێژووکەی دەگەڕێتە بۆ سەدەی یەکەم هەتا سییەمی زایینی، بەڵگەن بۆ هەبوونی یەهودییەکان کە ئەو کاتە لە ڕێگەی

---

1 . لەوانەیە باشترین ڕوانگە دەربارەی لێکدراوی "سەمەرقەند"، "شمار/ شەمەرکەند" یان "شاری گەنج" بێت. علی مظاهری، جاده ابریشم، جلد دوم (ترجمەی ملك ناصرنوبان)، تهران ١٣٧٣: ١٢-٧١١. و.

2 . Navra

3 . Arrian

4 . Maracanda

ئاوریشم دا دەژیان[35]. لەوێوە کە یەهودییەکان لەسەر هێڵێکی پانی جوگرافی دا بڵاوببونەوە کە سەرزەوییەکانی ئەشکانیو رووِمی دەگرتە خۆی، بە شێوەیەکی گونجاوو رێك کەوتبووە ناوچەیەکەوە کە بتوانن لە بازرگانی نێوان هەردوو ئیمپراتۆرییەتەکە دا بەشداربن[36].

## کاریگەرییەکانی ئێرانی لەسەر یەهودییەت

ئەو کاریگەرییانەی کە کۆمەڵەکانی یەهودیی لە ژینگەیەکی فەرهەنگی دا وەریاندەگرت بەئاسانی دگۆازراوە بۆ هەمان کۆمەڵ لە ژینگەکانی تریشدا. ژمارەیەك لە بیروباوەرو و چەمکەکانی ئێرانی کە دەستپێکیان لە سەردەمی ئێرانی دا بوو و لە سەردەمەکانی هێلێنستیك[1] و ئەشکانی بەرەبەرە رێگەیان بەرەو باوەری ئایینی یەهودابیەکان کردەوە، ئەم نەریتە دواتر لە یەهودییەت دا پێگەیشت.

بیرۆکەکانی پەسمانناسی وەك ئاگادارکردنەوەکانی (قیامەت ) بوونی باوەر بە رزگارکەری مەسیحایی، (معاد جسمانی) و رۆژی دادوەری هەندێ بیروباوەرن کە یەهودییەتو (بە پەیڕەوی کردنی ئەو مەسیحییەتو ئیسلام) پێدەچێ لە ئێرانییەکانیان وەرگرتبێ. چەمکەکانی فێردۆسێکی ئاسمانی (لە فۆرسی کۆن[2]: پەئیرەدەئزە(پەردیس، فێردۆس) و دۆزەخێکیش بۆ سزادانی خراپەکاران لە ئایینی دێرینی ئێرانی دا دەبینرێ، بەلاّم لە سەرچاوەکانی ئیسرائیلی پێشتر لە سەردەمی بابلی شتێکی وەها نابێنرێ. گیانی ناپاکی، بەناوی ئەنگرە مەینێو یان شەیتانی ئێرانی، لە شێوەی شەیتانی مەسیحی و ئیسلامی پێدەگات، کە یەکەمجار لە پەرتووکی ئەیوب دا لە شێوەی هە ـ سەتان[3]، یان (تاوانبارکەر) وەدەر دەکەوێت. گۆیا چەمکی فریشتەو شەیتانانیش لە بیروباوەرەکانی ئێرانی

---

[1]. Hellenistic
[2]. Paira daeza
[3]. Ha-satan

وەرگیرا بوون. گەردووونناسی ئێرانی کۆن، بە ژمارەناسی داڕێژراو لەسەر ژمارەی حەوت، لەوانەیە پێشینەیەك بێ بۆ تەواوکاری دواتری پیتۆلی یۆنانیو عێرفانی یەهودییو مەسیحیو ئیسلامی.

پەرتووکی ئەستێر، لە تەورات، کە پێدەچێ لە سەدەی چوارەمی پ.ز لە ئێران داڕێژرا بێت، یەکێکە لە ئاشکراترین نمونەکانی کارلێکی نێوان نەریتەکانی ئایینی ئێرانییو ئیسرائیلیی بەدەستەوە دەدات. هەروەها کۆنترین ڕاپۆرتە دەربارەی نەریتەکانی فەرهەنگیی بێ ژماری ئێرانیی، وەك داب‌ونەریتی دەربار، کە لە ڕێگەی سەردەمی ئیسلامی درێژەی پێ دەدرێ. نەریتی خواردنەوە کە لە ئەستێر ١:٨ دا هاتووە[١]و جاحێزی نووسەری عەرەبی سەدەی دەیەم وەك نمونەیەك دەیگێڕێتەوە. نمونەکانی تر کاری حاجب لە ئەستێر ٥١٤، و ڕۆڵی کەسانێکە کە بە بازرگانەکاندا هەڵدەڵێن لە ١:١٠ دایە[39].

پەرتووکی ئەستێر نیشانی دەدات کە ژمارەیەك تووخمی زۆر لە ئایینی ئێرانی وەرگیراون. پێدەچێ کە تێرەشی[٢] ئاژاوەچیو هاوسەرە بەدخولقەکەی وەزیری خائن، زەرەشی[٣] دێوەزمە (لە بەشی پێنجەم)، ڕەنگدانەوەی دوو دێوەزمەی ئەڤێستان بەناوەکانی تئۆرڤی[٤] (برسێتیو ڕەقیبی ئەمشاسپەند خورداد)و زەئیریك[٥] (تونیەتیو ڕەقیبی ئەمشاسپەند ئەمۆرداد)[٦]. ئەم دووانە بەیەکەوە دەتوانن نیشاندەری ئێرانی (درووغ) (درۆج[٧]) بن کە دژی داد (دەتە[١])

---

1 . "و خواردنەوە بەپێی یاسا بوو و هیچ کەس بەسەر کەسێکی تر دا نەیدەسەپاند چونکە پاشا دەربارەی هەموو گەورەکانی بنەماڵەکەی وەهای فەرموو بوو کە هەر کەس بەپێی حەزو ویستی خۆی ڕەفتار بکات." و.

2 . Terash
3 . Zeresh
4 . Taurvi
5 . Zairik

6 . پورداوود، یشت ها، ج٢: ٣٩، ٣٥١. و.

7 . Drug

یان یاسا شان، و بە هەراوی واتا، هەمان هەرزەییە لە بەرامبەر داوێن پاکی‌و تووڕەیی لە بەرامبەر ئاسودەیی دروستکردارەکان بن[40].

جەژنی یەهودیی فۆریم[2]، کە لە چیرۆکی ئەستیر هەڵدەقوڵێ، لەوانەیە لە جەژنی بەهاری فەروەردیگان[3] وەرگیرا بێت، وەك فۆریم لە چواردەهەمی مانگی ئازار (مانگی مارس) دەستی پێدەکردو هەدیەو خەڵاتی تێدا ئاڵووگۆڕ دەکرا[41].

وەك هۆزەکانی تری هیندوئەورووپی، ئێرانییەکانیش لەو باوەڕە دا بوون کە کات لە ڕووداوێکی گەورەی اخر زمان دا کۆتایی پێ دێت. ئێرانییەکانی کۆنئارا بە کارەساتی فەرجامینیان (کە لە دوایینترین ئۆستورەناسی ئەسکەندیناڤیی بە راگنارۆگ[4] ناسراوە) دەووت فراشۆکێرێتی[5] یان فراۆشکەرت[6] (فرەشگەرد، ڕۆژی زیندووبوونەوە). بێگومان ڕێکەوت نییە کە نووسراوەکانی دیناو یی نەریتی یەهودیی، وەك ئەوانەی لە پەرتووکەکانی حەزقیال‌و دانیال دا دەبینرێت، لە ناوەڕۆکی کۆیلایەتی سەردەمی بابیلی‌و پاش ئەوی وەدەردەکەوێ[7].

سەرچاوەکانی ئێرانی تەنانەت لە دیمەنەکانی دیناو ی مەسیحی یوحنای پێغەمبەر بینراون. ئەو بندی کە لە دیناو ی (١١:١ــ٢) پیشگویی دەکات ـ کە ئورشەلیم[8]، بەڵام نەك پەرستگەکەی، تێك دەڕوخێ ـ یەکێکە لە کۆنترین دیناو ەکانی یەهودیی کە بە یۆنانی نووسراوە، واتە لە پێشبینیی ەکانی

1. Data
2. Purim
3. Farvardigan
4. Ragnarok
5. Frashokereti
6. Fraoshkart

7. "و لە پێنجەمی‌مانگی چوارەم لە ساڵی سییەمکاتێك لەناو دیلەکانی ڕووباری خابوور دا بووم، قەدەر وابوو کە ئاسمان کرایەوەو ڕۆیاکانی خودام بینی..." (پەرتووکی حزقیال نبی، ١:١) و.
8. یان بەپێی دیناوی، "قدس خودا". و.

هیستاسپیس[1] گێڕاوەتەوە. پەرتووکی دوایین، ئەگەری زۆرە کە لە پارت/ پارتیا[2] نووسرا بێت، بۆخۆی لەسەر بنەمای چیرۆکێکی کۆنی ئێرانی دەربارەی وێشتاسب شا بوو کە گرۆی ئایینی زەردەشتی ببوو، لەوانەیە نووسەری یەهودیی بە شوێن ئەوە بووە کە لەم ڕێگەوە چیرۆکەکەی لەگەڵ پێشبینیی ەکی کۆنی ئێرانی بەڵگەدار تێکەڵاو بکات[42]. لە ئەنجامدا (شای گەورە) (شاهەنشا)ی چیرۆکی مۆغەکانەی سەرەکی لە دیناو ی یوحەنا، لە شێوەی عیسا دا، پێدەگات. بەم شێوە ئەوەی کە هەر لە اصل دا پەسلاننناسی[3] یەکەی ئێرانی بوو کە لە ماوەی خولێکی چەندسەدەیی بەرەو چەمێکی هێلێنیستیکو پاشان مەسیحی پەرەی سەند[43].

بە ئاشکرا دەبینین چەمکی رەسەنی ئێرانیی لەسەر چاوەکانی یەهودیی هەن نەك لە سەردەمی پارسیی (سەدەکانی شەشەم تا چوارەمی پ.ز) بەڵکوو دواتریش لە سەردەمی هێلێنیستیکیی، واتە کاتێك کە لە فەلەستین لەژێر دەسەڵاتی یونانی بوون، بەدیار دەکەون[44]. ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەم بیردۆزە کە بیرۆکەکانی ئێرانی لە ڕێگەی نوێنەرانی یەهودییەت کە لە جیهانی ئێرانی نیشتەجێ بوونو بەم شێوە لە ناوەرۆکی فەرهەنگی ئێرانییەوە ڕۆچووبوون، بەرەو فەرهەنگی یەهودییەت ڕێگەی خۆی دۆزییەوە.پاشان یەهودییەکانی ئێرانی برۆکەکانیان بەرەو ڕۆژهەلات، بۆ ناو کۆمەڵانی یەهودییەکانی جیهانی مەدیتەرانە کە پەیوەندییان لەگەڵی هەبوو، گوازتۆتەوە. پێشتر باسمان کردووە کە بناغەی ئەم پەیوەندییە ماندگارە، بەلایەنی کەم بە ڕێژەیەکی گرنگ، سەرقاڵی یەهودییەکان بوو لە بازرگانی ڕێگەی دژواری دوور دا.

---

[1]. Oracles of Hystaspes یان پێشبینیی ەکانی وێشتاسب/ گشتاسب. Oracle لە پەرتووکی پیرۆز، لە هەموو جێگایەك بە "پەرتووکی خودا" ناوی هاتووەو "پیشگوویی"ش بە "پێغەمبەری". و.

[2]. Parthia

[3]. Eschatology

## یەهودییەت لە ئاسیای رۆژئاوا

تەنیا نووسراوەیەکی بەردین لە کنسەیەك لە کایفێنگ[1] لە بەشەکانی سەرووی زەردروود دۆزراوەتەوە نیشانەیەکی ورووژێنەر سەبارەت بە بوونی لەمێژینی یەهودییەکان لە ئاسیای رۆژئاوا بە دەستەوە دەدات. لەم بەردنووسە دا کە مێژووکەی دەگەڕێتەوە بۆ ١٦٦٣ هاتووە ﴿ئەم ئایینە لە تیانچۆ[2] (لە ووشەدا (هێندە) بەلأم لەوانەیە تەنیا بە واتای رۆژئاوا بێ) دەستی پێکردو یەکەمجار لە سەردەمی چۆ[3] (پاشایەتی چۆ،ح ١١٠٠ ـ ٢٢١ پ.ن) گوازراوە بۆ چین. تزەیەك[4] (تەلار باوان) لە دالیانگ[5] (کایفێنگ) دروست کرابوو. بە دەستی (خانەدانەکانی) هەن، تانگ، سونگ، مینگو ئەمرۆ بەرزیو نزمی زۆری بە خۆیەوە بینیوە[45]﴾.

ئەگەر مەرج بێ کە بروا بەم بەردنووسە بکەین، ئەم کۆمەڵەی یەهودییەی کە لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە چینی رۆژئاوا دۆزرانەوە، پێدەچێ لەلایەن ئەو بازرگانانەوە دامەزرێندرا بێت کە لە ڕێگەی ئاوریشمەوە پێش کۆتایی سەدەی پ.ز هاتبوونە ئاسیای رۆژهەلأت. هەروەها رایان وایە کە ئەم پرۆسە پێشتر لە سەردەمی داوودشا/ حەزەرەتی داوود دا رووی داوە. لایەنگرانی بیردۆزی دووەم ئامازەیان بە هەندێ زاراوە کردووە کە لە پەرتووکی پیرۆزی عیبریی دا هەیەو بە واتای (ئاوریشم)وەریان گرتوون، هەرچەند کە نەیارەکان ئاماژە دەکەن کە زۆری ماوە ئەم واتایانە بسەلمێندرێ[46]. لایەنگرە ئارەزوومەندەکان ماوەیەکی زۆر لە پەرتووکی ئەشعیای پێغمبەر دا (دیار سینیم[6])یان بەهەمان چین دەناسی، بەلأم ئەم هاوپەیوەندییە رەت

[1]. K'ai-feng
[2]. T'ian-chu
[3]. Chou
[4]. Tz'u
[5] Ta-liang
[6]. Sinim

کراوەتەوە[47]. باستان شناسان لە ١٩٩٣ لە میسر نمونەیەکی ئاورێشمیان پەیدا کرد کە مێژووکەی دەگاتە سەدەی دەیەمی پ.ز[48]، و بازرگانەکانی ئیسرائیلیی دەیانتوانی وەك هەر کەسێکی ترلە گوازتنەوەی ئاورێشم بۆ سەرزەوییەکی تر ڕۆڵیان هەبێ. لەوانەیە بووتریێ کە هێنانەوە بەڵگە بۆ ئەوەی کە یەهودییەکان لە سەردەمی زۆر کۆنەوە لە بارزگانی سەرووئاسیایی دا بەشداریان کردووە، باش بێ، بەلاّم مێژوویەك کە وەها زێدەرۆیی تێدا کرا بێت جێگەی باس و خواسە.

بەداخەوە هیچ بەڵگەیەکی تر بۆ پشتڕاست کردنەوەی بەردنووسەی کایفێنگ لە ئارا نییەو لەوانە تەنیا ڕەنگدانەوەیەکی نەترسانەی بانگەشەیەی کۆنی کۆمەڵەی یەهودیی چینی بێت کە جێگەی لە ئۆستورەی خاستگاهی ئەوان دا هەیە. بەردنووسەیەکی کۆنتر لە ١٥١٢و بەردنووسەیەکی هەندێك دوایینتریش لە ١٦٧٩ دا، مێژووی گەیشتنی یەکەمین یەهودییەکان بۆ چین دەگەڕێننەوە سەردەمی هەن (٢٠٢پ.ز ـ ٢٢١ز). هاوکات لەگەڵ دانانی ئەم مێژوویە، هەندێ لە یەهودییەکانی چین لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا بە بانگهێشتکەرێکی یەسوعییان ووت کە بەپێی نەریتی زارەکییان، یەکەمجار باب‌وباپیرانیان لە سەردەمی پاشایەتی مینگ تی[1] (٥٨ ـ٧٥ز) لە ئێرانەوە هاتوونەتە چین[49].

لێرەدا گۆیا دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی کایفێنگ، نەك زووتر لە سەدەی دەیەم ز، لەڕێگەی دەریاوە گەیشتنە ئەوێ لە کاتێکدا ئەو یەهودییانە لە ڕێگەی ووشکاییەوە زۆر زووتر گەیشتبوونە هەرێمی چین[50].

## ئایینی ئێرانی و یەهودیی لە ڕێگەی ئاورێشمی کۆندا

[1]. Ming-ti

هەرچەند بەڵگەیەكی ئۆتۆ لەبەر دەست نییە بەڵام دوور نییە كە بازرگانەكانی ئێرانیو یەهودیی هەردووكیان لە سەردەمێكی زۆر كۆنەوە، لەوانەیە ۳۰۰۰ ساڵ پێشتر یان زووتریش، لەڕێگەی ئاورێشمدا خەریكی ئاڵوویێری بازرگانی بوو بێتن. دیارە كە لە گەشتەكانیان دا بیرۆكە ئایینییەكانیشیان لەگەڵ خۆیان دەبردو ئاشكرایە لەگەڵ هۆزەكانی ئەم ڕێگەو ناوچانەش دا ڕووبەڕوو دەبوونەوەو لەگەڵ ئەم بیرۆكانە دا ئاشنا دەبوون. بەڵگەیەك لە دەستدایە كە بەپێی ئەو خانەدانی جویی ڕۆژهەڵاتی چین بەرلە سەدەی هەشتەم پ.ز پیشگویان ئێرانییان بە خزمەتی خۆیان گرتووە[51].

هەربۆیەش دەكرێ بووترێ لە سەردەمە كۆنەكان دا هەندێ لە بیرۆكەكانی ئایینیی لە ڕووی جوگرافیاییەوە بەرەو ڕۆژهەڵات پەرەیان سەندووە، بەم واتایە كە خاوەنی ئەم بیرۆكانە بە جەستە چوونەتە ئەو شوێنانە، بەڵام ئەم قسە بەم واتایە نییە كە سیستێمەكانی ئایینی ئێرانیی یان یەهودیی لەو شوێنە گەشەیان كردبوو یان كۆمەڵێك نوئایینیان كۆكردبێتەوە. ئایینەكانی مزگێنیدەری گەورە هێشتا نەچوو بوونە ناو قۆناغی ئایینی جیهانییەوە.

لە كۆمەڵگا سنتیكان دا ئایینەكانیشیان وەك خەڵكەكە، بەگشتی بە ناوچەو شوێنێكی تایبەتو لە ئەنجامدا بە فەرهەنگی خوجێیان دەبەستەوە. لە ڕوانگەی خەڵكی ئاسیای ناوەڕاست یان چین، هەر ئایینێك كە بازرگانێكی بێگانەی ئێرانی یان بنی ئیسرائیلیی شوێنكەوتەی بوو و جێبەجێی دەكرد، تەنیا ئایینێكی خۆماڵی ئێرانییەكان یان ئیسرائیلییەكان بوو، ئیتر بیری لەوە نەدەكردەوە كەبۆخۆی دەتوانێت ئایینێكی وەها پەسەند بكات بەبێ ئەوەی وەها نیشانی بدات كە كە لە ئێران یان فەلەستین وەرگیراوە. دیسان هەروەك توركەكان، چینیەكانو هۆزەكانی ئاسیای ڕۆژهەڵات لەگەڵ ئەم بازرگانانە كە لە ڕۆژئاواوە هاتبوون، پەیوندییان دەگرتو شێوازی بیركرنەوەیانیان دەناسی، لەوانەیە چاوپێكەوتنو گفتوگۆكانی ڕۆژانە كاریگەری ووردی دوولایەنەیان

لەسەر فەرهەنگی یەکدی دانابێت. بۆ نموونە، بیردۆزێک ئەوەیە کە تائۆیستەکانی[١] سەردەمی هەنی دوایین (واتە قۆناغێك پێش ٢٢١ ز) زاراوەکەیان بۆ (ئاسمانی باڵا) یان تالۆ[٢] وەرگیراو لە گەرو- دەمنەی[٣] ئێرانی، بە واتای (پەرستگە) کە بەرزترین ئاسمانە لەناو چوار ئاسمانو پەیوەستە بە ئەهورامەزدا کە لە چەند بەشێکی ئەڤێستانەورا دا بە دادەڤە ناسراوە[4] [52].

بەپێی ڕوونکردنەوی زانایەکی ژاپۆنی (جەژنی گیان)ی بەناوبانگی ژاپۆنی، کە ئایینێکی ساڵانەی خوراك پێدانی ئەو گیانانەیە کە پشت گوێ خراون، لە سەردەمی تانگ لە ڕادەبەدەر باو بووە، لەراستیدا خاستگاهی ئێرانیی هەیە. ناوی چینی ئەم جەژنە، یۆ لەن پێنە[٥]، کە لەوانەیە لە ڕوانی[٦] سەغدیی[٧] وەرگیرا بێت. لە پێوەندی لەگەڵ ئەم جەژنە چیرۆکێکی ڕەمەکیانەش هەیە، کە تێیدا ڕیبانێك بەناوی مۆلیان[٨] چووە دۆزەخ کە دایکی بگەڕێنێتەوە، پێدەچێ بناغەی ئەم چیرۆکە ئۆستورەی یونانی دیۆنیسۆس[٩]و سێمێلە[١٠] بێت[53]. لە سەرەتاکانی دەستپێکی سەردەمی ئێمەدا بۆ وەها کارتێکەرییەك بەڵگەیەکی تر لەبەر دەستدایە[54]، بەڵام لەوانەیە ئالووێرەکانی هاوشێوەی ئەم بیرۆکانە زۆر زووتر لەمانە باو بووبێت، و ئەگەر (وەریبگرین کە) پیشگویانی ئێرانی لە خزمەتی

1 . Taoist
2 . Tq-lo
3 . Garo-damna

4 . گەرو- دمەنە یان گرونمان garomana، کە لە فارسی دا گرزمان واتە کوورسیو تەخت بە مانای خانومانی پیاهەڵدانە. (پورداوود، یشت ها، ج ٢، ص ١٧٠، و برهان قاطع، تصحیح معین، ذیل گرزمان، پانویس، ص ١٧٩٣) و.

5 . Yu-lan-p'en
6 . Rw'n

7 . "ڕەوانی"ئێستای فارسی. و.

8 . Mu-lian
9 . Dionysos

10 . Semele، خاتووخوداو دایکی دیۆنیسۆس. و.

کۆشکی جۆ دا بوون کەواتە ئەگەری ئەوە هەیە ئەو بیروکانـەش لـەوێ بوونیـان بووبێت.

## بەشی سێهەم

## بوودیزم و ڕێگەی ئاوریشم

سەردەمێك لە سەدەی حەوتەم هەتا چوارەمی پ.ز لە باکووری هیند پیاوێك بەناوی سیدراتە گێۆتەمە[1] دەژیا کە بە بوودا یان (دۆزەرەوەی ڕووناکی) بەناوبانگ بوو[1]. بوودا، چاکسازێکی واتایی بوو کە بەدوای ڕێگەیەکی ناوەندی نێوان دوو لێواری کامەرانیو خۆئازاردان دەگەڕا، پەیامێکی لەسەر بنەمای چواڕراستی گەورە فرا میامۆخت:کە ژیان ڕەنجە، ڕەنج هۆیەکی هەیە بەناوی (تونیەتی) یان ئارەزوو از، ڕێگەیەك هەیە بۆ کۆتایی هێنان بە ڕەنجو تێپەڕاندنی ڕێگەیەکی هەشتیانەی گەورەیە کە ئەویش بریتییە لە لۆژیکی دروست، بیرۆکەی دروست، گووتاری دروست، کرداری دروست، ژینی دروست، کۆششی دروست، بەئاگابوونی دروستو هاودڵی دروستە.

بوودا بەدرێژایی تەمەنی کۆمەڵەیەکی چواربەشی لە شوێنکەوتەکانی بەناوی سەنگە[2] یان (انجمن)ی دامەزراند کە لە نێوان ڕەببانەکانی ژنو پیاوو "پیش نشینان" یان بهدینان دابەش دەبوو. ئەوەندەی پێنەچوو کە زۆربەیان لە سەرانسەری هیندو ئەودیوی هیندی گەشتێکیان دەست پێکرد بۆ ئەوەی مزگێنی بوودا لە هەموو شوێنێك بڵاو بکەنەوە چونکە بڕوایان وابوو کە پەیامێکی جیهانییە.

---

[1]. Siddhartha Gautama
[2]. Sangha

ئەمە یەکەمین بانگەشە یان هەوڵی پەروپاگەندەیەکی زۆر گەورەیە لە مێژووی ئایینەکانی جیهاندا. ئەم چالاکییە لە سەردەمی ئیمپراتۆری ئاشوکا[1] لە خانەدانی مەئۆریە[2] (پاشایەتییەکەی ح ٢٦٨-٢٣٩) زیادی کرد. ئەو کە گرۆیی بوودیزم ببوو و لەو ڕەنجو مردنەی کەبەهۆی داگیرکارییەکانی نیزامی ئەوە هاتبووە ئاراوە زۆر پەشیمان بووەوە، هەربۆیە بوودیزم لە ئیمپراتۆری بەرفراوانی باکوور هیند گەیاندە پێگەیەکی فەرمی (هەرچەندە ئایینی حکوومی نەبوو). لە سەردەمی بوودا ڕەببانەکانی پێشەنگی بووزیی دوو شووڕایان پێکهێنا بەو مەبەستە کە نەبوونی هاوئاهەنگییەکانی بواری پەیڕەوو پراکتیکی بووزیی چارەسەر بکەن². ئەفسانەیەك دەڵێ: ئاشوکا کە لەم مشتومڕانە ناڕازی بوو، لە ساڵی (٢٤٤ پ.ز) فەرمانی پێکهێنانی سێهەمین شووڕای دەکرد هەتا ئۆرتۆدۆکسی[3] بووزی ڕێك بکات³. ئەگەر بەراستی ئەم شووڕای سێهەمە پێك هاتبێت، جگە لە پەرەپێدانی ئاگری ئەم کووتلەکارییانە کارێکی دیکەی نەبووە.

بەپێی بیردۆزەکانی کلاسیکی مشتومڕەکانی ناو سەنگە جەختی لەسەر باری سروشتی ئەو ڕەببانانە دەکرد کە گەیشتبوونە پێگەی لەخەو ڕابونەوەو پێییان دەووترا ئارهەت[4]. پێنج بیردۆز خرایەروو کە لەوانەیە لەلایەن ڕەببانێکەوە بێت بەناوی مەهادیڤە[5]، و لە ڕێگەی ئەم تیۆرەوە بانگەشەی کۆسپی ئارهەتەکانی دەکرد کەوا هێشتا گیرۆدەی دڵپەرێشانییەکانی ئەم جیهانەن، وەك خەونەکانی شهوانی، نەزانییەك کە لەناویاندا ماوەتە، گوومانو دوودڵیی کە وازیان لێ ناهێنێتو کۆمەڵێك شتی لەم شێوە.

---

1. Ashoka
2. Maurya
3. Orthodoxy
4. Arhat
5. Mahadeva

مشتومڕێکی تر ئەوە بوو کە ئاراستەی ئارهەتەکان توانستی لەخەوڕابوونیان تایبەت بە گرووپێکی بچووکی خەڵک دادەنا. لەگەڵ هەمووی ئەمانە دەبوایە ڕوویەکی تری ناکۆییەکان پێوەندی بە دۆزی ڕەخنەگرتن لە کردارە ئایینییە ڕەمەکییەکانەوە هەبێ، بەتایبەت ڕێزگرتن لە پەرستگەکانی بوودا (لە پەرستگە پیرۆزەکان). ڕەببانە میانەڕوکان هەستیان دەکرد ئەم جۆرە تازەگەرییانە مەترسی دەخەنە سەر پاکی پەیامەکەی بوداو پابەندبوون بەشێوازی ژیانی بووزیش سست دەکات.

بەپێی بیردۆزی کلاسیك، میانەڕوکان لایەنگرییان لە پێگەی بەرزی ئارهەتەکان دەکرد وەك سەرۆکی ناو انجمن، لە کاتێکدا زۆرینە لایەنگری پێنج بیرۆکەیەك بوو کە مەبەستیان دابەزاندنی پێگەی بەرزی ئارهەتەکان بوو. گرووپی میانەڕوکان بە (گەورە انجمنیها) ناوزەد کران[4].

ستەڤیرەکان[1] و نەیارەکانیان، واتە زۆرینەی جەماوەر، بە مەهاسەنگیکەکان[2] یان لەم دواییانەدا هەندێ لە زانایانی بوودیزمی سەرەتایی هەوڵیان داوە کە بەم بەشەی مێژوودا بچنەو دەڵێن لەوانەیە زۆربەی ئەم ناکۆکیانە دواتر هاتبێتە ئاراوو وەك جیاوازییەکی (مێژوویی) ئەم ناکۆکیانە دەخەنە پاڵ رابردوو. لەوانەیە وەها بێ کە خاڵی ناوەندی دژبەری ناوەکی سەنگەی دستپێك، سەرێکی زیادکراو بووبێت لەسەر پەیکەرەی یاساکانی شێوازی ژیانی ڕەببانی بەناوی ڤینەیە[3]. زۆربەی ڕەببانەکان زیادکردنی ئەم یاسا نوێیانەیان رت دەکردەوە، تەنیا ئەوە یاسایانەیان پەیرەو دەکرد کە خودی بوودا بنیاتی نابوو. بەواتایەکی تر، ستەڤیرەکان ئەوانە بوون کە دەیانویست بە زیادکردنی

---

[1]. Sthavira بە پالی تەیرە Thera و قوتابخانەکەشیان بە تێرەوادە Theravada ناسراوەو لەلای ئێمە زیاتر چەمکی تێرە باوە نەك ستاڤیرەی سانسکریتی. و.

[2]. Mahasangika

[3]. Vinaya

هەندێ بابەت بە ڤینەیە ((چاکسازی)) تێدا بکەن، مەهاسەنگیەکانیش خوازیار بوون کە گێڕدراوەی دیرینی کورتتریان هەیە، واتە ئەمانە بوون کە بە گرووپی ((محافظە کارە)) هەژمار دەکران[5].

بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی پەیڕەوەکانی بووزیی کۆمەڵێك قوتابخانەی جۆراوجۆر وەردەرکەوتن کە کارەکانیان لە رابردوو ئاڵۆزتر کرد. هەرکام لەم قوتابخانانە،کە بە گشتی بە نیکایە[1] ناسرابوون، کانوون/ قانونی[2] نووسراوەی تایبەت بە خۆیان کۆکردەوە کە بە هەڵگری پەیڕەوەکانی بووزییان دادەنان لەگەڵ کۆمەڵێك لێکدانەوەی تایبەت کە بڕوایان پێی هەبوو. بەپێی ئەفسانەکان هەژدە قوتابخانە لەم شێوە هەبوو. زۆربەیان کۆمەڵێك نووسراویان لە پاش خۆیان بەجێ هێشت، بەڵام تێرەوادە ﴿سن. ستاڤیرەوادە، بەواتای (ڕێگەی پیران) یان ڕێگەی پیرانی تەریقەت﴾ تەنیا قوتابخانەیەکە تا ئیستا ماوەتەوە، واتە ئەو شێوازە لە ئایینی بووزی کە لە سێر بلانکاو باشووری ڕۆژئاوا ئاسیادا باوە.

بوودیزم پەیکەرێکی لە نووسراوەکان پێکهێناوە کە بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی لەهەر بزوتنەوەیەکی تر بەرفراوانترە، و خوێندنەوەو پێداچوونەوەی تەنانەت یەك قوتابخانە کارێکە کە سەرانسەری تەمەنی تاك دەگرێتەوە. لە چینی ئێستا مامۆستایانی بۆاری پیتۆلی خوێندکارەکانیان ئاگادار دەکەنەوە کە ((خوێندنەوەی جدی لەسەر بووزیی سیاەچالەیە، ئەگەر بچنە ناویەوە ئیتر هەرگیز نابینرێن!))[6]

[1] . Nikaya
[2] . canon

## قوتابخانەکانی بووزیی ڕێگەی ئاوریشم

چونکە ئێستا زۆربەی قوتابخانەکانی بووزیی سەرەتایی ئیتر نەماون، دەبێ بیرۆکەکانیان بەپێی ئەو نووسراوانەی کە لەبەر دەستن دابڕژێنەوە. مێژووی نووسراوەکانی ئێستا، تەنانەت ئەوانەش کە پوچەڵ کراون، دەگاتە سەدان ساڵ پاش پەیدابوونی ئەم قوتابخانانە، هەربۆیە زانینی پێگەی قوتابخانە جۆراوجۆرەکانی سەرەتاییو پێوەندییان لەگەڵ یەکدی کارێکی دژوارە.

دەرمەگۆپتەکە[1]و سەرڤاستیڤادین[2] قوتابخانەکانی سەرەکی *نیکایە* بوون کە تایبەت بەو ناوچانە بوون کە ڕێگەی ئاوریشم بە ناویان دا تێدەپەری. مەهاسەنگیکەکانیش سەرەتا لێرەدا چالاك بوون. ئاراستەی جێنشین، بزوتنەوەیەکی بەرفراوانتر بوو کە بە مەهایانە[3] یان ڕەورەوەی گەورە ناسراو سەرەتا دژەی کردە ناو هەندێ ناوچەی ئاسیای ناوەڕاست وەك خۆتەن، ئەمەش بەر لەوە بوو کە قوتابخانەکانی نیکایە بە یەکجاری لە ڕێگەکانی ئاوریشم وەدەرنێت.

### مەهاسەنگیکەکان

هەوڵی مەهاسەنگیکە بەمەبەستی کەمکردنەوەی گرنگی تایبەتی ئامانجی ئارهەت، یان تەنیا خۆراگریان لە بەرامبەر تازەگەرییەکانی وێنەیە، بووە هۆی یەکەمین کەرتبوونی گەورەی ئەنجومەنی بووزیی. هەروەها کۆمەڵێك لە مەهاسەنگیکەکان بڕوایان وابوو پرەگنا[4] یان شارەزایی دیمانە، دەستبەجێ ڕوودەدات نەك بەرەبەرە، چونکە سەرڤاستیڤادینەکانیو ئەوانەی تر بەم

1. Dharmaguptaka
2. Sarevastivadin
3. Mahayana
4. Prajna

شێوەیەک فێردەبوون، ئەم بیرۆکە دواتر لە مەهایانەشدا ڕۆڵێکی سەرەکی هەبوو بەتایبەت بەشێوەی زێن[١].

کۆتەڵەکانی گەورەو بەناوبانگی بووزیی کە لە بامیانی وڵاتی ئەفغانستان، کە (٥٠) مەترو (٣٠) مەتر بەرزاییانە[٢] و لەسەر گاشەبەردێکی سەر هەلدێرێك هەڵکەندراون، لەوانەیە کاری مەهاسەنگیکەکانی باکووری ڕۆژئاوا بووبێتن.

## دەرمەگۆپتەکەکان

لەوانەیە قوتابخانەی دەرمەگۆپتەکە یەکێك لە بە نفوزترین قوتابخانەکانی ڕێگەی ئاوریشم بووبێت کە تاکوو سەردەمی ئیمپراتۆری کووشانییەکان لە یەکەمین سەدەکانی سەردەمی مەسیحییەت دا پەیدا بووە. دەرمەگۆپتەکان زۆربەی نووسراوەکانیان بەزمانی پەرکریتی گەندهاری[٣] نووسیوە کە زمانی خۆجێیی باڵادەستی وڵاتە اصلییەکانی کووشانییەکانی باکووری ڕۆژئاوای هیند بوو. یەکەمین بانگهێشتکەرانی بووزیی ئاسیای ناوەڕاست، زۆربەی نووسراوەکانی دەرمەگۆپتەکەیان بردە وڵاتی چین. بەڵام تاکوو سەردەمی گەشتەکانی سیوئان زانگ لە سەدەی هەفتەمدا، ئەم قوتابخانە لە هیند دا نەمابوو و تەنیا چەند نوێنەرێکیان لە ئاسیای ناوڕاستدا هەبوو.

پێدەچێ دەرمەگۆپتەکەکان پێچەوانەی باوەری قوتابخانەکانی دیکە بەم بیرۆکە جیاواز دەبوون کە بوودایان لە انجمن بووزیی جیا دەکردەوەو مەزنتریان دادەنا نەك بە بەشێك لەو. لقێکی پراکتیکی ئەم ڕوانگەیە ئەم باوەرە بوو کە ئەو شتانەی کە پێشکەشی بوودا دەکرێ، نەك انجمن، دەکرێ نکوکرد بەرهەم بێنێت. لەوێوە کە مانەوەی انجمنی ڕەببانی بەندبوو بەو پێشکەشییانەی کە

---

[1] . zen

[2] . لە ١٩٩٩، کاتی چاپی ئەم پەرتووکە هەبوون بەڵام دواتر گرووپی (تالیبان) لەناویان بردن. و.

[3] . Gandhari

((پیش نشینانی)) بووزیی پێیان دەبەخشیّ، ئەگەری زۆرە کە ئەم بیرۆکە لە لەناوچوونی ئەم قوتابخانەدا ڕۆڵی هەبوو بێت.

## سەرڤاستیڤادینەکان

ناوی ئەم قوتابخانە لە عبارت سەرڤەم ئەستی[1] واتە (هەمووی هەیە) وەرگیراوە. ئەم عبارتە نیشاندەری بیردۆزی ئەم قوتابخانەیە دەربارەی کات. بەپێی ئەم بیردۆزە رابردوو و ئێستاو داهاتوو هەمووی لەکاتێکدا بوونیان هەیە. بەپێی نەریتی تێرەوادە، دەرکردنی سەرڤاستیڤادینەکان یەکێکە لە دەستکەوتە اصلیەکانی سێهەمین دانوستانی بووزیی بوو کە ئاشوکا داوای پێکهاتنی کردبوو.

ئەگەر ئەم قسە راست بیّ، لەوانەیە هۆکاری سەرەکی دوورخستنەوەی قوتابخانەی سەرڤاستیڤادین بۆ ئاسیای ناوەڕاست بێت. دەرمەگۆپتەکەکان هەتاکوو سەدەی دووهەم گۆرەپانیان بۆ سەرڤاستیڤادینەکان بەتاڵ کردبوو. سەرڤاستیڤادینەکان بەپێچەوانەی قوتابخانەکانی تر، کە زمانی پالی یان زمانەکانی تری ناوچەکەیان بەکاردێنا، زۆربەی بەشەکانی نووسراوەکانیان بەزمانی سانسکریتی نووسیبوو کە زمانیی ئایینیی کۆن بوو، ئەمەش هەوڵێك بوو بەمەبەستی کۆنئارا کردنی بەرهەمەکانیان کە رووخسارێکی بەرزی ڕێزداری پێدەبەخشین.

## مەهایانە

مەهایانە تەنیا قوتابخانەیەك نەبوو بەڵکو ((بزووتنەوەیەکی تەواو بووزیی)) بوو کە زۆرتر بە پەسەندکردنی پەرتووکی پیرۆزی نویّ پێناسە دەکریّ[7].

[1] . Sarvam asti

مەهایانە بەواتای رەورەوەی گەورەیە، بەم شێوە ناویان لە خۆیان ناووە. سەرچاوەی ئەم ((رەورەوە گەورە))ی لەخەو رابوونە بەتەواوی دیار نییەو لەوانەیە هەرگیزیش روون نەبێتەوە. لێکدانەوەی زانستخوازی کۆنئاراتر کە بڕوای وایە ئەم نەریتە هەڵقوڵاوی قوتابخانەی مەهاسەنگیکەیە، چیتر لای هەمووان پەسەندکراو نییە، بەڵکو هێشتا مشتومڕی لەسەر دەکەن کە مەهایانە بە پلەی یەکەم لەناو ((پیشنشینانی)) بووزیی یان بهدینان پەیدابووە یان لەناو انجمنی رەببانەکان[8].

ئەم بزووتنەوە، کە لە سەرەتادا پێدەچێ ڕێژەکەی بچووک بووبێت، لەوانەیە بە درێژایی سەدەی یەکەمی پ.ز لە باکووری رۆژئاوای هیند یان ئاسیای ناوەڕاستەوە دەستی پێکردبێت. هەرچەند کۆمەڵێك پەرتووکی پیرۆزی مەهایانە بەم دواییانە لە پاکستانی باکوور دۆزراونەتەوە بەڵام زۆربەی ئەو نووسراوانەی کە دواتر بوون بە نووسراوی بنەڕەتی مەهایانە پێدەچێت لە ئاسیای ناوەڕاست لە رێگەی ئاوریشمدا درێژرابێت، چونکە دەبێ لەوێ ئاوێتەبوونی نەبراوەی فەرهەنگو بیرۆکە یارمەتی کاریگەرییە جۆراوجۆرەکانی دابێت. هەروەك زانایەکی هاوچەرخ بیرمەندانە وتوویەتی ((ئەگەری زۆرە کە بڵاوبوونەوەی گشتی مەهایانە رووداوێك بووبێت کە لە دەرەوەی نیمچەدوورگەی هیند رووی دابێت چونکە لەوانەیە پێوەندی بە گوازتنەوەی بوودیزمەوە هەبێ بۆ فەرهەنگەکانی دیکە.))[9]

لەناو بنمایە جیاوازەکانی ئەم پەرتووکە پیرۆزە نوێیانەدا یەکێکیان بەرزبوونەوەی بوودا بۆ پلەی لوکۆتەرە[1] بوو کە لەم بیروباوەرەدا رەنگی دابووەوە کە مەرگی بوودا نیشانەیەکی صرفە (ئەم بیرۆکە لە مەهاسەنگیکانەوە وەرگیرابوو). هەروەها جەخت لەسەر هاوخەمی دەکرا لەگەڵ کەمبەختەکانو گرنگتر لەمانە ئەوە بوو کە هەمووی گیانلەبەر یان

[1] . Lokuttara

بوونەوەرەکان "سروشتی بوودایی" (تەتاگەتە[1])یان هەیەو نابێ ئارەزووی کەمتر لە بووداگی تەواو بکەن.کەسێك کە گەرانێکی وەها قورسی بوون بە بوودای دەستپێدەکرد بە بووداسەف/ بوودیستەڤە[2] دەناسراو ئەمەش پلەیەك بوو کە لە ئەرهەت مەزنتر دادەنرا.

دەکرێ کەسی بووداسەفی بەم شێوە پێناسە بکرێ کە سوێند دەخوات چەندین جار تاکوو هەر کاتێك پێویست بێت لەدایك بێتەوەو هەوڵ بدات ببێتە بوودایەکی نمونەیی بەم مەبەستە کە یارمەتی هەمووی گیانلەبەرەکان بدات کە بگەنە رزگاری. ئەمە لە وێژەی پرەگیاپارەمیتای[3] مەهایانەدا بە مەبەستی ئاستەنگترکردنی رزگاربوونی صرفی تاکەکەسی، کە نیشاندەری ئاراستەیێکی نەریتخوازانەیە، در تقابل میایستد[10]. رەگەزێکی زیدەی بەرهەمی سەرەتایی مەهایانە دوژمنایەتی قووڵو قورسیەتی لەگەڵ کەسانێك کە ئەم نووسراوە نوێیانە باوەرپێکراو ناناسرێن[11]. سەرئەنجام مەهایانییەکان بەرەبەرە بە مەبەستی تحقیر کردنیان، بە "هینەیانە" واتە ((رەورەوەی بچووك)) یان ((رەورەوەی نزم)) ناوزەدیان کردن.

هەرچەند دەکرێ هەندێ لە قوتابخانەکان وەك تێرەوادە بێخودا بناسرێن، بەڵام دەرکەوتنی مەهایانە ئەگەری بەخودازانینی بووداکانو بووداسەفەکانی هێنا ئاراوە. بەپێی هەندێ لێکدانەوەکانی مەهایانە، ئەو بووداسەفانەی نیکوکردێکی زیاد لە پێویستان بەدەستهێناوە دەتوانن بەکەسانی تری بسپێرن. هەربۆیە جەماوەری خۆشنەویستیان زۆرجار لەلای بوودا یان

[1]. Tathagata
[2]. Bodhisttva
[3]. Prajnaparamita

بووداسەفەکانی تر دوعاو تەمەنایان دەکرد، یارمەتیان بدەن کە لە دووبارە لەدایکبوونەوە لە جیهانی (سەنسارە[1]) ڕزگارییان بێت.

بەڵام مەهایانە وینەیەکی تایبەت بە خۆی دروست نەکرد، لەجیاتیان ڕەببانەکان یاسایەکیان پەیڕەو دەکرد کە قوتابخانەیەکی نیکایەی دیکەی دامەزراند بوو کە لایان ڕێزدار بوو. بەم شیوە هەرچەند نەریتی مەهایانە بەرادەیەکی زۆر لەقوتابخانەکانی نیکایەی چین وەرگیرابوو، بەلام ڕەببانەکانی چینی هەروەك جاران قوتابخانەکانی سەرڤاستیڤادە یان دەرمەگۆپتەکەیان جێبەێی دەکردو ئەمانە دوو قوتابخانە بوون کە بەر لەوانەی دیکە لە ڕێگەی ئاوریشمدا باڵادەست بوون.

## تێکەلاوی گەندهاری و کۆشانییەکان

بەپێی ئەفسانەیەك کە لە زمانی پالّی دا بە زمانی کانون/ قانونی تێرەوادە ماوەتەوە، یەکەم پێوەندی بوودیزمو ڕێگەی ئاوریشم لە سەردەمی خودی بوودا ڕوویداوە[13]. بەپێی ئەم ئەفسانە دوو برای بازرگان لە بەکتریا (هەمان بەلخی سەدەی ناوەڕاست لە باکووری ئەفغانستان)، بە ناوەکانی تەپەسو[2] و بەلیکە[3]، لە هەفتەی هەشتەمی پاش لەخەو ڕابوونەوەی سەردانیان کردو دەستبەجێ بوونە ڕێچکەگری ئەو[4]. هەر بەپێی ئەم ئەفسانە، پاشان ئەم دوو برایە گەڕانەوە بەلخو چەند پەرستگەیان دروست کردو پێشکەشی بوودایان کرد.

---

1 . Samsara
2 . Tapassu
3 . Bhallika

4 . —ع. پاشایی، بودا، تهران، ١٣٨٣: ١٤٢. ئەم ناوە لە پەرتووکی بوودا بە هەڵە بە "توپۆسە" هاتووەو تەپەسو دروستە، و لە ص ٤٩١ لە هەمان پەرتووك دا هاتووە "تپۆسە" کە وێنەیەکی تری تەپەسۆیە. و.

هەر چەند بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی ئەفسانەی تەپەسوو بەلیکە بەدەستەوە نییـە، بـەڵام بـەپێی ئـەو فرمانانـەی کـە بـە دەسـتوری ئاشـوکا لەسـەر میلەبەردینەکان هەڵکەندراوە، دیارە چەند مزگێنیدەرێکی بۆ وولآتانی بـاکووری ڕۆژئاوای ئیمپراتورییەکەی هەناردووە[14]. بەکتریا لە سەدەکانی دواتـردا بـوو بـە ناوچـەیەکی گرنگـی بـووزییو تـا سـەردەمی داگیرکارییـەکانی ئیـسلام هـەمان برەوی هەبوو. لـە سـەدەی حەوتـەم، لـە بەرەبـەری هوورژمـەکانی عەرەبـەکان، سـیوئان زانـگ زیارەتکـەری بـووزیی چینـی لـە شـاری بـەلخ سـەد پەرسـتگەی بووزییو سێهەزار ڕەبیان دەبینێ.

ناوچەی باکووری ڕۆژئاوا هێلانەیـەکی تێکـەڵاوی فەرهەنگـە جۆراوجۆرەکـان بوو. ژوانگەی جیهانـەکانی هینـدو ئێرانـی بـوو و لـە بەشـی دووهـەمی سـەدەی چـوارەمی پ.ز ئامـادەبوونی یونانییەکانیـشی پـێ زیـاد ببـوو. ئەسـکەندەری مەقدونی بەشێکی زۆری ئـەم هەرێمـەی لـە نێـوان (٣٣٢ ـ٣٢٧ پ.ز) داگیرکـردو پاش ئـەو دەسـەڵاتێکی یونـانی/ هێلێنـی[١] لـەوێ بـەجێما کـە هـەتا دوو سـەدە دواتریش بەناوی سلوکییەکان لەوێ مانەوە.

پەنابـەرەکانی یۆنـانی لـە بـەکتریاو گەنـدهارەوە (ئـەوەی ئێـستا بـاکووری ناوەڕاسـتی پاکـستانە) خوداکـانی دێرینـی یۆنانیـان لەگـەڵ خۆیـان هێنـاو بەڵگەکەشی سکەو شوێنەواری باستانشناختی ترە کە لـە پاشـیان بـەجێماوە. هەندێ لە یونانییەکان ئایینەکانی خۆجێییان وەرگرت، بۆ نمونـە هلیـۆدۆروس[٢]، باڵیۆزی ئانتیالسیداس[٣]، فرمانڕوای سلوکی، لە بێسنەگەر[٤] میلێکـی بـۆ ڤیـشنۆ[٥] علـم کـرد[15]. هەرچـەند بەڵگەیـەك لەبـەر دەسـت نییـە بـۆ سـەلماندنی گرۆیـی

[1] . Hellenic
[2] . Heliodoros
[3] . Antialcidas
[4] . Besnagar
[5] . Vishnu

بەرفراوان لە هەموو ڕەهەندەکاندا، بەڵام دەبێ ئالووێرێکی بیروکەیی ئایینی لەم یان ئەو ئاستەدا لەگەڵ جەماوەرەکانی ئێرانیو هیندی ئەو ناوچانە رووی دابێت. یونانییەکان لە ئاسیادا وەك هەرجێگایەکی تر، هەوڵیان دەدا لە نێوان خوداکانی خۆجێییو خوداکانی خۆیان پێوەندییەك بدۆزنەوە[16].

چیرۆکی کوێرکردنی کۆنەلە[1]، کوری ئاشوکا، کە سیۆئان زانگ دەیگێرێتەوە گۆیا هەمان تراژیدیای یۆنانی هیپۆلیتۆس[2]و فایدرایە[3] لە لە قاڵبی بووزییدا. بەپێی راپۆرتەکانی سیۆئان زانگ لەسەدەی حەوتەم، زیارەتکەرە نابیناکان لە ستۆپەی[4] کۆنەلە نزیکەی تاکسیلا[5] کە دەکەوێتە پاکستانی ئێستا، دوعایان دەکرد کە چاویان دوبارە بینا بێتەوە[17]! وەك نمونەیەکی بەرجەستەی درێژەدەری فەرهەنگی دەبێ بڵەین ئێستا نەخۆشخانەیەك لەو شوێنە دروست کراوە کە بەهۆی امکانات پزیشکی چاو زۆر بەناوبانگە[18]!

وەك چاوەڕوان دەکرێ، کاریگەریەکانی فەرهەنگی لە گەندهارە لە دوو ڕەهەندەوە بوو. بەڵگەیەك هەیە ئاماژە بەوە دەکات کە ئایینەکانی خۆجێیی شێوەی پەرستنی یۆنانییان پەسەند کرد، وەك جێگەنوێژی شێوەیۆنانی کە بۆ ڤەخشۆ[6] خودای (جەیجون) لە تاتی بەردین لە باکووری ئەفغانستان تەرخان کراوە. یان بەتۆرە، لەو کاتەوە کە ئەو پەرستگە وقفی هەردوو خودای ئاگرو ئاو، هەردوو دابونەریتی یۆنانیو بەکتریایی تێدا ئەنجام دەدرێ[19].

---

[1]. Kunala
[2]. Hippolytus
[3]. Phaedra
[4]. Stupa
[5]. Taxila
[6]. Vaxshu

بەم شێوە لەوانەیە باوەڕەکانی تایبەتی هیندی لە ڕێی کەناڵەکانی دیاسپۆرای[١] یۆنانی ڕێگەیان بەرەو مەسیحییەتی ژیاوەی جیهانی مەدیتەرانە کردبێتەوە. گۆیا لەسەرخۆیی لە ئایینداا بنەمایەك بووە. مێناندرۆس[٢] سەرداری یۆنانی - بەکتریایی، کە داگیرکەری بەشێکی هیندی باکوور بوو و لە (١٥٠-١٣٥پ.ز) لەوێ پاشایەتی کرد، لەگەڵ انجمنەکانی بووزیی هەرێمەکەی خۆی بە نەرمی رەفتاری دەکرد. یادی ئەو لە پەرتووکێکی بووزیی بەناوی میلیندەپەنهە[٣] یان پرسیارەکانی میلێندە پارێزراوە کە میلێندە هەمان مێناندرۆسە. لەم پەرتووکەدا شا لەگەڵ رەببانێکی هیندویۆنانی بەناوی ناگەسینە[٤] دەکەونە گفتوگۆیەکی ئەفلاتوونی (بەشێوەی رسالات ئەفلاتوون)[20].

هێراکلێس[٥] بە پێستی شێر مۆدێلێکی هونەرییە بۆ ڤەجرەپانی[٦]، کە پارێزەری بوودایە. هونەرمەندانی گەندهاری پەیکەرەی رفاندنی گانیومێدە[٧] بەدەستی زێئووس[٨]، لە هیات هەڵۆ، دەخەنە چوارچێوەی چیرۆکێکی بووزییەوە، واتە چیرۆکی سۆسەندی - جاتەکەی[٩] بووداسەفییە کە گیرودەی خۆشەویستی ژنێکی مێردار دەبێ‌و خۆی بە وێنەی گەرۆدەی باڵندە دەردێنێت تاکوو ژنەکە بفرێنێت. ئەم نەخشە لە وێنەکان‌و پەیکەرە تاشراوەکانی بووزیی تەواوەتی نیمچەدوورگەی هیندو ڕێگەی ئاوریشم‌و چیندا دەبینرێت، هەروەها ڕێگەیەك بەرەو هونەری ساسانی دەکاتەوەو لێکدانەوەیەکی زەردەشتی وەردەگرێت[21].

1. Diaspora
2. Menandros
3. Milindapanha
4. Nagasena
5. Herakles
6. Vajrapani
7. Ganymede
8. Zeus
9. Sussandi-Jataka

حدود ساڵی (١٣٠ پ.ن) سەرکردایەتی یۆنانی خۆی دابووە دەستی هێرشی سەکا رەوەندەکانو هۆزەکانی تری ستێپس. سەکاکانیش چەند کاریگەرییەکی بووزییان راکێشاو ژمارەیەك کەتیبەی بووزییان لەپاش خۆیان بەجێ هێشت. پاش تێپەرینی سەدەیەك، لە جیگایەك کە ئێستا باکووری رۆژئاوای پاکستانە، لە سەرکردایەتیو دەسەڵاتی سەکاکان هێزێکی نوێ بەناوی کووشانییەکان پەیدا بوو.

خاستگاەهای کووشانیان بە تەواوەتی روون نییە، هەرچەند پێدەچێ لە رووی هۆزەوە گرووپێکی تێکەڵاو بوون کە تارادەیەك لە کوچەرییەکانی هێندوئەورووپی دوورترین بەشی رۆژهەڵاتی رێگەی ئاوریشم پێکهاتبوو، هۆزێك کە لەلای چینییەکان بە یوئەجی بەناوبانگ بوون. سەرکردایەتی جەماوەرێکیان دەکرد کە کۆمەڵەی خۆجێیی هیندیو ئێرانی زمانو کۆچەرییەکان یونانیی دەگرتەخۆو بەرەبەرە بەسەر ئەو رێگە بازرگانییانەدا زاڵ بوون کە باکووری رۆژئاوای نیمچەدوورگەی هیندی بە رێگەی ئاوریشم دەبەستەوە.

لەسەر سکەکانی کووشانی نەخشی خودا جۆراوجۆرکانی ئێرانیو هیندیو بووزیی دەبینرێ کە نیشاندەری خۆراگری نوخبەکانی ئەم سەرکردایەتییە نوێیەیە بەرامبەر ئایینە دۆنادۆنەکان. رێژێکی تایبەتی زۆریان لە خاتووخودای ئێرانی بەناوی ئاردۆخشۆ[١] و شیواخودای هێندیی دەگرت[22]. پەیکەرەکانی نژری هەریتی[٢] خاتووخودای ئاوڵە، هۆی شومی خراپی ئەم سەردەمەن، بەربڵاوی ئاوڵە کە لە سەدەی دووهەمی پ.ز جیهانی مەدیتەرانەی داگرتبوو لەوانەیە لە وولاتەکانی کووشانییەوە دەستی پێکردبێتو لە رێگە بازرگانییەکانەوە رووی لە رۆژهەڵات کردبێت[23].

---

[1]. Ardoxsho
[2]. Hariti

کووشانییەکان لە سەرەتای سەرکردایەتییەکەیانەوە سەمبۆلی نیکەی[1] یونانیان پەسەندکرد کە نیشانەی خاتووخودای سەرکەوتن بوو و ئەمەش هوڵێکی ئاشکرای بوو بۆ تصاحبی شاهانەی یونانی - باکتریایی پێشینیان. لەگەڵ هەمووی ئەوانە، ڤیما[2] دووهەمین پاشای کووشانی، شیواپەرست بوو. ووتوویانە هاودڵ ڤیما بۆ ئایینی هیندی ڕەنگدانەوەی ئارەزووی ئەو بوو بەمەبەستی زیاتر زاڵبوون بەسەر ڕێگەی ئاورێشمدا، چونکە لەو کاتەدا لە سەرانسەری ناوچەی جێیحون و تەنانەت هەتا خودی چینیش، هیندییەکان لە بازرگانیدا چالاك بوون[24] .

جێگری ڤێما، کەنیشکەی[3] یەکەم، هەرچەند ئەگەری زۆرە کە ئەویش ئارەزووی داگیرکردنی ڕێگەی ئاوریشمی بووبێت، بەڵام زۆرتر جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە لایەنگری رعیەتەکانی ئێرانیی ڕۆژئاوا بەدەست بێنێت. لەسەردەمی دەسەڵاتداری ئەودا ناوی خوداکان کە شێوەیەکی ئێرانی بەخۆیەوە گرتبوو، دووبارە لەژێر ناونیشانی یۆنانی بەدەرکەوتنەوە، هەرچەند شیوا پێگەی فەرمی بەرزی خۆی پاراست. نەوەکەی ئەو، کەنیشکەی دووهەم، بە دروستکردنی ڤیهارەکان[4]، (دیرەکان) و ستوپەکان (پەرستگەکان یان گومبەزی گومبەزەکان) یارمەتی پەرەپێدانی بوودیزمی دا. هەروەها دەڵێن فەرمانی دا لە کەشمیر شواریەکی بووزیی پێك بهێنرێت کە تێیدا بڕیاریان دا ئەو نووسراوانەی کە بە زمانی بنەڕەتی گەندەهاری یان (پراکریت[5]) نووسرابوو، سەر لە نوێ بە زمانی وێژەیی سەنسکریتی بنووسرێتەوە، کە ئەمەش خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە پێگەیشتنی کانون/قانونی وێژەیی بووزیی. هەرچەند خودی کەنیشکەی دووهەم گرۆیی بوودیزم نەبوو، بەڵام سەرچاوەکانی بووزیی بە (ئاشوکای دووهەم) ناوی دەبەن.

---

1 . Nika
2 . Vima
3 . Kanishka
4 . Vihara: ڤیهارە، بەهار. و.
5 . Prakrit

لە سەردەمی کووشانییەکاندا بوو کە بۆ یەکەمین جار بوودایان لە هەیکەلی مرۆڤدا وێنا کردو ئەمەش گۆرانێك بوو کە هەندێ لە خاوەن ڕاکان بە دزەکردنی یۆنانی دەبەستنەوە.

پەیکەرە تەواوبالآو تندیسهای بالاتنەی بوودای قوتابخانەی ناسراو بە گەندەهارە، لە سەردەمی کووشانییەکان پەرەی‌سەند. ئەمانە تێکەلەیەکی ئاشکرای پێکهاتەکانی هیندیو یونانی نیشان دەدەن و هەر ئەم پەیکەرانە بوون کە بونیاتنەری گۆرانکارییەکانی دواتری هونەری بووزیی بوون لە چینو شوێنەکانی دیکە. پەیکەرەیەکی کۆتایی سەدەی یەکەمی بووداو دوو هاورییەکەی بووداسەف، لەگەلّ کەتیبەیەك کە باسی بەخشینی نیکوکردی خود دەکات بە کەسێکی دیکە، لەوانەیە کۆنترین بەلگەی ئاشکرای بەدەستهاتوو بن کە نیشاندەری بیرۆکەکانی مەهایانەیە[25]. واپێدەچێت کاریگەرییەکانی یونانیو ئێرانی سەردەمی کووشانی شکلیان بە پەیکەرەکانی مەهایانە (و لەوانەیە بیرۆکەکەشی) دابێت. بەناوبانگترین تمپالی بوودا لە هونەری کووشانیدا مەیتریە[١] یان ((بوودای داهاتوو))یە کە پێدەچێ هەندێ لە تایبەتمەندییەکانی رزگارناسیو پەسلاننناسی ئەو کاردانەوەی سۆشیانتی[٢] زەردەشتیو ماشەیح (مەسیحای) یەهودیو مەسیحای مەسیحییە. لە هاوتەرییبیەکی بەرجەستەی تایبەتدا، لە ئۆستورەناسی بووزیدا، فێرخوازێك بەناوی کاشیپە[٣] بەخێرهاتنی مەیتریە دەکاتو ناوی رووخسارێکی هاوشێوە لە ئایینی زەردەشت دا بەناوی کەرەشەسپە[٤] کە چاوەروانی سۆشیانتە[26].

---

[1]. Maitrya
[2]. Saoshyant
[3]. Kashypa
[4]. Karashaspa : یان گەرشاسب. و.

دواتر، لە مانەویەتدا مەیتریە لەگەڵ میترا، خودای ئێرانی، و لەگەڵ عیسی یەك دەگرنەوە. بوودا ئامیتابهە[1] وبووداسەف ئەڤەلۆکیتێشڤارا[2] کە بە شێوەیەکی بەرجستە لە تجلیاتی دواییی چینیو ژاپۆنی بوودیزمدا وەردەکەون، کۆمەڵێك تایبەتمەندییان هەیە کە پێوەندییان لەگەڵ خوداکانی ئێرانی زورڤان[3] و میترا هەبووە. پێدەچێ لە هەندێ باردا ئامیتابە (بەواتای((دەروشانەوەی بێ کۆتایی))) بەهەمان خودای ئێرانی ئاڤێستایی، یەکسان لەگەڵ خۆر، دادەنێن[27].

گۆیا چیرۆکەکانی ژیانی بوودا هەڵگری تووخمی یەهودیو مەسیحین[28]. تەنانەت ئەسپی ترۆجان[4] لە چیرۆکێکی بووزیی هیندیدا دەردەکەوێ ـ هەڵبەتە فیلێکی دارین جێگەی ئەسپەکەی گرتۆتەوەو بە پێچەوانەی خەڵکی تروا، بووداسەفی گەمارۆ دراو، هەڵنافریوێت[29].لەوانەیە هەمووی ئەمانە هەوڵە هاوبەشەکانی مزگێنیدەرانی بووزیی هیندی نیشان دەدات کە لە ڕێگەی نەخشەکانەوە کۆمەڵێك چەمكو سەمبۆل دوخونو روو کە بۆ مخاگبەکانی یونانی ئێرانی رۆژئاوا ناسراون.

سەرچاوەیەکی بووزی چینی سەدەی سێیەم دەڵێ کە سەرزەوییەکانی کووشانی یەکێك لە ناوەندە گرنگەکانی بوودیزم بوون[30]. لەوانەیە کووشانییەکان نووسراوەکانی بووزیان وەرگێرابێتە سەر زمانی خۆیانو پاشان لەبەر نوێئاینەکانی ئاسیای ناوەڕاست ئەم نووسراوانەیان کردبێتەوە سەغدیی. بەڵام ئەم وەرگێراوانە هیچیان لێی نەماوەتەوە. ئەو وەرگێراوە سەغدییانە کە ئێستا لەبەردەستن دواترو لەرووی نوسراوە چینییەکان نووسراوەتەوە نەك هیندییەکان.

---

[1]. Amitabha
[2]. Avalokiteshvara
[3]. Zurvan
[4]. Trojan

لە سەردەمی کووشانی، ڕەببانێك بەناوی سۆترە لانکا[1]، کە خەڵکی پۆسکرەڤتی[2] (چەرسەدەی[3] ئێستا، نزیك پیشاوەر)ی پێتەختی کووشانییەکان بوو، سەفەری کردە شاش/چاچ (تاشکەندی ئێستا) لە ئاسیای ناوراستدا کە ڤیهارەیەك لەوێ برازینێتەوە[31]، ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ هەبوونی کۆمەڵەیەکی بووزیی میواندار لەو بەشەی ئاسیای ناوەڕاستی ئەو سەردەمە.

بەلآم پێناچێت سەغد هەرگیز ئەزموونی گرۆییەکی بەرفراوانی هەبووبێت. سیۆئان زانگ کە لە سەدەی حەوتەم سەردانی سەمەرقەندی دەکرد لەوەی کە دەێدیت نوێنورانی ئیمان(بووزیی) چەندە ژمارەیان کەمە، دڵسارد ببوو، و بووزییەکی کۆریی کە چەند دەیەی دواتر لەوێ تێدەپەری تەنیا ڕەببانێکی بووزیی بینی کە بەتاقی تەنیا لەناو دیرێکدا دەژیا[32]. واپێدەچێ کە کۆمەڵێك گرووپی بچووکی نوێئایینەکانی سەغدی کە پەیوەندییان بە پراکنش کۆمەڵەکانی بازرگانەکانەوە هەبوو لەوانەیە ئایینی بووزییان لە ڕێگەی ئاوریشمدا بۆ دوورترین شوێنەکانی ڕۆژهەلآت بردبێت. لێرە لەگەڵ گاڵتەیەکی ئاشکرا بەرەو ڕوو دەبینەوە، بەو واتایە کە سەغدییەکان لە ریزی یەکەمین هۆکارە سەرەکییەکانی پەرەسەندنی ئایینی بووزیی بوون بەرەو ڕۆژهەلآت بەلآم ئەم ئایینە هەرگیز لە دیاری سەرەکی ئەواندا ڕەگی دانەکووتا.

پارتییەکانی ئێرانی (واتە ئەشکانییەکان) کووشانییەکانی باکوور ڕۆژئاوای هیندو ڕۆژئاوای ئاسیای ناوەڕاستیان وەدەرناو ئەمەش لە کۆتاییەکانی سەدەی یەکەم دەستی پێکردبوو. هەتا سەدەی پێنجەم ژمارەیەکی زۆری سەرزەوییەکانی پێشووی کووشانییەکان گۆرەپانی ڕمبازێنو تالآنکردنی سوپای ڕەوەندەکان، لە ستێپسەکانەوە تاکوو باکوور، بوو. ئەمانە بە

[1]. Sutra lanka
[2]. Puskaravati
[3]. Charsadda

هەفتالییەکان[1] یان هۆنە سپییەکان ناسراون. هەفتالییەکان دیرەکانی بووزییان تالآنکردو هەدمەیەکی قوورسیان لە فەرهەنگی بووزییدا لە ڕۆژئاوای ئاسیای ناوەڕاست. ئەوان نەیانتوانی خودی ئایینەکە لەناو ببەن، چونکە خەڵك هەروەك جاران درێژەیان بە ڕێوشوێنی ئایینی خۆیاندا، بەلآم بە تالآنکردنی دیرەکانو وێرانکردنی ئەو دیارە ژێرخانی داراییان لەناو برد کە یارمەتی گەشەکردنیی دەدا.

## بوودیزمی ئەشکانی

بنەماڵەیەکی ئێرانی بەناوی پارتییەکان/ ئەشکانییەکان لە سەرەتای سەدەی دووهەمی پ.ز دا سلوکییەکانی یونانییان هەڵچنی. ئەشکانییەکان بوون بە ناوبژیکەرانی نوێی ڕێگەی ئاوریشمو بازرگانی برییان لە چینەوە بەدەستەوە گرت کاتێك کە ڕومییەکان ببوون بە خوازیارانی تامەزرۆی کرینی ئاوریشم.

شاری مەڕو (یو. مەرگیانیا) لە ڕێگەی ئاوریشمدا، هەڵکەوتوو لە بەشی ڕۆژهەلآتی ئیمپراتۆری ئەشکانیی، هەتا ناوەڕاستەکانی سەدەی دووهەمی زایینیی بوو بە ناوەندی گرنگی بووزیی[33]. کۆمەڵێك زانا حەز ناکەن گرنگی ئاینیی بووزیی ئێرانی لەم ڕێکەوتە دەستپێکەدا پشت ڕاست بکەنەوە[34]. وادیارە هۆیەکەی نەناسینی بەڵگەکانی باستانشناختییە کە لە توێژینەوەکانی زانایانی سەرەتای دەیەی ١٩٦٠ تورکمنستانی سۆڤییەت بەدەست هاتووە[35].

---

[1] . لە زمانی فارسیدا ئەم ناوە بە شێوەی جۆراوجۆر هاتووە: هبطالیا، هفتالیان، هیتالیان، هیاطلة. نابێ هۆنە سپییەکان لەگەڵ خیونەکان یان هۆنەکان کە ئاتیلای بەناوبانگ سەرداریان بوو، تێکەڵ بکرێ. چینییەکان بەم هۆنانە دەڵێن سیۆنگ نۆ. و.

ڕێکەوتی ئەو نووسراوەکانی کروشتی/ خروشتیی[1] هیندی کە لە دوورەدەستەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوچەی جەیحون دۆزراونەتەوە، دەگەڕێنەوە بۆ (٥٨ پ.ز - ١٢٩ز)، ئەمەش ئاماژە دەکات بە نیشتەجێبوونی مەهاسەنگیکەکان لەو شوێنە[36] کەتیبەکانی دواتر کە لە دۆڵی جەیحون دۆزراونەتەوە دەگەڕێنەوە سەدەکانی چوارەمو پێنجەم کە بە خەتێکی تری هیندی، واتە برەهمی[2]، نووسراون. ئەمانە لەگەڵ نووسراوەکانی سەدەی پێنجەمی سەرڤاستیڤادین لە مەرو نیشاندەری ئەوەن کە ئەم قوتابخانە لە ئاکامدا لە ڕۆژئاوای ئاسیای ناوەڕاست دەسەڵاتی گرتە دەست، هەرچەند لەگەڵ دەرمەگۆپتەکەکان هاوژین بوون[37].

وێنایەکی کە لە بوودیزمی گەندهاریو پارتی دەکێشرێتەوە لە ڕووی دەستکەوتەکانی باستانشناختیی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی قوتابخانە جۆراوجۆرەکانی نیکایەیە. بەڵام لێرەدا بەرەو ڕووی کێشەیەکی مێژوویی دەبینەوە، بەم واتایەکە یادی کۆمەڵێك بوودیی ئەشکانی دەکرێ کە چوونە چینو لەوێ نووسراوەکانی مەهایانەیان وەرگێڕاوە. ئەگەر مەهایانەی سەرەتا لە ڕۆژئاوای ئاسیای ناوەڕاست دا هەبۆ، دەبێ بەڵگەیەك بەدەست بێت کە بکرێ دووبارەسازی بکرێتەوە[38]

## ناوچەی تاریم

لەوانەیە مزگێنیدەرانی بوودیی لە سەدەی یەکەم گەیشتبێتنە خۆتەن. ئەم دیارە لە سەرەتای لۆفی باشووری ڕێگەی ئاوریشم، بیابانی تاکلاماکن دەور دەداتەوە، لە ئەفسانەدا هاتووە کە لە سەردەمی پاشایەتی ئاشوکا دا ڕەببانێکی کەشمیری گەیشتە ئەو شوێنە. دانیشتوانی خۆتەن لە هۆزەکانی

[1] . Kharoshthi
[2] . Brahmi

ئێرانیزمان بوون. خەڵکی کۆچە/کۆچا[1] لە باکوور بیابان، هیندوئەورووپی بوون، و ئاخاوتنیان بە زمانێك بوو کە لە زۆر ڕووەوە نزیکی سێڵتیك[2] بوو. وێنەو نیگارەکانی بووزیی کە لە سەرەتای ئەم سەدە لە کۆچە دۆزراونەتەوە لە ستایلی گەندهاری وەرگیراون‌و ئەمەش دەرخەری پێوەندی نزیکە لە نێوان ناوچەکانی ئەو سەردەمە. پێستی سپییان بە ڕوونی نیشاندەری ئەوەیە کە قەوقازین[3]، زۆربەشیان چاوشینن. لە بەشی دوورتری ڕۆژهەلاّت لە میران[4] بەرهەمی وێنەکێشێکی بووزیی بەناوی تیتا[5] (تیتۆس؟[6]) دۆزراوەتەوە، لەوانەیە نیگارکێشێکی ڕوومی ببوبێت کە بۆ کارکردن لە ڕێگەی ئاورێشمدا بەرەو ڕۆژهەلاّت سەفەری کردبێ.

گۆیا سەرچاوەی سەرەکی نفوزی بووزیی بۆ خۆتەن لە سەدەکانی سەرتای چاخی مەسیحی، کەشمیر بووە، کە لەو سەردەمەدا ناوچەیەکی ژێردەستی سەرڤاستیڤادە بووە. پاشاکانی خۆتەن ڕۆڵێکی گرنگیان لە پشتگیری قوتابخانەکانی بووزیی لەئەستو بووەو سەرەتا سەرڤاستیڤادینەکان‌و مەهاسەنگیکەکان بوون‌و پاشان هەتاکوو سەدەی چوارەم، مەهایانە بوو کە لەو شوێنە بالاّدەست بوو. دیسان دواتر، لە سەدەی حەوتەم، هەبوونی قوتابخانەکانی تەنتریك[7] لەوێ دەبینرێ[39].

لەم ناوەدا، سەرڤاستیڤادینەکان لە کۆچە مانەوەو قوتابخانەی پەسەندکراو بوون، و کاتێك سیوئان زانگ لە سەدەی حەوتەم چاوی بەوێ کەوت، تێگەیشت کە ڕەببانەکانی خوجێیی گاڵتە بە نووسراوەکانی مەهایانە دەکەن. دەکرێ

[1]. Kucha
[2]. Celtic
[3]. Europoid
[4]. Miran
[5]. Tita
[6]. Titus
[7]. Tantric

پرسیار بکرێ بۆچی پاشاکانی ئەم شارـ حکومەتەکانی خەمرکیی لە ناوچەی تاریم، بەخێرهاتنی ڕەببانەکانی بووزیی هیندییان دەکردو تەنانەت داوای یارمەتیشیان لێ دەکردن. هەرچەند نابێ هۆکارە واتاییەکان بەهەند وەرنەگیرێن بەڵام بێگوومان لەوانەیە پاشاکانیش ئەمەیان وەك ڕێگەیەکی هاندانی تماس لەگەڵ شارستانییەتێکی گەورەترو پێشکەوتووتر بینیبێت. وەك بینیومانە، ئالووگۆڕی فەرهەنگی بۆ ئالوێری بازرگانی باشەو ئەمەشیان بۆ ئەوەی تریان باشە.

## گەیشتنی بوودیزم بە چین

لە نیوەی یەکەمی سەدەی یەکەمی پ.ز، سلسلەی هەنی چینی توانی تا ڕادەیەکی زۆر دەسەڵاتەکەی ڕووبە ڕۆژئاوا بگەیەنێتە ئاسیای ناوەڕاستو پەرەی پێ بدات. بیانووی ئەم پەرەپێدانە بەرەو ڕۆژئاوایان بە یەکێك لە ئارەزووەکانی خاقانی هەن زانیوە بۆ بەدەستهێنانی "ئەسپەکانی ئاسمانی". هەرکە چینییەکان دەستیان بەسەر نیوەی ڕۆژهەڵاتی ڕێگەی ئاوریشمدا گرت، بازرگانەکانی ڕۆژئاوای ڕێگەکەو ڕێبوارەکانی دیکەش زیاتر لە جاران دەستیان بە چین ڕادەگەیشت. بەم شێوە پێدەچێ کە بووزییە بیگانەکانیش سەردەمێك بەر لە سەردەمی مەسیحی چووبێتنە چین.

یەکەمین باسێکی ئاشکرا دەربارەی ئایینی بووزیی کە لە سەرچاوەیەك دا هاتووە، لە هۆهەن شۆ[1] دا(مێژووی هەنی دوایین) ئاماژەیەکە بە کۆمەڵەی بووزیی لە درباری ڕاژۆری ناوچەی چۆ[2] کە چەند شوێنکەوتەی چینی تێدا بوو. بەم شێوە وصفی ڕاژۆر دەکەن کە هەردووك ئایینی بووزییودائویی بەجێ دێنا، و ئەمەش نیشان دەدات کە هەر لە سەرەتای دزەکردنی بوودیزم بۆ ناو

[1] .Hou Han Shu
[2] . Ch'u

فەرهەنگی چینی لەگەڵ ئایینی خۆجێیی ئاوێتە بووەو خۆی لەگەڵدا گونجاند بوو[40]. کاتێك ڕاژۆر خەلاتێکی ئاوریشمی بە نیشانەی گوێرایەڵی بۆ مینگی[١] خاقانی هەن هەنارد، خاقان لە وەلامدا ووتی ﴿پاشا چۆ گووتە وشیارانە هۆئانگ لائۆ (ڕێبازێکی دائۆیی) دەگێڕێتەوە، و بەرێزەو قوربانی شریف بوو بوودا ئەنجام دەدات... تاکوو (ئاوریشمێك کە بۆ رزگاربوون) ناردۆیەتی بگەرێنرێتەوە تاکوو یارمەتیدەرێك بێ بۆ خۆراکپێدانی جوامێرانەی ئۆپساکاکان[٢] و شەرمەنەکان[٣]. [41]﴾ ئەم ڕاستییە کە خاقان ئەم دوو زاراوە هیندیە بەکاردێنێت، بەواتای ((پیشنشینان)) و ڕەببانەکانی (بووزیی) ئەوە دەگەیەنێت کە پێشتر ئاشنایی دەربارەی بوودیزم هەبووە. کەواتە، دەبێ ئەم ئایینە هەتا ئەو کاتە لە چیندا بنەی داکووتابێت.

بەپێی ئەفسانەیەکی بووزیی هەر لە هەمان ساڵدا خاقان مینگ خەون بە ((پیاوێکی زرینەوە)) دەبینێ و ووتی لە خەونی بە بووداوە بینیوە، هەربۆیە داوای مزگێنیدەری بووزیی لە هیندەوە کرد.

یەکەمین مزگێنیدەری بووزیی کە لە سەرچاوەکانی چینیدا ناوی هاتووە، ڕەببانێکی ئەشکانییە کە ساڵی ١٤٦ گەیشتە لوویانگی[٤] پێتەختی چین. بە زمانی چینیی پێی دەووترێ شی گائۆو لەوانەیە یەکەم کەسێك بێ کە بە شێوەیەکی ڕێکخراو نووسراوە وەرگێردراوەکانی بووزیی ((لەم بارەدا، نیکایە)) زمانی چینی ڕێك دەخات. هەروەها لەوانەیە لە ڕیزی یەکەمین مامۆستایانی سیستێمی ڕاهێنانە دەروونییەکان بێ لە چین کە لە سانسکریتدا بە دیانە[٥]

[1] . Ming
[2] . Upsaka
[3] . Sramana
[4] . Lo-yang
[5] . Dhyana

(چی. چەن[1]، ژا. زێن[2]) ناسراوەو هاوتەریب لەگەڵ مۆدێلی کۆنی حەزی دربار بۆ گالع بینی ، یاد لە زانستی ئەو دەکەن لە ئەستێرەناسی ڕۆژئاواییدا.

بووزییەکی ئەشکانی تر، بازرگانێکی گەرۆکە بەناوی سیوئان کە لە ساڵی ١٨١ گەیشتە چین‌و چووە ناو گرۆپیی وەرگێرانی ئان شی گائۆ. زیاتر بەوە ناسرابوو کە لە وەرگێرانی نووسراوێکی مەهایانە، بەناوی ئۆگرە - پەریپریچە[3] (چی. فاجینگ جینگ[4]) بەشدار بووە. گۆیا لەم ڕێکەوتە دەستپێکەوە، مەهایانەو قوتابخانەکانی نیکایە لە لوویانگدا هاوژین بوونە.

بەگشتی مەهایانەی سەرتا لە چین زیاتر لەگەڵ هەوڵەکانی وەرگێڕێکی کووشانی بەناوی لوکەکشیمە[5] هاوتەریبە کە لە کۆتایی دەیەکانی سەدەی دووهەم لە لویانگ چالاك بوو. یازدە نووسراوەی مەهایانە، کە بەناوبانگترین نووسراوە کۆنەکانن، وەرگێردراوەی چینین کە لەوانەیە زۆربەیان کاری لوکەکشیمەو شاگردەکانی بێت[42]. دوو لە سێ کەسی یارمەتیدەرە چینییەکانی ئەو ئەندامانی فرقەیەکی دائۆیی خۆجێیی بوون. ئەم ڕاستییە بەڵگەیەکی ترە بۆ سەلماندنی چالاکبوونی پرۆسەی پێگەیاندن[43] (ئایینی بووزیی‌و ئایینی دائو. م.)

گرووپی وەرگێرە یارمەتیدەرەکانی لوکەکیشمە چەند کەسی هیندی‌و سەغدیش لەخۆ دەگرێت. پێدەچێ ئەو کەسانەی کە پیشاوندی ئەشکانی ئەن لەپێش ناوەکانیانەوە هاتووە، وەك ئەن فاسیان[6] و ئەن فاچین[7] لە سەدەی

1 . Ch'an
2 . Zen
3 . Ugra-paripriccha
4 . Fa-ching ching
5 . Lokaksema
6 . An Fa-hsien
7 . An Fa-Ch'in

سێهەم، لە ماوراءالنهرەوە هاتبێتن کە هەتاکوو سەدەی پێنجەم لەو شوێنە پاشماوەی حکومەتی ئەشکانی هەر مابوو. (ساسانییەکان بەشی ڕۆژئاوای پاشایەتی ئەشکانییان لە ساڵی ٢٢٦ داگیر کردبوو[44].)

شاری خەمرکیی کۆچە لە لووتکەی باکووری ڕێگەی ئاوریشم ناوەندێکی تری بووزیی بوو کە مزگێنیدەران لەوێوە بۆ چین سەفەریان دەکرد. ڕەببانێکی کۆچەیی کە لەگەڵ نیاکانی هیندی تێکەڵاو، بەناوی کۆمارەجیڤە[1] (لەدایکبووی ٣٤٤)، یەکەم وەرگێڕی نووسراوەکانی مەهایانە بوو بۆ سەر زمانی چینی. هەرچەند کۆچە بۆخۆی زۆر بەتووندی سەرڤاستیڤادین بوو، بەڵام کۆمارەجیڤە لە قۆناغی گەنجی لە کەشمیر بەرهەمەکانی مەهایانەی خوێندبووەوەو پاش گەڕانەوەی بۆ کۆچە ببوو بە شارحی ئاراستەیەکی مەهایانە. ساڵی ٤٠٢ بەزۆر بردیانە لوویانگی پێتەختی چین‌و تا کاتی مردنی لە ساڵی (٤١٢ یان ٤١٥) لەوێ نیشتەجێ بوو. نزیکەی ٣٠٠ نووسراوە وەرگێڕاوەکانی بووزیی بە زمانی چینیی لە بەرهەمەکانی ئەو دەزانن[45].

کۆمەڵێك لە زانایان گوومانیان لە ڕۆڵی ئێرانییەکان کردووە بۆ دزەکردنی سەرەتایی بوودیزم بۆ ئاسیای ڕۆژهەڵات، و جەخت لەسەر گوازرانەوەی ڕاستەوخۆتری ئەم ئایینە دەکەن لە وڵاتی هیندەوە بۆ چین، واتە بەرەو باکوور لە شاخەکانی قەراقوروم بۆ کاشغەرو ناوچەی تاریم‌و لەوێشەوە دووبارە بۆ ناوچەکانی ایرانی نشینی ڕۆژئاوای ئاسیای ناوەڕاست[46]. بەڵام لەوانەیە لەم بارەوەدا زێدەبێژی کرابێ. فراوانی پاشماوەکانی بووزیی لە ناوچەی مەرو کە مێژووکەی دەگەڕێتەوە سەرەتای سەدەی یەکەمی زایینی‌و هەروەها بەڵگەکانی زبانشناختی کە نیشاندەری پێگەیشتوویی چەمکەکانی بووزییە لە ڕێگەی پارتییەوە ئەوە ئاشکرا دەکات کە بوودیزم سەرەتا بەرەو باکووری ڕۆژئاوا لە

[1] . Kumarajiva

دەرەوەی نیمچەدوورگە بۆ جیهانی ئێرانیو پاشان بەرەو ڕۆژهەلآت لە ڕێگەی ئاوریشمدا بۆ چین سەفەری کردووە[47].

ئەمە ڕێگری کەمتاکورتی هاوچەرخی ئەو لە ڕێگەی جادەی قەراقورووم بۆ ناوچەی تاریمو لەوێوە بۆ چین نییە. (هەروەك بینیومانە، خۆتەن بەتایبەتی پێوەندی راستەوخۆی لەگەڵ کەشمیر هەبوو.) و لە کاتێکەوە کە حچوری بووزییەکان لە چیندا جێگای خۆی گرت، ڕێگەی ئاوریشم کەناڵێکی سروشتی بوو کە کاریگەرییەکانی بووزیی چینی دواتر دەیتوانی لەو ڕێگەوە لە ئاسیای ناوەڕاست دووبارە ڕێگەی ڕۆژئاوا بگرێتەوە بەر.

هەبوونی وەرگێردراوەکانی سەغدیی نووسراوەکانی چینیی مەهایانە کە کاری بازرگانەکانی سەغدیی چین بوو و فێری زمانی چینی ببوون ئەوە دەگەیەنێت کە وەها گوازتنەوەیەکی دووبارە بەرەو ڕۆژئاوا جاروبار لەئارادا بووە[48]. لەراتیدا دیارە کە بیرۆکەی وەرگێرانی نووسراوەکانی بووزیی بۆ زمانەکانی خۆجێیی لە چینییەکانەوە بە وەرگێرەکانی ئاسیای ناوەڕاست گەیشتووە، بەرلە سەدەی شەشەم، کە نووسراوەکانی بووزیی ئاسیای ناوەڕاست وەرگێردراون، وا دیارە ئەم خەڵکە نووسراوەکانیان تەنیا بەزمانی هیندی خوێندۆتەوە[49].

لە سەدەی حەوتەم سیۆئان زانگ بەلایەنی کەمەوە بۆخۆی نووسراوێکی چینی بەرساختەی بە هیند ناساند، چونکە تێگەیشت کە رەببانەکانی نالەندە[١]، کە یەکێك لە زانکۆ گەورەکانی بووزیی بوو ، *بەخەبەری ئیمان لە مەهایانە*

[1]. Nalanda

ناناسن، هەربۆیە دووبارە ئەم نووسراوە بزربووەی وەرگێڕاوە سەر زمانی ((سانسکریت)) [1] 50.

لەراستیدا ئەگەر سەغدییەکانو خەڵکانی تری ئاسیای باختری لەژێر کاریگەری چینییەکان دەستیان بە وەرگێڕانی نووسراوە پیرۆزەکان کردبێ، لەوانەیە ئەمە نمونەیەك بێت کە ((رامیاری زمان)) چۆن دەتوانی لە سەرکەوتنی ئاینێکدا رۆڵێکی گرنگ بگێرێت. هەتا ئەگەینە چین یەکەم بەڵگەمان دەست ناکەوێ بۆ سەڵماندنی گرۆیبوونی گروپێك بۆ بوودیزم لە رێگەی ئاوریشم، و بەراستی ئەگەر بووزییەکانی سەرەتای سەغدیی نووسراوە پیرۆزەکانیان وەرنەگێرابێتە سەر زمانی خۆجێیی خۆیان، خۆیلەخۆیدا بەڵگەیەکە کە بۆچی گرۆیبوونە گەورەکان بۆ بوودیزم لە سەرزەویی سەرەکی سەغدیی رووی نەدا.

هۆکارەکانی رامیاریش لە پەرەسەندنی بوودیزم لە چین کاریگەریان هەبوو. لە ماوەی سەرکردایەتی سلسلەی تانگ، لە (٦١٨ـ٩١٧)، چەند خاقانێك حەزێکی ئاشکرایان نیشان دەدا بەرامبەر هەر شتێکی بێگانەو سەیر. لەو سەردەمانەدا لە چین بەشێوەیەکی نائاسایی پێشوازیان لە رۆژئاواییەکانو دابونەریتو ئەندێشکانی رۆژئاوایی دەکرا. سەرکەتنەکانی نیزامی تانگ رێگخۆشکەر بوون بۆ دزەکردنی فەرهەنگو شارستانییەتی بەرەو رۆژئاوا. لە گەورەترین خاڵی جهانگشایی تانگ لە سەدەی هەشتەم، رێگەی ئاوریشم هەتاکوو قێرقیزێستانی ئیستا لەژێر فەرمانی چینییەکاندا بوو. وەك هەر شوێنێکی تر پادگانشهری زۆریان لەوێ دروست کرد، وێرانەکانی پەرستگەیەکی

---

[1] . ئەم نووسراوە هەر بەم قەڵەمە کراوەتە فارسی. ع. پاشایی، بیداری ایمان در مهایانە، تهران ١٣٨٢: نگاه معاصر. بۆ ئەم مەبەستە بروانە پێشەکی ئەم پەرتووکە. مەبەست لە (بەرساختە) یان مجعول، لێرەدا ئامازەیە بەهەمان نووسراوی سەنسکریتکراوی سیوئان زانگ. و.

سەدەی هەشتەم لە ئاق بێشیم[1] ئاماژەیەکە بە پەرەسەندنی بوودیزمی چینیی بەرەو رۆژئاوا.

## بزووتنەوەکانی متاخری بووزیی

### دیارپاك

لە لێکدانەوەی مەهایانەدا، بیرۆکەی سەرەتایی ((دیار بوودا)) یان بەهەشتێك کە پەیرەوەکانی بوودای تێدا باو بێت، پانتاییەکی بەفراوان دەگرێتەوە. مەبەست ئەوە بوو کە بوداسەفەکان پاکیو پیرۆزی بەو دیارانە دەبەخشن کە تێدا نیشتەجێن. وصفی یەکێك لەم هەرێمە پاکانە، بەناوی سوکاڤاتی[2] یان (دیاری خوشدلی) (لەوانەیە ئەم خاڵە گرنگ بێ کە ئەم دیارە کەوتۆتە رۆژئاوا)، لە سێ متندا هاتووە، کە دوو لەم متنانە دەگەڕێتەوە کۆتایی سەدەی یەکەم لەباکووری رۆژئاوای هیندو سێهەمیان لە ئاسیای ناوەڕاست کۆکراونەوە.

بوودای روونـاکی یان ئامیتابە سەروەری ئەم دیارە درەوشاوەیە کە پیروانەکەی لە رێگەی نکوکردە پاشەکەوت کراوەکانی بەرەو رزگاری هیدایەت دەکات. خۆشەویستی ئامێتابە دەبێ دڵی لەگەڵ ئەو بکاتە یەك دڵ بەتایبەت لە سەرەمەرگدا تاکو بیردێتە ناو دیارپاکەوە. هەندێ کەس استدلالیان کردووە کە ئەم رزگاری ئاسییە زیاتر لەگەڵ باوەرەکانی رۆژئاوایی ئەو سەردەمە لایەنی هاوبەشیان هەیە وەك لەگەڵ باوەرەکانی هێندی، بەتایبەت بیرۆکەکانی ئێرانی رۆڵیان لە شکل پێدانی نەریتی دیارپاك هەبووە.

---

[1]. Aq Beshim
[2]. Sukhavati

بزووتنەوەی دیارپاك لە رێگەی ئاوریشم هەتا چین‌و ژاپۆن پەرەدەستێنی‌و لێرە زۆر گشتگیر دەبیٚ، بەتایبەت لەناو چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگا کە پەیامە سادەکەی بۆیان سەرنجراکێشە. مامۆستایانی دیارپاك لە وەلامی ئەو کەسانەی کە رەخنەیان لە وەها شێوەیەکی "ئاسان"ی رزگاری دەگرت، دەیانووت هەرچەند لە رابردوو خەڵکێکی زۆر دەیانتوانی رێگەیەکی دژوار تر بگرنەبەر بەڵام لە تاریکی سەردەمی ئیستادا بیانوو و دستاویزێکی ئاسانتر پێویستە.

## تەنترە[1]

تەنتریزم[2] حدودی سەدەی پێنجەم یان شەشەمی ز وەك بزوتنەوەیەك لە هیندی رۆژهەلات دەستی پێکرد. تێیدا کۆمەڵێك رێوەرسم وەك ژکرو خوێندنی دوعا، بەناوی مەنترە[3]و سوتاندنی قوربانییە پێشکەش کراوەکانیان لەگەڵ یوگا[4] تێکەلاو دەکرد. هەموو ئەم اعمالە لە ئایینی برەهمەنی[5] دا کۆمەڵێك پێشینەیان هەبوو بەڵام ئێستا لە بوارێکی بووزییدا بەکاردەهێنران. تەنتریزم سەرەتا بە نهێنی‌و پشتاوپشت لە پیرانی تەریقەتەوە بە مرید دەسپێردرا.

سەرەتای سەدەی هەشتەم رەببانەکانی هیندی وەك سۆبەرکارە سیمهە[6]، ڤەجرەبوودی[7]و ئاموگەڤەجرە[8]، تەنترەیان بۆ چین گوازتەوە. ئەم پەیرەوە لە دربار هەندێك لایەنگری پەیداکرد، بەڵام لەناو خەڵکدا نەیتوانی لەگەڵ هەندێ فرقە وەك دیارپاك رکابەری بکات‌و هەرکە بانگهێشتکەرەکانی هیندیی چیتر لەو

[1] . Tantra
[2] .Tantarism
[3] . Mantra
[4] . Yoga
[5]. Yoga
[6] . Subharkara Simha
[7] . Vajrabodhi
[8] . Amoghavajra

شوێنە نەمان، تەنتریزم نەیتوانی لە ئیمپیراتوری تانگدا درێژە پەیدا بکات[52].
بەپێچەوانەوە، تەبەت بەتایبەتی نیشانی دا کە وەرگری تەنتریزمەو لە سەرەتای سەدەی هەشتەمەوە ئەم ئاینە لەو وولاتەدا بوو بە وێنەی بالآدەستی بوودیزم.

## چەن[١]

ئەفسانەیەك دەڵێ لە سەدەی شەشەمدا رەببانێکی بوزیی بەناوی بوودیدهارمە[٢]، کە خەڵکی باشووری هیند (یان لەوانە ئێرانی) بوو، بۆ چین سەفەری کرد تا پەیڕەوێکی نوێ بێنێت، کە ئەمە بوو: لە کۆتاییدا ئاینەکان، نووسراوەکانو اعمال متعارفی بووزییەکان کارێکی بێهۆدەیە. لە جیاتی نموونەی لەخەوڕابونیی خودجوشی[٣] هێنا کە لە رێگەی دیانە یان مێدیتێشن لە کۆمەڵێك پارادۆکس بەناوی گۆنگ ئان[٤] (ژا. کوان[٥]) بەرهەم دێت. ئەم ئاراستەیە کە بە چەن (لە دیانەی[٦] سانسکریت، بەواتای مێدیتێشن[٧]) ناسرابوو، نیشاندەری کاریگەری زۆری دائۆییزمە[٨]و بەم شێوە نمونەیەکی تایبەتی فەرهەنگی چینییە کە بیرۆکەکانی هیندی دەگۆڕێ بۆ بیروکەکانی چینی.ئەم نەریتە لە ژاپۆن بە زێن ناسراو بنەمایەکی پیتۆلی بۆ هونەرە جۆراوجۆرەکان

---

1 . Ch'an
2 . Bodhidharma
3 . Spontaneous enlightenment
4 . Kung-an
5 . Koan
6 . Dhyana
7 . لە فارسیدا هەندێجار پێی دەووترێ "مراقبە" کە لە چەمکەکانی سۆفیگەرییەو تەنیا لە ڕواڵەتدا کەمێك لە بوودایی دیانەوە نزیکە. و.
8 . Taoism

ڕەخساند وەك شمشێرزنی ساموراییەکان[1]، هەڵبەستی هایکۆ[2] و منقرەسازی ئاوی ئاوێتەیی[3].

## زیارەتکەرەکانی بووزیی

هەمانگور کە ژمارەی نوێئاییینەکانی خۆجێیی بوودیزم لە چین ڕۆژ لەدوایڕۆژ زیادی دەکرد، بەرەبەرە زۆربەی بووزییەکانی چین لەوە نارازی بوون کە ئایینەکەیان لە ناوبژیکەرکانی بێگانەو لە ڕووی نووسراوە وەرگێڕاوەکانی دەستی سێهەمی وەرگێڕەکانی ئاسیای ناوەڕاست فێربن. لەراستیدا پێدەچێ بانگهێشتکەرەکانو وەرگێڕەکان هەوڵیان دەدا کە چەمکەکانی بووزیی بەدڵی چینییەکان بکەنو زۆرجار لە وەرگێڕانی چەمکە کلیلییەکانو ڕێکخستنی چەمکە هیندییەکان لەگەڵ چەمکەکانی چینیی زۆر ئازادانە ڕەفتاریان دەکرد.

بۆ نموونە هەندێجار زاراوەی هیندی دەهارمە[4] (پەیرەوی بووزیی)، بووزیی (لەخەوڕابوون)و یوگایان لە زمانی چینیدا بە دائۆ[5] (((ڕێگە))) وەردەگێڕا کە چەمکێکی دائۆییو کنفۆسیۆسی بوو و هەرکامیان پێشتر بە بەڵگەی بەهێزی تایبەت بەخۆیان ڕازاوە بوون. هەروەها چەمکی ئارهەت کە بە چێن ڕێن[6] یان ((پیاوی ڕاستەقینە)) وەریان گێڕابوو، کە لە دائۆییزمدا سەمبۆلی کەسێکە کە لە فنون نەمریدا شارەزایە. نیروانەی نەگووتەنییان یان بەوتۆ ـ ووی[7] ﴿"بێ هێز" یان (بێ پەرچدانەوە)﴾ وەرگێڕا بوو کە چەمکێکی دائۆییە بۆ ڕەوشتی

[1]. Samurai
[2]. Haiku
[3]. کە بە سۆمی ـ ئە Sumi-e ناسراوە. و.
[4]. Dharma
[5]. Tao
[6] Chen-ren
[7]. Wu-wei

رەزامەندی[1]. [53] عباراتی ئاسایی هاوواتای نوێیان پەیدا کرد، بۆ نموونە ((مێرد ژنەکەی تأمین دەکات)) لە چینییدا بوو بە ((مێرد ژنەکەی کۆنترۆل دەکات.))

نزیکی سالی (٢٦٠ ز) بەرەبەرە زیارەتکەرەکانی بووزیی بەرەو هیند وەرێکەوتن هەتاکوو بۆخۆیان سەرچاوەی ئیمانەکەیان بدۆزنەوە. لە سەرچاوەکانی چینییدا ناوی پەنجاوچوار کەس لەم زیارەتکەرانە هاتووە، هەرچەند لەوانە ژمارەیەکی تریش هەبوون کە بێناوونیشان ماونەتەوە. بەلاّم ئارەزووی ئەم رەبیانانە کە دەیانویست بەشێوەی دەستی یەکەم ئەزموونیان دەربارەی هیند هەبێ زۆر سەرەکییتر بوو لە ئارەزووی بەدەستهێنانی سەرەکی نووسراوەکان. هەروەها حەزیان دەکرد بۆخۆیان ئەو چاویان بەو شوێنانە بکەوێت کە پێوەندی بە ژیانی مێژوویی بووداوە هەبوو. وانگهی ئاواتەخواز بوون کە مامۆستایانی بڕوا پێکراوی بووزییزم بدۆزنەوە چونکە هەندێجار گوومانیان لە دروست بیرکردنەوەی شارحانی بووزیی چین هەبوو. زۆربەی زیارتکەرەکان کۆمەڵێك پاشماوە وەك ددان یان ئێسقانیان لەگەڵ خۆیان گەراندەوە دیاری خۆیان بەو باوەرەی کە هی خودی بوودایە.

یەکێك لە بەناوبانگترین رێبوارەکانی ئەم رێگەیە فاسیان[2] بوو کە لە سەرەتای سەدەی پێنجەم دەژیا. فاسیان لە شوێنی لەدایکبوونی واتە چانگ ئان[3] (سیانی[4] ئێستا) بەرەو رۆژئاوا بۆ دۆن هوئانگ[5]، پاشان لە رێگەی تۆرفان/طرفان[6]، قەرەشارو خۆتەن بەرەوە باشوور لە قەراقوروم بۆ دۆڵی سوئات[7]، شوێنێك کە ئێستا پاکستانی باکوورییە، و لەوێوەش بۆ خودی هیند سەفەری

[1]. یان سلیم و رەزامەندی. و.

[2]. Fa-hsian
[3]. Ch'ang-an
[4]. Xian
[5]. Tun-huang
[6]. Turfan
[7]. Swat

کرد. لە ساڵی ٤٠٥-٤١١ لە هیند ماوەو پاشان لە ڕێگەی دەریاوە گەرایەوە بۆ چین [54].

بووزییەکی چینی بەناوبانگی تر کە سەفەری بۆ هیند کرد سۆنگ یۆن[1] خەڵکی دۆن هوئانگ بوو و لە ساڵی ٥١٨ ڕێگەی گرتەبەر. وەك ئاسیان ڕێگەیەکی گرتەبەر. وەك فاسیان ڕێگەیەکی ڕاستەوخۆ بەڵام لە ڕادەبەدەر دژواری قەراقورومی لە باشووری خۆتەنەوە تاکوو کەشمیر هەڵبژارد. بەپێی ڕاپۆرتەکەی بوونی ئەژدیهایەك لە نزیك زێیەکی کوێستانی ژێر شاخەکانی زۆنگ لینگ[2] مەترسییەکانی ئەم سەفەرە کوێستانییە زیاتر دەکرد. وەها بەناوبانگ بوو کە ئەم ئەژدیهایە ڕێبوارەکانی تووشی هەموو جۆرە بەڵایەك دەکرد وەك زریانی کوێرکەری بەفر، بەڵام بەووتەی سۆنگ یۆن ئەگەر ئەژدیهاکەیان پەرستش کردبا ئەوا کەمتر تووشی کێشە دەبوونەوە [55]. گەشتەکانی فاسیان بوون بە الهام بۆ پیاوێکی گەنج کە بوو بە بەناوبانگترین بووزیی چینی هەموو سەردەمەکان، واتە سیوئان زانگ. لە ساڵی ٦٠٢ لە نزیکی لویانگ لەدایك بوو، لە بنەماڵەیەکی نەریتخوازی کۆنفوسیوسی پەروەردە بوو، بەڵام برا گەورەکەی کەرەبیانێکی بووزیی بوو و بڕوای بە دیارپاك هەبوو کاریگەری زۆری لەسەر دانا. لە تەمەن دوانزە ساڵی لە دیری براکەی وەرگیرا، و لە چێنگ دۆ[3] وچانگ ئان پانزدە ساڵی بۆ خوێندنەوەی پەیڕەوەکانی ئایینە جۆراوجۆرەکانی بووزی تەرخان کرد. لەم ماوەدا لە هەڵەکانی ئاشکرای وەرگێڕاوی نووسراوە کلیلییەکانی چینی زۆر نائومێد بوو. بڕیاری دا بچێتە هیندو چەند نووسراوێك لە گێردراوەکانی سەرەکی سانکرێت بەتایبەتی ئەو نووسراوە لەگەڵ خۆی بێنێتەوە چین کە بۆخۆی دڵی پێوەی بوو. بابەتی ئەو نووسراوە باسی

---

[1] . Sung-yun
[2] . Tsung-ling
[3] . Cheng-tu

قۆناغەکانی کرداری یوگای ئاسەنگە[1] بوو کە نووسراوێکی گرنگی فرقەی بیرمەندی مەهایانەی ناسراو بە یوگاچارە[2] بوو.

سیوئان زانگ، وەك باو بوو، ڕێگەی ئاوریشمی بەرەو ڕرۆژئاوا گرتەبەر. لەوانەیە بەم کارە پێچەوانەی ڕێگەی سەرەکی خودی ئایینەکەی پێـواوت و لە باکووری رۆژئاوای نیمچەدوورگەی هیندەوە چووبووە چین. ئەم ڕێگە، سەرەتا ئەوی لە دون هۆانگ لە لێواری بیابانی تاکلاماکێنو پاشان شارەکانی خەمرکیی ئاگنی[3]، کۆچە، ئاق سوو نۆجکەند[4] تێپەراند. لەوێوە لە ڕێگەی تالاس[5] بۆ تاشکەندو فەرغانە، سەمەرقەند، بۆخاراو خارەزم بۆ ماوراءالنهر سەفەری کرد. و لە کیش[6]، قۆندۆز[7] و تێرمۆز تێپەڕیو پێی نایە ناو زنجیرە شاخەکانی پامیرو پاشان لە ڕێگەی گەرم[8] و کۆلاب/ کۆلان[9] و وەخشەوە دەگاتە بەلخ لە بەکتریا. دواییـنترین قۆناغی گەشتە دوورودرێژەکەی بەرەو هیند بە بامیانو بەسەر هیندوکیشدا بۆ هیندی برد. سیوئان زانگ سالانی دواتری تەرخان کرد بۆ گەشتوگەزار لە سەرانسەری نیمچەدورگە، چاوی بە شوێنەکانی بووزیی کەوتو گفتوگۆی لەگەڵ زانایان دەکردو نووسراوە دەستیەکانی کۆکردەوە. پاشان دوای غیبتێکی سێزدە ساڵە لە ڕێگەی خۆتەنەوە گەراویەوە چین.

سێوئان زانگ ٦٥٧ نووسراوی سانسکریتی لەگەڵ خوی بردە چینو بۆخۆی زۆربەیانی وەرگێرا سەر زمانی چینی. لە ماوەی گەشتەکەیدا کاتێك تووشی بووزییەکانی ئاسیای ناوەڕاست دەبوو رۆڵی مامۆستای دەگرتە ئەستۆو زۆرجار

1 . Asanga
2 . Yogacara
3 . Agni
4 . Nujkand
5 . Talas
6 . Kish
7 . Qunduz
8 . Garm
9 . Kulab

نێگەرانیو تەنانەت تورەیی خۆی لەوە دەردەبری کە ئەوان لەو بابەتانەیان لا دەدا کە سیوئان بە نەریتی دروست بیرکردنەوەی دەزانی.

بەربەرە سوپای موسڵمان لە سەرەتای سەدەی هەشتەم لە ئاسیای ناوەڕاست تاکوو دەگاتە تەراز لە قەزاقستانی ئێستا بەسەر ڕێگەی ئاوریشم دا باڵادەست بوو. هەرچەند شەرعی ئیسلام لایەنگری (ئەهلی کتێب) واتە مەسیحیی، یەهوودییو بەپێی هەندێ لێکدانەوەکان ئایینی زەردەشتی بوو، بەڵام موسڵمانە سەرەتاییەکان بەگشتی لەگەڵ بووزییەکان ڕەفتارێکی دوژمنانەیان هەبوو. بووزییەکان بە بت پەرست دەزانی چونکە هەندێ شتی ناخۆشی بەبیر دەهێناوە کە پێوەندی بە خیانەتی دووژمنەکانی مەکیی پێغەمبەرەوە هەیە کە لە قورئاندا هاتووە. لەوانەیە بەلالایەنی کەمەوە ئەمە بتوانێت هەندێ ڕەفتاری توندی موسڵمانەکان روون بکاتەوە لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ کۆمەڵەی بووزییەکان پاش داگیرکردنی هەر ناوچەیەك.

لە ئەنجامی زۆربوونی دەسەلاتی موسڵمانان لە ڕێگەی ئاوریشم، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گەشتی نێوان هیندو چین بۆ ڕەبیانو زیاتکەرەکانی بووزیی دژوارتر دەبوو[57]. لە نیوەی دووهەمی سەدەی یازدەدا ئەم پێوەندیی رادەوەستێتو واز لە بوودیزمی ئاسیای ناوەڕاست دەهێنرێت کە لە سەرچاوە هیندییەکەی دابڕاوە.

## ئایینی بووزییو زەردەشتی لە ئاسیای ناوەڕاست

هەندێ خاڵی سەفەرنامەکەی سیوئان زانگ وای لە زاناکان کرد بیربکەنەوە کە بوودیزمی ئاسیای ناوەڕاست کە لە لایەن حکومەتی ساسانییەوە پشتگیری

لێی دەکرا، ڕووی لە نەمان بووە. بۆ نموونە هۆیی لی[1] ژیاننامەنووسی سیوئان زانگ کە یەکێك لە فێرخوازەکانیشی بوو، بەشێوەیەکی تراجیدی دەنووسی کە لە سەمەرقەند ((شاو خەڵك بڕوایان بە بوودیزم نەبوو بەڵکو ئاگرپەرست بوون. دوو دیری لێ بوو کە هیچ ڕەببانێکی تێدا نەبوو. ئەگەر زیارەتکەرێك ویستبای لەوێ بمێنێتەوە ئەوا خەڵکی خۆجێ بە ئاگر لەوێ دەریان دەکرد[58].))

بەڵام واپێدەچێ کە پاشای سەغد کەوتبووە ژێر کاریگەری پارسایی سیوئان زانگەوە، کاتێك ڕوحانیانی ئاگرپەرست دوو کەس لە خێرخوازەکانی هاوڕێی سیوئان زانگیان لە پەرستگەکە دەرکرد، شا فەرمانی دا سزایان بدەن. ئەوکات سیوئان زانگ بەواتایەکی تر (جۆرێکی تری هێنا ئاراوە) واتە بەسودی ڕوحانیان ناوبژی کرد. وەك هۆیی لی ئاماژە دەکات سیوئان زانگ بەم هۆیەوە لەناو خەڵکی خۆجێدا ڕێزێکی تایبەتی پەیدا کردو ((پاشاو خەڵك بڕوایان بە بوودیزم هێناو کۆمەڵێکی گەورە پێك هات بۆ وەرگێرانی چەند کەسێك کە دواتر لەناو ئەو پەرستگایانەدا دەژیان[59].))

بەو پێیە کە پەرتووکەکەی هۆیی لی زیاتر سیرەیە وەك ژیاننامە، بۆیە دەبێ بە پارێزەوە ئیهاراتی ئەو دەربارەی سەرکەوتنی هەوڵەکانی سیوئان زانگ وەرگرین. بێگومان ئەم ڕێبوارە چینییە کەسێکی کاریزماتیك بوو، و ئەم ڕوخسارانە بچنە هەرجێگایەك دەتوانن کۆمەڵێك جەماوەر لە دەوری خۆیان کۆ بکەنەوە. بەڵام تەنیا بەپێی ئەم راپۆرتە ناتوانین تێبگەین کە جەماوەری سەغدیی لە بوودیزمەوە گرۆیی ئایینی زەردەشتی بووبن و سیوئان زانگ توانیویەتی دووبارە بیانگەڕێنێتەوە سەر ڕێگەی ڕاست.

وانگهێ، تەنانەت ئەگەر اجهارات هۆیی لی دەربارەی سەرکەوتنەکانی مامۆستاکەی لە سەغد ڕاست بێ، بەلایەنی کەمەوە (گرۆییەکان) لە کەسانێك

---

[1] . Hui-li

پێکهاتبووە کە پێشتر بووزیی (یان بەلایەنی کەمەوە تارادەیەك (بووزییگرێ) بوون، و تەنیا لەودا مرجعیتێەکیان دەدیت کە حەزیان دەکرد گوێگری استدعاهای چاکسازی ئەو بن. لە تەواوەتی ئاسیای ئەو سەردەمەدا ژمارەیەکی زۆری قوتابخانەی بوودیزمو باوەرو کرداری خۆجێیی بەربڵاو بوو، و ئەگەر کەسانێکی بووزیی لە سەغددا هەبوون، کە پێدەچێ وەها بووبێت، تەنیا گێردراوەی خۆجێیی ئەوان لە بووزیزم بووە کە سیوئان زانگ بە داهێنانی داناوە[60]. پێدەچێ عبارت هۆیی لی دەربارەی (چاکسازی نەریتی خراپ) لەگەڵ ئەم لێکدانەوە یەکدی بگرنەوە.

زۆرتر پێدەچێ لەگەڵ دزەکردنی ساسانی لە ئێرانەوە، هەر شێوەیەکی خۆجییێی بوودیزم، کە لەوانەیە لە دیانەتی ئێرانی خۆجێیی کە بەوەوە دەست پێدەکات رەنگی وەرگرتبێت، زۆرتر لە جاران رەنگو رووی ئایینی زەردەشتی ساسانی بەخۆیەوە گرتبێ کە ئەمەش تازە بۆنیات نرابوو. جیهانی ئێرانی رۆژهەلاتی بەلگەی باوەرپێکراوی لە کاریگەری زەردەشتی بۆ گەشەپێدانی بوودیزم بەدەستەوە داوە. دەکرێ بابەتێکی وەها لە گرحی رێرەوی گوافی دەوری استوپەهای بووزیی ببینرێت کە مۆدێلەکەیان لە پەرستگەکانی ئاگر وەرگرتووە[61].

دیسان، ناکرێ بوێنای ئەوە بکریت کە جەماوەری سەغد هەمیشە بەواتایەکی یەکسان زەردەشتی یان بووزیی بووبن واتە بەو واتایەی کە ئێمە لەم چەمکان تێدەگەین. جگە لەمانە، شایەت حالێکمان هەیە بۆ بەردەوامی توخمی کەڵلە رەقی خۆجێیی وەك سیاوەشی پاڵەوان لە بۆخارا کە لە نەورۆزدا کەڵەشێریان بۆ قووربانی دەکرد[1]. [62] ئەگەری زۆر بەهێزە کە ئایینی خۆجێیی

---

[1]. ((... و ئەفراسیاب سیاوەشی کووشتو هەر لە چواردیواری "ارگ"دا ناشتیو هەربۆیە مۆغەکانی بۆخارا ئەو جێگە بە پیرۆز دادەنێن. و هەموو ساڵێك هەر پیاوێك کەلەشێرێك دەباتە

سەغدیی لە کۆمەڵێك تووخمی وەرگیراو لە کۆمەڵیەکی ئێرانی/ هیندوئاریایی دروست بوو بێت کە هەر دووکی ئەم ئایینە سەرەکییانە بەهۆی ئەوەوە پێگەیشتبوون، و هەر هەوڵێك لە مقولەی بندی ئەوان لە هەر سەردەمێکدا لەژێر ناوی زەردەشتی یان بووزیی جگە لە بە هەڵەداچوون هیچ دەستکەوتێکی تری نییە.

## تەبەت و ڕێگای ئاوریشم

ڕێگای ئاوریشم بەرزاییە ترسناکەکانی فەلاتی تەبەت دەور لێدەداتەوە، بەلام ڕێگەکانی لاوەکیی تەبەت بەرێگە وشکاییە پڕهاتووچووەکان دەبەستێتەوە. وێنەو نووسراوە بەردینەکانی قەراخ ڕووباری سێنجی سەرووی لەداك/ لەداخ[1]، لە گۆشەی باشووری ڕۆژئاوای تەبەت، نیشاندەری تێپەرینی بازرگانەکانی سەغدی و مەسیحی و مانەوییە. لەوانە سەغدییەکانی ئایینەکانی جۆراوجۆر ئالوگۆرە بازرگانییەکانیان دەبدە ناو تەبەت[63]. بوودیزم لە دوو ڕێگەوە گەیشتە تەبەت، یەکەم لە هیندەوە لە ڕێگەی نێپال بەرەو باشوورو ئەوەی تریان لە ڕێگەی چینەوە لە ڕێگەی بەشی ڕۆژهەلاتی ئاوریشمەوە.

نزیکەی ٦٥٥ـ٦٩٢ (حکومەتێکی مستعجل) تەبەتی لە شارە خەمرکییەکانی ناوچەی تاریمدا دەسەلاتی پەیدا کردو بازرگانی ڕێگەی ئاوریشمی گرتە دەست. سەدەیەك دواتر پێش سالی (٧٤٨ـ٨٥١) بەتەواوەتی کاروباری خۆتەنی بووزییان بەدەستەوە بوو[64]. ئەمە بەواتای زیادبوونەکانی کاتیی ڕێرەوێك بوو کە ڕاستەوخۆ دەچووە تەبەت، و دزەکردنی بیرۆکەکانی بووزیی لە چینەوە ئاسان دەکرد. یەکەمین پەرستگەی بووزیی تەبەت لە ٧٧٩ لە سەمیە[2]

ئەوێو بەر لە دەرکەتنی خۆری ئەوڕۆز دەیکوژێتەوە.)) تاریخ بخارای نرشخی، هەمان، ٣٢-٣٣. و.

[1]. Ladakh
[2]. Samye

دروستکرا. ڕەببانەکانی ئەویش هەر وەك ناوچەکانی تاریمو شوێنەکانی تر، لە خێرو خێراتی (پیشنشینان)ێك پێگەیشتن کە پێشەیان بازرگانی بوو.

مناسبات تەبەت لەگەڵ چین، کە لە کۆتاییەکانی سەدەی حەوتمەوە ئەوانی کردبوو بەرقیب بۆ دەستگرتن بەسەر ڕێگەی ئاوریشم، بووە هۆی تعدیلی نفوژ بوودیزم چینی. هەرچەند بە تەواوەتی روون نییە کە بوودیزمی تەبەتی بۆچیو چۆن زیاتر ڕاکێشراوی سەرچاوەکانی هیندی بوو، بەتایبەت بۆ ئایینی تەنترەی کەشمیری، بەلام لەوانەیە هۆکارێکی پێویستی ڕامیاری تەبەت بۆ سنوردارکردنی سەروەریخوازی فەرهەنگی چینی بووبێت. لەوانەیە خۆتەن، لەگەڵ پێوەندییەکانی کۆنتارای بووزیی لەگەڵ کەشمیر، خاڵێکی گوازێنەری گەورە بووبێت. بەتایبەت لەو سەردەمانەی کە کۆنترۆلی لە دەستی تەبەتدا بوو.

## بەشی چوارەم

## لیزگەی داهێنەران:

## نەستورییەکان و مانەوییەکان لە رێی‌وبانەکانی ئاوریشم

لە ماوەی چوار سەدەی یەکەمی مەسیحیدا بوو کە ئایینە گەورەکانی ئاسیای باختەری پێناسە کران و بەرەبەرە بەو شێوەی لێهات کە ئێمرۆ دەیانناسین. تارادەیەکی زۆر ئەم پرۆسە دەستکەوتی ململانییەکی دوولایەنە بوو: لە جیهانی رۆمی رۆژهەلاتی لە نێوان مەسیحییەکان و یەهودییەکان و مدافعان لێکدانەوە جیاوازەکانی مەسیحییەت لە لایەک، و لە کەرانەی ئێرانیدا لە نێوان پاسەوانەکانی پەرستش نەریتێک لەسەر بنەمای ئەهورامەزدا[1] و هەرشەی پەیتاپەیتای مانەوییەت لە لایەکی تر.

لەوانەیە گرووپەکانی مرۆیی کاتێک هەوڵی پێناسەکردنی خۆیان بدەن کە بابەتێک تووشی کێشەیان بکات کە لەوانەیە دەیانتوانی پێی بگەن و تێیدا باشتر بن، بەڵام لە ترسی لەدەستدانی ناسنامەکەیان دەبێ وەها نیشان بدەن ئەو شتە نین. (لەوانەیە لێرەوەیە کە سیستێمی باوەر لە کۆمەڵگا نەریتخوازەکاندا لە روانگەی بینەرە نوێیەکانی توصیفکرا زۆر نەرم و گشتگیرە.) لە ئاییندا، خۆ خەریککردن بە جیاوازییەکانی (ئێمە/ ئەوان) نیشاندەری تویژی پیاوانی ئایینییە. لە سەرچاوەکانی ئایینی پەرتووکی پیرۆزی عیبرانی[2] و تلمودی ئەو خاخامانەی کە پاش پێواروێژەکانی پارێزەری نەریتی عیبرانی هاتن، بەڵگەیەک بۆ ئەم بارە دەبینین، ئەمەش لە مشتومڕەکانی ابای کلیساو هەروەها لە

---

1. مەزدیسنان. و.

2. تەورات. و.

هەوڵە بێبەزەییەکانی مۆغەکانی زەردەشتی لە سەرکووت کردنی جێگری مانەویدا دەبینین. مشتومڕەکانی ئایینی سەرەتای سەردەمی مسیحی لە لایەنگرانی رامیاریی کە هاوتەرییبیان دەکردن، جودا نین. کاتێک لایەنێک نیشانی دەدا کە بەهێزترە، لاتاوی کافرو نوێگەریان بە رەقیبەکەیاندا دەدا. ئەم کارە درگای سەرکوتو دوورخستنەوەو دەرکردن یان تەنانەت لە سێدارەدانی رەقیبی تالا دەکرد. دۆراوەکانی ئەو دوو بزوتنەوە کە لە مێژووی جیهاندا گرنگییان سەلمێندراوە، هەڵیانبژارد کە دوورکەونەوە. لێرەدا ئەم خاڵە جێگای سەرنجدانە کە هەردووک مۆدێلێکیان پەیرەو دەکردو خۆیان لە مەترسیو زیان پاراستو بەرەو رۆژهەلات رۆیشتن. هەردوو باری دوورخستنەوە بووە هۆی مانەوەیان بۆ هەزار ساڵی ترو تەنانەت کامەرانیانی گەرەنتی کرد بۆ چەند سەردەمی دواتریش. رێرەوی مەنتیقی ئەم کۆچکردنە بەرەو رۆژهەلات، وەك بینیومانە، پەیوەست بوونە بە کاروانەکانی رێگەی ئاوریشم.

هەردوو سەرچاوەی مەسیحیو مانەوی بەڵگەن بۆ هەبوونی پێوەندی نزیك لە نێوان چالاکی بازرگانیو پرۆپاگەندە. زمانی سۆریانی کە لینگۆوا فرانکا[1] یان زمانی بازرگانی هاوبەش لە ئاسیای باختری بوو، بوو بە زمانی عبادی کلیسای ناوچەکانی رۆژهەلات. لەناو مەسیحییەکانی سەرەتاییدا واژەی سۆریانی بۆ (بازرگان) بەکاردەهات، tgr' کە زۆرتر وەك استعارەیەك بۆ کەسانێك بەکار دەهات کە مزگێنی/ ئێنجیلیان بلاو دەکردەوە. لە سرودێکی نزاکاری سۆریانی سەدەی چوارەم ئەم پارچەی تێدایە:

*سفر را کمر بسته به کردار تاجران*

*باشد که جهان را به دست اوریم.*

---

[1] . Jingua france وەك بڵەی "زمانێکی هاوبەشی نێونەتەوەیی" ئێستا. و.

*مردان را به خود بگروانیم،*

*افرینش را با تعلیم سرشار کنیم.*

## کلیسای ڕۆژهەڵات

ئەوەی کە پێی دەڵێین مەسیحییەت، سەرەتا وەك بزووتنەوەیەك لەناو کۆمەڵگای فەلەستینی ڕوومیدا پەیدابوو. وەك لە نووسراوەو ئەفسانەکاندا هاتووە، ڕوونکردنەوەکانی پیروانی عیسا دەربارەی مێژووی یەهود، ئەوەندە بنیادستیز بوون کە ژمارەیەکی زۆری یەهودییەکان ڕەتیان کردەوە. لە وەها پرۆسەیەکدا، زانایانی یەهودی شێوازێکیان هێنایەئارا بۆ دیاریکردنو دەربرینی بابەتێك کە میراپو مەبەستیان بوو، لە ئەنجامدا ئەمە وەك نەریتێکی خاخامی نهادینه شد، کە بوو بە تجویزێك بۆ یەهودییەکانو بناغەی یەهودیەتی ئێستایە.

هەروەها لەسەر لێکدانەوەی شتێك کە دەبێ بروایان پێی هەبێو چۆن دەبێ بەپێی ئیمانەکەیان ڕەفتار بکەن، اختلاف کەوتە نێوان مەسیحییەکان. یەکێك لە هەستیارترین دۆزەکانە کە الاهیدانانی سەرەتای مەسیحییەت لەگەڵی ڕووبەڕووبوون. چارەسەری دۆزی سروشتی ڕاستەقینەی مەسیح بوو کە ئایا الاهییە یان مرۆیی.

مشتومڕە عقیدتییەکانی ناو کلیسای سەرەتایی مەسیحی ڕەنگدانەوەی ململانێی نێوان مدافعان خاوەن پلەی لێکدانەوە جۆراوجۆرەکان بوو سەبارەت بە دۆزی برتریو بەم شێوەش احتمالی هەبوو کە لەگەڵ بنکە ناوچەییە تایبەتییەکانی دەسەڵات بە یەکەیەك دابنرێن. هەڵوێستی قوتابخانەی (دیوفیزیت[1]) ناسراو بە ئەنتاکیە، ئەوە بوو کە مەسیح لە دوو کەس (یان دوو

[1] . Diophysite

فیزیك یان دوو سروشت) پێکهاتووە. یەکێکیان مرۆییی و ئەوەی تریان الاهی، ئەم دوو سروشتە لەناو خودی عیسا دا هاوژینن، بەهەمان شێوە کە گیانی خودایی بەسەر پێغمبەرانی عیبرانی نازل ببوو. هەڵوێستی ((مۆنۆفیزیت[1]))ی ڕەقیب، کە پێوەندیی بە الاهیدانان ئەسکەندەریەوە هەبوو ئەوە بوو کە مەسیح، کلمةالله[2] جاودانییە کە لە شێوەی مرۆڤ تجسد مییابد_ خودایەك بوو کە لە باردۆخی مرۆییدا دەژیا.

لە سەرەتای سەدەی پێنجەم ئەم منافرە وەك مناقشەیەك لەسەر ئەم دۆزە سەری هەڵدا کە دەبێ چۆن مەریم وەصف بکرێ: ئایا "هەڵگری مەسیح" (کرسیتۆتوکۆس[3])ە یان (دایکی خودا) (تیۆتۆکوس[4]) (یان، هەڵگری خودا)؟ کاتێك اسقفێکی شامی/ سوری بەناوی نەستوریۆس[5] لە ساڵی ٤٢٨ لە پلەی پەتریرکی[6] قۆستەنتەنیە دانرا، دیدگاە ئەنتاکییەیی تعلیم داد کە بەم شێوە کورتی دەکردەوە کە ئەو (ناتوانێ خودا وەك منداڵێکی کور وێنا بکات). هەڵوێستی ممتاز نەستوریۆس لە قۆستەنتەنیە وەك ووتەبێژی ئەنتاکیەییەکان وەلامێکی دوژمنانەی لێ کەوتەوە، کە کیریلۆسی[7] ئەسکەندەرانی، پەتریرکی ئەسکەندەریە، پێشەوای بوو.

خودی تئودۆسیوسی دووهەم[8]، ئیمپراتۆری بیزانس، نەستوریۆسی خۆشدەویست بەلام پۆلخریای[9] خووشکی ڕقی لێدەبۆوە. ئەم خوشکە کاریگەری زۆری لەسەر ئیمپراتۆر هەبوو و کیریلۆسیش کە ئەمەی دەزانی

1 . Monophysite
2 . Divine Logos
3 . Christotokos
4 . Theotokos
5 . Nestorius
6 . Patriarch
7 . Cyril
8 . Theodosius
9 . Pucheria

پۆڵخریای کردە سەنتەری بسیجی تبلیغاتەکەی لەدژی نەستوریۆس. لە ساڵی ٤٣١ بە فەرمانی ئیمپراتۆر لە ئێفسۆس[1] لێژنەیەك پێکهات کە سەبارەت بە دۆزی چەمکی گونجاو بۆ مەریەم بریاربدات. کیریلۆس وەك سەرۆکی ئەم لێژنە هەڵبژێردرا بوو، کەواتە نابێتە مایەی سەرسورمان ئەگەر هەڵوێستی ئەنتاکیاییان بە نوێگەری زانیبێتو ڕەتیان کردبێتەوە. (لەراستیدا گروپی ئەنتاکیایی لەم لێژنەدا بەشدار نەبوو.) ئیمپراتۆر، لەژێر گووشاری پۆڵخریا پشتیوانی لە کیریلۆس کردو نەستوریۆسی لەسەر کار لاداو بۆ میسر دووری خستەوە.

بەڵام پەروەردەی ئەنتاکیایی لە شام/ سوریاو وولاتانی رۆژهەلاتدا بالادەست بوو، و هەر ئەم بەشە گەورەی اسقفنشین بوو کە مرجعیت کیریلۆسی بەفەرمی نەناسیو لێی جودا بووەوە تاکوو کلیسای رۆژهەلات بنیات بنێت کە بنکەکەی لە تیسفون (نزیك بەغدادی ئێستا)، پایتەختی پاشایەتی ساسانی بوو کە ئەمە بەواتا رەتی مرجعیتی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتیش بوو، و پاش ئەوە کلیسای نەستورییانو جیهانی ئێرانییان بەیەك زانیوە لەدژی بیزانس.

لە ساڵی ٤٥١ لێژنەی خەلقیدون[2] پێشنیاری مصالحەیەکی لە نێوان موازع مێنۆفیزیت کرد، بەم واتایە کە مەسیح پێکهاتێك بێ لە دوو سروشت بەڵام نەك دوو کەس. نەستورییەکان حەزیان دەکرد ئەمە وەك دان پێدانان بە هەڵوێستەکەی خۆیان دابنێن، بەڵام وەك پێویست کارتێکەر نەبوو. لە کۆبونەوەیەك لە ٤٨٦، اسقفەکانی رۆژهەلاتی بە ئاشکرا رایانگەیاند کە کلیساکەیان نەستورییەو هەردوو بیرۆکەی مێنۆفیزیتو مصالحەی خەلقیدونیاییان رەت کردەوە عقیدەی خۆیان لە شێوەی (تەنیا یەك سروشتی الاهی، لە سێ کەسی کامل...) دەربڕی. دیسان لەوە زیاتر چونەپێشەوەو

[1] . Ephesus
[2] . Council of Chalcedon

ووتیان ((مەسیح دوو سروشتی الاهیو مرۆیی هەبوو... بەبێ شڵەژاوی لە زۆرینەیاندا... هەروەها پێوەندەیی نەپچڕاو لە نێوان الاهیو مرۆیی ....)) پێدەچی نەستورییەکان دۆخێکی گرنگیان لەپێش بوو بەم واتایە کە ئەوەی لە هیاتی مرۆڤدا دەژیا دلالتی لە خودا دەکرد، هەربۆیە حکمەکەیان بەم شێوەیە درێژەی پەیدرا (ئەگەر کەسێك بیر بکاتەوە یان تعلیم دهد کە رەنجو گۆران ژاتی الوهیتن، و ئەگەر کاتێك باسی وحدتی تاکی رزگارکەرمان دەکات، ئەگەر ددان بەوەدا نەنێت کە ئەو خودای کاملو مرۆڤی کاملە ئەوا دەبێ ئەو کەسە دوور بخرێتەوە.[٢])

ئەم مجمعەو مجمعی دواتری لە ساڵی ٤٩٧ مێنۆفیزیتەکانی ئێرانییان خستە هەڵوێستی بەرگرییەوەو لەمەو پاش ئایینی نەستوری بوو بە بیرۆکەی فەرمی (هەڵبەتە نەك تەنیا بیرۆکە)ی ئاسیای مەسیحی.

## مەسیحییەت لە ئێران

لە *اعمال رسولان* (٢:٩) هاتووە کە یەهودییەکانی ئێران لە پارت[١]، مێدی، عیلامو میسۆپۆتامیا شایەتحاڵی معجزەی پێنتیکۆست[٢] بوون. لە کاتێکەوە کە مەسیحییەت لەناو جیهانی یەهودیدا پەیدابوو، ئاسایی بوو کە پەرەسەندنی لە فەلەستینەوە بەرەو رۆژهەلاّت زیاتر لە ڕێگەی تماسەکانی پراکنش یەهودییەوە ئاسانکاری بۆ کرابێ[3]. لەوێوە کە ئەم پێوەندییانە تارادەیەکی زۆر ناوەرۆکێکی بازرگانیان هەبوو بەدڵنیاییەوە دەکرێ بووترێ کە یەکەمین بازنەی مەسیحییەتو ڕێگەی ئاوریشم لە ڕێگەی یەهودییەکانی بابلەوە بوو.

زنجیرەی ئەشکانییەکانی پارتی کە لە دوو سەدەی یەکەمی زایینی لە میسۆپۆتامیا و ئێران دەسەلاّتدار بوون، ئایینیان وەك دۆخێکی رامیاری بەژمار

---

[1] . Parthia
[2] . Pentecost

نەدەهێنا کە گرنگییەکی تایبەتی هەبێ. لە ئەنجامدا لە سەرچاوەکانی ئەشکانییدا ئاماژەیەکی ئەوتۆ بە فرقەکانی ئایینەیی نەکراوە، هەربۆیە تەنیا دەتوانین پەرەسەندنی بیرۆکەکانی مەسیحی لە رۆژهەلات لەسەر بنەمای شیکردنەوەی بەرژەوەندی بابەتەکانی دواتر حدس بدەین. واپێدەچێ لە بەشی رۆژئاوای هەرێمی ئەشکانی کۆمەڵانی مەسیحی لە نێوان فرقەکانی یەهودیو فرقەکانی ترو ئایینەکانی خۆجێییو ئایینە جۆراوجۆرەکانی ئێراندا گەشەیان کردبێت.

نقر بەردایصان[1] کۆنترین ئاماژەیە بە کۆمەڵانی ئاسیای ناوەڕاست لە سەرچاوەیەکی مەسیحییدا. ئەو لە دەوروبەری ١٩٦ دا ووتوویەتی «خووشکانی ئێمە لە نێوان گیلانییەکانو بەکترياییەکان (کووشانییەکان) پێوەندیسێکسیان لەگەڵ بێگانەکان نییە.» لە *اعمال تومای* جعلیدا، کە لە هەمان سەردەمدا نووسراوە، ئاماژە بە دیاری کووشانییەکان[2] (بەیت کایشان[3]) کراوە[4].

لە ٢٢٤ زنجیرەیەکی نوێ بەناوی ساسانییەکان، ئەشکانییەکانیان شکەستدا. تا ئەو کاتە ژمارەی مەسیحییەکان لە جیهانی ئێراندا تا ڕادەیەك زۆر بوو: لە مێژوویەکی کلسیای سەرتادا هاتووە کە ٢٢٥ لە هەمووی سەرزەوییەکانی ژێردەسەڵاتی ئێرانییەکاندا بیست شوێنی نیشتەجێبوونی اسقفەکانی تێدا بوو، دوابەدوای سەرکەوتنەکانی شاپوری یەکەم پاشای ساسانی بەسەر بیزەنتییەکان لە (٢٥٦ــ٢٦٠)، دیلەکانی مەسیحی کە ئاخاوتنیان بەزمانی یۆنانیو سۆریانی بوو، گەڕاندرانەوە ئێرانو بەم شێوە ژمارەی مەسیحییەکانی ئەم وولاتە زیادی کرد.

---

[1] . Bardaisan

[2] . یان کووشان شار. و.

[3] . Baith Kaishan

سێ پاشای یەکەمی ساسانی تا ڕادەیەکی زۆر خۆراگری ئەشکانییەکانیان لە بەرامبەر ئایینەکانی غیرئێرانی پاراست. شاپور فەرمانیدا کە ﴿مۆغەکان، زەندیقەکان (مانەوییەکان)، یەهودییەکانو مەسیحییەکانو هەموو گەورە پیاونی هەر ئایینێك، نابێ بورووژێنرێنو دەبێ لە بیروباوەڕیاندا ئازاد بنو لە ئاشتیدا بن.﴾

بەڵام لە سەردەمی بەهرامی دووهەم (٢٧٦ـ٢٩٣)، درباری ساسانی پێوەندی لەگەڵ مۆبێدەکانی زەردەشتی کە مۆبێدی گەورەیان کارتیر[1] بوو، بەهێزکرد کە ئەمەش کارەساتێکی سازکرد بۆ ئەوەی ئایینی زەردەشتی بکاتە ئایینی فەرمی پاشایەتی نوێ. کارتیر هەستی دەکرد کە لەم ڕێگەدا پێویست هەر سامانێکی ئایینی بالقوەی ڕەقیب لەسەر ڕێگە لابدات. لە کەتیبەیەکی ساڵی ٢٨٠ دا ناوی مەسیحییەکانی لە ژمارەی ئەوە گروپانەدا دەهێنا کە بە بڕوای ئەو دەبێ سەرکوت بکرێن. هەرچەند کارتیر یەهودییەکانیش لە گروپی نەیارەکان بەژمار دێنێت، بەڵام بەڵگەیەك نییە کە نیشانی بدات کۆمەڵەی یەهودی ئامانجی ئەو مەبەستەی ئەو بووبن[6]. لەوانەیە ژمارەیان ئەوەندە نەبووە کە ببنە مەترسی هەڕەشەکردن.

بەرەبەرە کۆمەڵانی جۆراوجۆری مەسیحی ئێرانی لە بەرامبەر کمینی ئەم دوژمنایەتییەدا ڕێکخراوێکی کلیسایی هاوبەشیان دامەزراند تاکوو لەم ڕێگەوە بتوانن پێگەیان توونەدتر بکەن. لە ٤١٠، کلیسای ئێرانی لە شەش ایالت پێکهاتبوو و اسقفەکانی ڕۆژهەڵاتی لە مجمع ٤٢٤ دا، لە ڕووی کارگێڕییەوە سەربەخۆیی کلیساکەیان لە ڕۆژئاوا ڕاگەیاند. زیادبوونی دوو ایالتی نوێی مەڕوو هەرات لە ڕۆژهەڵاتدا نیشاندەری پەرەسەندنی نەبراوەی مەسیحییەتە لە ڕێگەی ئاوریشمدا.

---

[1] . Kartir

مەسیحییەکان لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی ساسانیدا ژیانێکی ناجێگیریان دەبوارد. زۆرجار، ئەم یان ئەو پاشایە لە بەرامبەر مەسیحییەکان بەنەرمی رەفتاریان دەکردو ئەوانیش لە سوپای ساسانیدا خزمەتیان دەکرد (بەپێچەوانەی اتهامی خوارەوە)، تەنانەت لە نەبەرد لەگەڵ بیزەنتییەکانیش سەردارێکی مەسیحی پێشەوای ساسانییەکان بوو. بەڵام مۆغەکان کە بەدوای نەهێشتنی مرجعیت ئایینی ئەوانەوە بوون، لە رێگەی اقتداری رامیای پاشاوە هەمیشە گووشاریان دەخستەسەر کۆمەڵەی ئایینی غیرزەردەشتی ئێران. ئەو سەردەمانەی کە لە ئامانجەکانی رامیارییەکانیاندا زۆر سەرکەوتوو بوون (بۆ نموونە لە سەردەمی شاپوری دووهەم لە ٤٢٩و یەزدگێری دووهەم لە ٤٣٩ ــ٤٥٧) سەردەمانێك بوون کە مەسیحییو یەهودییو مانەوییەکانیان زۆر بێبەزەییانە ئەشکەنجە دەکران. فەرمانێکی پاشایەتی کە لەلایەن شاپوری دووهەمەوە دەرکرا بوو لیستێك دەخاتە بەردەست کە چەند خاڵی تێدایە سەبارەت بەوەی کە پێدەچێ مەسیحییەکان لەم خاڵانەدا لەگەڵ حکومەتو بەهاکانی زەردەشتی دژبەیەك بوون:

> مەسیحیەکان فێرکردە پیرۆزەکانی ئێمە لەناو دەبەنو خەڵك فێر دەکەن کە خزمەتی یەك خودا بکەنو خۆرو ئاگر لەلایان بەرێزو پیرۆز نییە. هەروەها فێریان دەکەن کە بەغسل کردن ئاو بیالایند، لە هاوسەرگیری بەرگری دەکەنو لەگەڵ پاشا ناچنە جەرگەی شەڕکردن. لە سەربرینو خواردنی گیانلەبەراندا وەسواس نین[1]، جەستەی مرۆڤەکان لەژێر

---

[1] . واتە پێدەچێ وەك زەردەشتییەکان رێورەسمەکانی ئەم بوارانە جێبەجێ ناکەن. (نووسەر)

گـڵ دەنێـژنو خاسـتگاه مـارو خزنـدگان
دەخەنـە پـاڵخودای خۆیـان. لـە زۆربـەی
خزمـەتگوازانی شـا بێـزارنو خـەڵك فێـری
سێحرو جادو دەکەن[1].[7]

بەپێـچەوانەوە، ئـەو کاتانـەی کـە حکومـەتو مۆغـەکان لـە یەکـدی دوور دەکەوتنەوە (بۆ نموونە لە سەردەمی نەرسی[2] لە ٢٩٣ـ٣٠٣، یـەزدگێری یەکـەم لە ٣٩٩ـ٤٢١، بلاش لە ٤٨٤ـ٤٨٨، قوباد لە ٤٨٨ـ٥٣١و هۆرمـۆز لـە ٥٧٩ـ٥٩٠) مەسـیحیو یەهودییـەکان توانیـان لـە ئاشـتیدا بـژینو زۆرجـار بەختـەوەربوون. لەراستیدا بەبڕوای هەندێ لە بینەران ئەوەندەی نەمابوو لـە سـەدەی حەوتەمـدا مەسیحییەت جێگای ئایینی زەردەشتی بگرێتەوە کە ئیسلام هاتە گۆرەپانەوە. (ابوریحانی) بیرونی (خارەزەمی)، زانای موسڵمانی خـەڵکی ئاسـیای ناوەڕاسـت کە نووسـەری سـەدەی یازدەیەمـە، مدعییـە کـە لـە ڕۆژگـاری ئـەودا ((زۆربـەی دانیشتوانی شامو عیراقو خۆراسان، نەستورین.))[8]

قـەبووڵی مەسـیحییەت وەك ئـاینی فـەرمی ئیمپراتـۆری ڕوم دوو کاریگـەری گرنگی لەسەر مەسیحییەتی ئێرانی هەبوو. یەکەم ئەوە بوو کـە مەسـیحییەکانی ئێرانی بـەرغمی ناکۆکییـەکانی عقیـدتییان لەگـەڵ کلیسای ڕوم، ئێـستا گومـانی وەفاداریان بەرامبەر بە بێگانەکان لێدەکرا کە ئەمـە زۆرجار بیانوویـەك بـوو بـۆ توجیـەی سـەرکوتو ئازاردانیـان. لەراسـتیدا زۆربـەی سـەرکوتەی گـەورەکانی مەسـیحییەکان لـە ئێرانـدا پێوەنـدی ڕاسـتەوخۆی بـە بـاردۆخی ڕامیـاری دوو ئیمپراتورییەکەوە هەبوو.

---

[1] . جێگای ئاماژەیە کە ئەم فەرمانە لە سەرچاوەیەکی مەسیحی وەرگیراوە، لەوانەیە دروست بێت یان نەبێت. (نووسەر)

[2] . Narseh

خاڵێکی تر ئەوە بوو کە لەگەڵ مەسیحییەتێك کە ئێستا لە ڕۆژئـاوا (ڕووم)دا لەلایەن حکومەتەوە پشتگیری لێ دەکرا. تای تەرازووی مـشتومڕەکانی ئـایینی بەسـودی ئـەو گروپانـە بـوو کـە لەلایـەن حکومەتـەوە پـشتیوانیان لێ دەکـراو دەیـانتوانی بیکـەن بـە گۆپالێـك بـۆ سـەرکوتکردنی کەسـانێك کـە لایـەنگری لێکدانەوەکانی ڕەقیب بوون. هەروەها هاوشارییەکی ڕوومیی کە مەسـیحییەتیی هەڵنەبـژاردبوو ڕەقیـان لێ دادەگـرتو معرچـبوو بـۆ سـەرکوتکردنو ئـازار پێگەیاندنی.لـە ئـەنجامی ئازاردانـەکانی کلیـسا کـە بـە پـشتیوانی حکومەتـەوە ئەنجام دەدرا، ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیرانو کەسانی تر لە جیهانی مەدیتەرانە هەڵهاتن تا لێزگەیەکی ئاسودە لـە پاشـایەتی ساسـانیدا پەیدابکـەن. زۆرێـك لـە پیتۆلەکانی ئاتێنی، پزیشکانی شامیو منجمانی سابێئی ئەم ڕێگـەیان گرتەبـەر کە بۆ دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی ساسانی بەسود بوو.

شاری ئێستای وێران بووی جووندیشاپوو لە باشووری ڕۆژئاوای ئێـران بـوو بــە بنکــەی نــوێی پزیــشکیو پتــۆلیو ئەستێرەناســی کلاســیکی یونــانیو قوتابخانەیـەکی تێـدا دامـەزرا کـە ئەندامـەکانی هـەم بتپەرسـت بـوونو هـەم مەسیحییەکانی ڕۆژهەلاتی. جووندیشاپور بـۆ مـاوەی پێـنج سـەدە یـەکێك لـە گەورەترین ناوەندەکانی زانستی جیهان بـوو. کاتێـك عەرەبـە موسـڵمانەکان لـە ناوەندەکانی سەدەی حەوتەم ئـەم ناوچـەیان داگیرکـرد دەسـتیان لـە پێکهـاتی ئـەم قوتابخانـە نـەداو زۆرتـر لـە دوو سـەدە ژمارەیـەکی زۆر لـە بیرمەنـدانی بەرجەستەی موسڵمان دەستپەروەردەی مامۆستایانی مەسیحیی ئەوێ بوون.

## ئایینی نەستوری لەناو سەغدییەکان

سەغد ـ تا کاتێك کە سلسلەی سامانی لە سەدەی دەیەم کردی بە چالاکترین ناوەندی جیهانی ئیسلام ـ هەرگیز ناوچەی درستاندیشی ئایینی نەبوو و لەپێش مێـژووەوە کـە هۆزەکـانی ئێرانـی تێـدا نیـشتەجێ بـوون، ئـەم هەرێمـە لـە

قەراغەکانی رۆژئاواو رۆژهەلات بوو و بەیەك ئەندازە لە ناوەندەکانی هەموو نەریتەکانی ئایینیی گەورە دوور بوو. هەمیشە ناوەندو شوێنی گوازتنەوە بوو، جێگایەك کە درەنگ یان زوو هەموو شتێك دەیتوانی لەوێ تێپەریت یان تێدەپەرێت.

ئەسکەندەر لە سەدەی چوارەمی پ.ز لە سەغد کۆمەڵێك کاریگەری یونانی بەجێ هێشت. رەوەندە ئێرانییەکان وەك سەکاکانو هەروەها رەوەندە تورکەکان هەمیشە لە نزیکی ئەوێ ئامادە بوون. پارتییەکان/ ئەشکانییەکان دەستیان لە پێکهاتی ئەم ناوێتە فەرهەنگییە وەرنەداو ئەم ناوچەیە بۆ ساسانییەکان لەوە دوورکەوتووتر بوو کە هەولّی یەکسانکردنی زەردەشتی بتوانێت کاریگەری لەسەر دابنێت.

بازرگانەکانی سەغدیی ئەربابەکانی راستەقینەی رێگەی ئاوریشم بوونو گرنگ نەبوو چە کەسانێك خاوەن دەسەلاتە تێپەرەکانی ئەو سەردەمە بووبن، بازرگانەکانی سەغدیی لەژێر دەسەلاتی هاوهۆزەکانی ئێرانیی ئەشکانیی یان ساسانییەکانیان زۆر بەئاسانی لە سەرزەوییەکانی ئێرانی بەرەو رۆژئاوا کۆچیان کرد کە هەندێکیان لەوێ سەرسامی پەیامی مەسیح بوون، بەهەمان شێوەش سەغدییەکانی دانیشتووی وولاتە پێشووەکانی کووشانیش بوودیزمیان پەسەند کردبوو.

لە ماوەی ریسکەکانی بازرگانیدا پێ ناچێت هیچ رێگرێك لەئاردا بووبێت کە بەرگری لە سەغدییەکان بکات، جا گرۆیی هەر نەریتێك بن، لە هەناردنی ئایینە نوێیەکەیان بۆ خودی سەغد یان گەیاندنی بە دوورترین شوێنەکانی رۆژهەلات. هەتا سالّی ٦٥٠ اسقفنشین نەستوری لە سەمەرقەند لەناو دلّ سەغدو یەکێکی تریش لەوپەری کاشغەر هەبوو، بە گشتی زیاتر لە بیست اسقف لە رۆژهەلاتی رووباری جەیحون اسقفیەیان هەبوو[9].

بۆ چەند سەدە زمانی سەغدیی زمانی هاوبەشی ڕێگەی ئاوریشم بوو، بەلاّم هەروەك پێشتر باسمان کرد بازرگانەکانی سەغدیی بەهۆی ئەوەی کە ئالووگۆڕێکی بازرگانی فراوانیان هەبوو زمانەکانی بێگانەشیان دەزانی کە ئەمەش ئامادەی دەکردن کە وەرگێری باشیان لێدەرچێت. بەشی هەرە گەورەی نووسراوەکانی نەستووری کە لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە ناوچەی تاریم دۆزراونەوە بە زمانی سەغدیی نووسراون یان نیشاندەری ئەوەن کە لە رووی نووسراوەکانی سەغدییەوە وەرگێردروان. هەرچەند سۆریانی زمانی عبادی کلسیای نەستوری بوو بەلاّم زمانێکی کە مەسیحیەتی نەستوری پێی لە ئاسیادا بلاّو بووەوە زمانی سەغدیی بوو، سەبارەت بە بوودیزمو مانەویش هەر بەم شێوە بووە.[10]

زۆربەی نووسراوەکانی مەسیحیی لە ناوچەی تاریم لەلایەن چوار هیاتی دۆزەرەوەی ئەلمانی لە خەمرکی تورفان لە (١٩٠٢ــ١٩١٤) دۆزراونەتەوە. مێژووی بەشێکی گەورەی ئەم دەستنووسانە دەگاتەوە سەدەکانی نۆیەمو دەیەم لە پەرستگەیەکی نەستوری لە بویالیق[1] لە باکووری ئەم خەمرکدا. سرودی نزاکار، مزامیر، دۆعا، چەند هەلّبەستێکی *سەردەمی نویێ* بۆ خوێندوە لە ووتارو شرۆڤەکان لەخۆ دەگرن[11]. هەرچەند زۆربەیان لە زمانی سۆریانییەوە وەرگێردراون بەلاّم هەندێ لە روایاتی سەغدیی لە هاوشێوە ناسراوەکانی سۆریانیان کۆنترنو چەند دانەیەکێشیان روایاتی سوریانی ناسراویان نییە[12]. نووسراوەکانی مەسیحی سەغدیی، کە بەرلە سەدەی بیستەم نەناسراو بوون، بە ڕێژەیەکی بەرچاو تێگەیشتنی زاناکانیان لە مانەویەت پتەوتر کرد.

---

[1] . Buyaliq

## ئایینی نەستوری لەناو تورکەکان

تورکە ڕەوەندەکانی ئاسیای ناوەڕاست سەرەتا نزیکەی ساڵی ٥٥٠ هونەری نووسین لە قەشەکانی نەستوری ئێرانی فێربوون و ئەمانە لە هاورێکانی قوباد پاشای لە دەسەلاتکەوتووی ساسانی بوون. گروپێك لەم قەشانە ماوەی حەوت ساڵ لەناو تورکەکاندا مانەوەو زۆربەیانیان تعمید دان. ئەم قەشانە فێری زمانی توکی بوون و بۆ یەکەمجار بەسودوەرگرتن لە ئەلفبای سۆریانی دەستیان بە نووسینی تورکی کرد[13].

سەغدییەکانی ئاسیای ناوەڕاست کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ ڕەوەند تورکەکان ئالوویری بازرگانیان دەکرد کاریگەرییەکی فەرهەنگی ڕێکخراوتریان لەسەریان هەبوو. نووسەری چینی سەردەمی سوییی[١] (٥٨١ـ٦١٨) دەنووسێت ((خودی تورکەکان ساویلکەو کورتبینن و بەئاسانی دەکرێ ئاژاوە بخرێتە ناویانەوە. بەداخەوە ژمارەیەکی زۆری سەغدیی لەگەڵیان دەژین کە زیرەك و زۆرزانن، ئەمانە وانە فێری تورکەکان دەکەن[14].))

ئایینی خۆجێیی هۆزەکانی تورك و مەغۆلی ئاسیای ناوەوە بەگشتی بە شەمەنی دانراوە: بە بەرزو پیرۆز یادی تەنگری[٢] یان ئاسمان خودایان دەکرد، نێرینەیەك بوو کە لەگەڵ زەوی مێنیە هاوسەنگ دەبوو. ڕەفتاری ئایینی بەشێوەی کرداری جێبەجێ دەکرا، ئایینەکان لەگەڵ پێداویستییە سەرەکییەکانی مانەوە وەك ڕاو، دەرمان و زاوزێ پێوەندییان هەبوو. لە ڕێگەی شەمەنەوە دەکرا جیهانی ڕوح لەبەردەست بوو، ئەو ناوبژێك بوو کە پاش چوونە ناو راکشانێکی وجدامیز لەگەڵ ڕۆحەکان پێوەندی دەکرد[15].

---

[1]. Sui
[2]. Tangri

شەمەنەکان تاکوو ئێستاش لە ئاسیای ناوەوە، تەنانەت لەناو جەماوەری بەناو بووزیی یان موسلمان، هەر ماون.

وادیارە هەندێ لە یەکەمین قەشە مەسیحییەکان لەناو تورکەکان، قەشەیان بە شەمەن دادەنا، جەماوەرێکیان پەیدا کردبێت. لە نووسراوەکانی سۆریانی کلیسای نەستوریدا هاتووە کە لە ساڵی ٦٤٤، ئێلیاس[1] مەترانی مەرو، بە سودوەرگرتن لە هێمای خاچ تۆفانێکی قورسی هەورەبروسکە رادەگرێ کە ئەمەش کاریگەری لەسەر پاشای تورکەکان دادەنێت[16]. بەم ڕێچکەوە پاشا هاندار کە ئاینی مەسیحی پەسەند بکاتو رەعیەتەکانیشی ڕێچکەی ئەویان وەرگرت. زانایانی ئایینی کۆنشارای تورك ئاماژە بەوە دەکەن کە راگرتنی تۆفانی هەورەبروسکە بە سودوەرگرتن لە بەردێك بەناوی یەت[2] کاری نەریتی شەمەکان بوو[17].

لە هەمان ئەو سەرچاوانە داهاتووە لە ٧٨١-٧٨٢ گرۆییەکی گەورەی دووهەم لەناو تورکەکاندا روویدا کە لێرەش گرۆیی پاشا بووە هۆی گرۆیی رعایا. لە ئەنجامی ئەم گرۆییە گشتییەی دووهەم، تیمۆتی[3]، پەتریرکی نەستوری بەغدا شوێنی نیشتەجێبوونی مەترانی بنیات کرد کە تایبەت بوو بە راهێنانی تورکە مەسیحییەکان[18]. نووسەرێکی هەمان سەردەم دەڵێ هەواڵەکانی سەرکەوتنەکانی بانگهێشتکەرانی ناو تورکەکان لە نامەیەك بەدەست دەکەوێ کە ((هەندێ لە بازرگانەکانو ئینشابەندەکانی پاشا، کە بەهۆی بازرگانیو کاروباری حکومەتی ئەوەندە دزەیان کردبوو، بۆ مار[4] تیمۆتییان دەنووسی[19].)) سێهەمین گرۆیی گشتی لە ساڵی ١٠٠٧ دا روویدا کە بەپێی ئەم سەرچاوانە ٢٠٠/٠٠٠ تورکو مەغولەکانیش بوون بە مەسیحی. بەم دواییانە

[1]. Elias
[2]. Yat
[3]. Timothy
[4]. Mar

گوومانیان لەوە کردووە کە ئەم گرووپی دووهەم هەمان هۆزی کرایت[1] بێت بەلآم بەدڵنیاییەوە قەبارەی گرۆپیەکە زۆر گەورە بوو. نووسەرێکی یعقوبی[2] سەدەی ناوەڕاست بەرهێبرائوس/ ابن عێبری[3] بەروونی هێنانە ئارای ئەم گرۆپیە بە بازرگانەکانی مەسیحی سەغدیی دەبەستێتەوە. بەپێی ڕاپۆرتی بەرهێبرائۆس، سەرکردەی ئەم رەوەندانە بەشوێن پێگرتنێکی خەیالاوی قدیسێکی مەسیحی لە باکوتی بەفر رزگاریان ببوو. بەرهێبرائۆس دەگێرێتەوە ((کاتێك بەساغی گەێشتەوە خێمەکەی خۆی بانگهێشتی بازرگانە مەسیحییەکانی کرد کە لەوێ بوون‌و دەربارەی دۆزی ئیمان گفتوگۆی لەگەڵیان کردو ئەوانیش لەوەلآمدا ووتیان ئەم کارە لە ڕێگەی تعمیدەوە نەبێ ئەنجام نادرێ.)) مەتران بە بیستنی ئەم هەواڵە قەشەیەك‌و شماسێکی هەنارد کە تعمیدە پێویستەکان ئەنجام بدەن‌و پەروەردەیان بکەن[21].

مەسیحییەتی نەستوری لە سەدەی دوازدەهەمدا بە پشتیوانی‌و پاراستنی قەراختاییەکانی مەغول شەپۆلێکی نوێی خۆشەویستی‌و ڕێزی تەجروبە کرد. نزیکەی ۱۱۸۰ ئێلیاسی سێیەم، بەتریرکی نەستوری، مەتران نشینێکی نوێی لە کاشغەر دامەزراند کە اقتدارەکەی هەتا ناوچەیەك بەناوی حەوت ئاوو (تورکی: یەتی سۆ[4]، رووسی: سێمیرچیە[5]) لە بەشی باشووری قەزاقەستانی ئێستا درێژەی هەبوو.

هەتا سپێدەی سەردەمی مەغۆل بەدڵنیاییەوە مەسیحییەت لەلای هۆزەکانی ستێپس یەکێك لە بەرجەستەترین ئایینە گەورەکان بوو. ئەوەی کە

---

1. Kerait

2. Jacobite لەرووی ناوی Jacob Baradaeus، کلیسای یعقوبی یان مۆنۆفیزی یان کلیسای ئۆرتۆدۆکسی شام. و.

3. Bar Hebraeus

4. Yeti Su

5. Semirechye

مەسيحييەت لەلای ئەوان چ واتايەكی هەبووە بابەتێكی ترە. سەرچاوەكان نيشانی دەدەن كە تاقيكردنەوەی سەرەكی بوونە مەسيحی تعميد بوو، جگە لەم ئايينە دابودەستوورييە، زانيارييەكی ئۆتۆ لەدەستدا نييە دەربارەی ئەوەی كە ئەم ڕەوەندانە چۆن ئەركەكانی ئايينی مەسيحييەتيان ئەنجام دەدا. هەندێ لە هۆزەكان خێوەتی تايبەتيان بۆ نوێژكردن بووە كە دەگوازراوە، بەڵام كۆمەڵە ڕاپۆرتێكی زۆر نيشانی دەدەن كە زۆربەی ئايينەكانيان تەنيا شێوەيەكی بەمەسيحی كراوی هەمان كردارە نەريتيەكان بووە، وەك خواردنی شيری ترشاوی ماديان كە پيی دەووترا قەميز[1].

دەكرێ بير لەو بوارە بكرێتەوە كە هۆی دڵبەستراوی ڕوەندەكان بە مەسيحييەت چی بوو. ئايا تەنيا بيعتێك بوو كە بە هێزی "شەمەنی" ڕاسپێردرابوو كە گەورەترين لێهاتووييەكانی لەخۆی نيشان دابوو؟ يان بيرۆكەی دروستكردنی پێوەندی بوو لەگەڵ بازرگانەكانی مەسيحی لە ڕێگەی ئاوريشم؟ ئەگەری هەردوو بارەكەی لە ئارا دايە.

## ئايينی نەستوری لە چين

چينييەكان كە يەكێك لە كۆنترينو گەورەترين شارستانييەتەكانی جيهانيان بە ميرات پێگەيشتووە، لەم بوارەدا كە فەرهەنگەكانی تر لە حەزی خۆيان بە كەمتر دابنێن مێژوويەكی دوورو درێژيان هەيە. بەڵام بەپێچەوانەی ئەم خووە، هەندێ لە يەكەمين خاقانەكانی سلسلەی تانگ (بەتايبەت سيوئان زۆنگ[2]، كە لە ٧١٢-٧٥٦ پاشايەتی كرد) بۆلای شتی بێگانە ڕادەكێشران كە هەندێجار لە شێتايەتی دەچوو[22]. لە وەها كەشوهەوايەكدا بوو كە نەريتەكانی بێگانەی بازرگانەكانی هاتوو لە ڕۆژئاواوە بە شێوەيەكی نائاسايی وەرگيران.

---

[1] . Kumiz

[2] . Hsuan- Tsung

لە سەدەی حەوتەمدا بازرگانەکانی سەغدیی‌و ئێرانیی‌و بانگهێشتکەرەکانی مەسیحییان هێنایە چین. لەراستیدا چینییەکان سەرەتا وایان دەزانی ئێران لانکەی مەسیحییەت بوو و بە ((ئایینی ئێرانی)) ناویان دەبرد،و ئەمەش زیاتر لە سەد ساڵ پێش ئەو کاتە بوو کە لە ناوەندەکانی سەدەی هەشتەم چاکسازی لە راپۆرتەکانیاندا بکەن. لە فەرمانێکی پاشایەتی سەردەمی تانگ لە ٦٣٨ دا هاتووە کە قەشەیەکی ئێرانی بەناوی ئالۆپێن[1] سێ ساڵ پێشتر گەیشتبووە دربار[23]. ئالۆپێن لەگەڵ خۆی چەند پەرتووکێکی پیرۆزی هێناو وەریگێرا سەر زمانی چینی تاکوو خاقان لێیان تێبگات. خاقان تاییدی کردن‌و مرجعیتی بانگهەشەی ئایینەکەیانی لە تەواوەتی ئیمپراتورەکەدا پێبەخشین. بەگشتی ئەم رووداوە نیشانەی ناساندنی مەسیحییەت بە چین دادەنێن.

مۆنیومێنتێك[2] کە لە ٧٨١ لە چانگ ئان (سیان)، پایتەختی تانگ، سازکرا خەزێنەیەکی زانیارییە دەربارەی سەدوپەنجا ساڵی یەکەمی کۆمەڵەی نەستوری خۆجێیی. لە سەرانسەریدا ناوەکانی ئێرانی‌و ئاسیای ناوەڕاست دەبینرێت کە نیشاندەری دارمانی نەبراوەی رۆژئاواییەکانی رێگەی ئاوریشمە. یەکێك لە سەرنجراکێشترین بەشەکانی مۆنیومێنتەکە کۆمەڵێك زانیارییە دەربارەی رەبیانێك بەناوی ئادام کە لە وەرگێرانە چینییەکەدا هاوکاری کردبوو: دەڵێن لە وەرگێرانی رسالەیەکی بووزیشدا هاوکاری کردووە. ئادام هیچ زمانی هیندی نەدەزانی هەربۆیە دەبێت ئەو نووسراوە بووزییە بە زمانی سەغدیی نووسرا بێت کە بە ئەگەرێکی زۆر زمانی خۆجێیی ئەو بووە[24].

لە رسالەیەکی سەدەی حەوتەمی چینی بەناوی *منقبت تثلیثی* پیرۆزدا هاتووە کە پۆل پۆلیۆ، چینناسی فەرەنسی، لە سەردەمی دۆن هۆئانگ پەیدای کردووەو هەتا کۆتاییەکانی سەدەی هەشتەم نزیکەی سی بەرهەمی نەستوری

[1] .A-lo-pen
[2] . Monument

وەرگێردرایە سەر زمانی چینی. بەڵام پێ ناچێت نەستورییەکان توانیبێتیان نوێئاایینی چینی زۆریان کۆکردبێتەوە. ئەوانیش خۆیان لە بارودۆخێکی هاوشێوەی بوزییەکاندا دەبینی بەو واتایە کە دەبوایە لەگەڵ ئەو چەمکو بەهایەنە کە بۆ چینییەکان بێگانەو تەنانەت ناخۆشیشە، پێوەندی دروست بکەن. پێ ناچێت نەستورییەکان، بە پێچەوانەی بوزییەکان، توانیبێتیان پەیامی خۆیان لەگەڵ سلیقەکانی چینی سازگار بکەن.

هەربۆیە پێناچێت ئەمە بەهۆی هەوڵ نەدانی ئەوان بێت چونکە بە رسالاتەکەیان دەووت (سۆترا[1]) و بە قدیسان مەسیحیان دەووت (بوودا)، هەتا کاتی بنیاتنانی مۆنیۆمێنتی سیان، ئایینی نەستوری لە چین بە ((ئاایینی درەوشاوە)) (چینگ چیائۆ[2]) بەناوبانگ بوو. لە لایەکی ترەوە، ناوی خودی رزگارکەری مەسیحی، کە بە زمانی سۆریانی یشۆ[3]یە، لە ئاخاوتنی ئەو سەردەمەدا وەك چەمکی (مشکێکی کە دەجوولێت) دەبیسترا.

هەربۆیە پێدەچێ زۆرترین بەشی کۆمەڵە نەستوری چین ئاوێتەیەکە بووبێت لە بێگانەکان، باردودۆخی یەهودییتو ئایینی زەردەشتیش بەهەمان شێوە بوو. هەر سێ نەریتەکە وەك ئیمانی بازرگانەکانی گەریدە هێنرانە چینو چارەنووسیان پێوەندی بە چارەنووسی خودی کۆمەڵەی کۆچەری بازرگانەکانەوە هەبوو.

سلیقەی شێتانەی دربارێ تانگ بۆ خەڵكو بیرۆکەو شتەکانی بێگانەش رێگەی زیادبوونی شیادی دینیی ئاوەلا دەکرد. زۆربەی رووخسارەکانی ئاایینی کاریان تەنیا فێرکردنی پەیرەوە ئایینییەکان نەبوو بەڵکو زۆرتر سەرقاڵی کارامییەکانی جیهانی بوون. مەسیحیو مانەوییەکان بەتایبەتی بەهۆی

[1] . Sutra
[2] . Ching Chiao
[3] . Yishu

ئەستێرەناسی و پزیشکییەوە جێی متمانە بوون کە بۆماوەی نەریتەکانی بین النهرین بوو.

سەرچاوەیەکی چینی ئاماژە دەکات قەشەیەك هەبوو خاوەنی وەها هێزێك بوو کە دەیتوانی ((ورد بخوێنێتو خەڵك بکوژێتو دووبارە زیندویان بکاتەوە))، ئاشکرایە کە کارەکەی هینپۆتیزم بووە. ڕەببانێکی بوونیی خەڵکی هیندی بەوناوی نارەیانسڤامین[1] ئیدیعاکەر بوو کە تەمەنی دووسەد ساڵەو اکسیری نەمری هەیە. کیمیاگرانی دائۆیی لە سەردەمەکانی کۆنەوە دەربارەی وەها مەعجونێك زۆر خیالبافییان کردبوو، بەڵام دەرکەوت مەعجونەکانی ئەم هیندییە کاریگەرییان نییەو لە دربار دەریان کرد[25].

بناکانی ئایینی زۆرتر "ناوەندەکانی فرهنگی"یان لەئەستۆ بوو کە شوێنکەوتووانی بێگانەی ئەو ئایینەو هەروەها خەڵکی خۆجێیی دەیانتوانی لەوێ لەگەڵ یەکدی کۆببنەوە. بۆ نموونە لە پەرستگەکانی مەزداییەکان لە لەن چو[2] و لویانگ بەردەوام شعبدەبازی ئەنجام دەدرا کە جەماوەرێکی زۆری بۆ ئەو شوێنە رادەکێشا. هەرچەند لە سەردەمی سیۆئان زۆنگ ئاشکرا پەرەیان بەم جۆرە کارانە دەدا، بەڵام سەرکردەکانی چینی کە ترسیان لە بیگانە هەبوو ئەم جۆرە دزەکردنی بێگانەکانیان مەترسیدار دەزانی[26].

لە ساڵی ٨٤٥ ووزۆنگ[3]، فەغفوری تانگ کە لایەنگری دائۆییزم بوو، ڕایگەیاند کە هەموو ئایینەکانی بێگانە نایاسایین (تەنانەت بوودیزمیش کە ئیتر ئاستەم بوو بە ئلیینێکی بێگانە ئەژمار بکرێت)، و ناچاری کردن بچنە پاڵ ئایینەکانی ژێرزەوینی (واتە بە نهێنی جێبەجێ بکرێن. و.). لە ساڵی ٩٨٠ ڕەببانێکی نەستوری لە بەغدا بە نووسەرێکی موسلمانی (ابن ندیم) ووت کە

1 . Narayansvamin
2 . Lan-Chow
3 . Wu-Tsung

كليسا حەوت ساڵ لەمەو پێش نارد بوویە چین كە ((كارەكانی ئایینی مەسیح سامان بداتو ڕێكی بخات))، بەڵام ئیتر مەسیحییەت لەو وولاتەدا نەمابوو[27]. گویا مەسیحییەت لە چیندا ناپدید ببو تاكوو سێ سەدە دواتر لەژێر دەسەڵاتی مەغۆلەكان دووبارە بە چین بناسێندرێتەوە.

## مانی

بین النهرین لە سەردەی سێیەمی زایینیدا وولاتی زیادبوونی فرقەهای ئایینی بوو. ماوەیەكی زۆر ئیمپراتورییەكانی یۆنانیو ئێرانی لەسەر ئەم ناوچە بێلایەنە بەشەر هاتن. ئەم ناوچە ژوانەگەی ئەو فەرهەنگانە بوو كە هەموان نوێنەریان تێدا هەبوو.

ئیسرائیلیەكان ماوەی هەزار ساڵ لەگەڵ مەزدیسنانی ئێرانیو خەڵكی خۆجێیی لەو شوێنەدا ژیابوون، و باوەری ئایینی سەرەتاییان لەناو صابئین ماوەتەوەو ئەمانە بەهۆی زانینی زانستی ئەستێرەناسی بەناوبانگن. لەو سەردەمەدا فرقەهای مەسیحی دۆناودۆنیش لەوێ بوون، هەروەها فرقەهای تعمیدی گنوسی دوورەگەی یەهودی ـ مەسیحیش.

لە یەكێك لەم كۆمەڵانەی یەهودی مەسیحییەدا، لەوانەیە مغتلسەی الخسایی[١] یان مەندایی بووبێت كە پێغەمبەر مانی ساڵی ٢١٦ لە دایكو باوكێكی خانەدانی ئەشكانی لەدایك بوو[28]. مانی لە ژینگەیەكی ئایینی ڕیاچتكشدا گەورە بوو كە تێدا بیرۆكەكانی مەسیحیو یەهودی بوارێكی گنووسی دوولایەنەی هەبوو. لە تەمەنی دوانزە ساڵیدا یەكەمین وحیو دووهەمینیان لە بیستوچوار ساڵیدا پێی گەیشت. مانی پاش وەحیی دووهەم ڕۆڵی پیغەمبەری گرتە ئەستۆو بۆ بانگەشەی پەیامەكەی بەرێ كەوت.

---

[1] . Elkesaite

مانی لە یەکەمین بانگهێشتی خۆیدا بەرەو سەرزەوییەکانی کووشانی بۆ باکووری رۆژئاوای هیند سەفەری کرد کە لەو سەردەمەدا یەکێك لە ناوەندەکانی گەشەکردنی بوودیزم بوو، و کاریگەرییەکانی بووزیی لە شکل گرتنی بیرۆکەی ئایینی مانیدا گرنگ بوون. دۆنادۆن/ تناسخ بوو بە باوەڕێکی مانەوی، قەوارەی چواربەشی کۆمەڵەی مانەوی (هەڵبـژێردراوەکان/ ئایینهێنەرانی[1])و شوێنکەوتە غەیرەببانەکان (گوێگران) (نیوشایان، نغوشایان، نیوشندەکان) کە پشتیوانیان لەو گروپە دەکرد، دابەش ببوو، پێدەچێ ئەمە لەسەر سەنگەی بووزیی بنیات نرا بێت.

مانی کاتی گەرانەوەی بۆ ئێران توانی بەلایەنی کەمەوە دوو شازادەی دەرباری نوێی ساسانی بێنێتە سەر دینەکەی خۆیو ماوەی چەندین ساڵ لە ریزی ملازمانی خودی شاپور بوو. مانی ئاواتخواز بوو ئایینە نوێیەکەی ببێتە ئایینی فەرمی پاشایەتی نوێ، بەداخەوە رەقیبەکەی لە دربار، واتە کارتێری مۆبێدیش، وەها خەیاڵێکی لە سەردا بوو.

لە سەردەمی شاپوردا بە فەرمی پشتگیری لە مانی دەکراو دەپارێزرا. لە ئەنجامدا توانی شوێنکەوتەکانی بۆ هەموو قوژبنەکانی هەرێمی ساسانی بنێرێت هەتا پەیڕەوەکەی بڵاو بکەنەوە. ئایینی نوێ بەخێرایی لە سەرانسەری ئەو سەرزەوییەدا کۆمەڵێك جەماوەری پەیداکرد. نزیکەی پەنجا ساڵ خۆشەویستی شهودی مانی گەورەترین هەرشە بوو لەسەر مرجعیتی مۆغەکانی نەریتی کە کارتێر لە سەرووی هەمووانەوە بوو.

هەرکە بەهرامی یەکەم لە ساڵی ٢٧٣ دا لەسەر تەختی ساسانی دانیشت بەخت لە مانی هەڵگەراوە.بە فەرمانی شاو بە تحریکی کارتێر لە ساڵی ٢٧٦

[1] . بە زمانی ئینگلیزی (elect)و بە زمانی سەغدیی (ئایینهێنەرانی)، بە زمانی عەرەبی مجتبین. و.

مانیـان دستبەسـەر كـرد كـە هـەوڵێ دەدا بـەرەو پـارت/پارتیـا ڕابكـات. ئـەوە سەرنجراكێشە كە پاشا لە دوایین دانیـشتنی لەگـەڵ مـانی نـەك بـەهۆی بیرۆكـە ئایینییەكەی بەڵكوو لەبەر ئـەوەی كـە لـە بەئـەنجام گەیانـدنی ئەركـەكانی وەك پزیشكێك كـەم تەرخـەمی كـردووە: ((تـۆ بـە كـەڵكی چـی دێیـت، چـونكە نـەك دەچیتە شەركردن نەك ڕاوكردن؟ بەڵام لەوانەیە بەهۆی پزیشكیو دروستكردنی داو و دەرمان پێویست بیت، و تو تەنانەت ئەم كارەش ئەنجام نادەیت!)) مانی لەسەر هەمان بنەما بەرگری لە خۆی دەكات: ((كەسـانێك زۆر هـەن كـە مـن لـە نەخۆشی رزگارم كردوون. زۆر كەس هەیە كە جۆرەهـا تـاوو لـەرزم لێیـان دوور خستۆتەوە. خەڵكێكی زۆرم زیندوو كردۆتەوە كە لە سەرە مەرگدا بوون[29].))

لەم گفتوگۆیـە دەردەكـەوێ كـە بـەهای پێـشەوا ئایینیـەكان زیـاتر بـەهۆی كارامـەیی پزیـشكیان بـووە نـەك وەك چارەسـەكەری دەروون، و ئەمـەش لێكدانەوەیەكە كە لەهەر جێگەیەكی تر لە درێژایی مێژووی پیشامدرن جەختی لەسەر دەكرێت[30].

دوابەدوای ئەم مشتومڕە، پاشا پیغەمبەر دەخاتە زیندان، كـە پـاش چـەند مانگێك لە تەمەنی شەست ساڵی هەر لەوێ كۆچی دوایی دەكات.

## شتێك لە هەر كەسێك: نەریتێكی جیهانیی نوێ

پەیامی مـانی بـۆ زۆر كـەس سـەرنجراكێش بـوو چـونكە هـەوڵی دەدا ((بـە زمانی ئەوان قسە بكات.)) ئەو ئـەم كـارەی هـەم زارەكـیو هـەم مجـازا ئـەنجام دەدا، واتـە بیرۆكـەكان، سـەمبۆلەكانو زاراوەكـانی ئـایینی لەهـەر نەریتێكـەوە وەردەگـرت. كاتێـك سیـستێمەكانی ئـایینی بەشـێوەیەكی كاریگـەر پـەرەیان دەسەند كە توانیبێتان ژهنیتو جیهانبینی كەسانەی مەبەسـتیان وەرگرتبێـتو پەیامێكی نوێیان لێ دروست كردبێت كە تەنیا بگەن بە (كمـال)ی ئـەو راسـتییە

کۆنــە، کــە لەگــەڵ تێگەیــشتنی نەریتخوازانــەی خــەڵك گوونجــاو بێــت. مــانیو فێرخوازەکانی مامۆستای بێوێنەی ئەم هونەرە بوون.

چــونکە مــانی لــەو ســەرزەوییانەدا لــەدایك ببــوو و پــەروەردە کرابــوو کــە شارســتانیەتەکانی ئاســیاییو مەدیتەرانــەیی لــە درێــژایی چــەند ســەدە بەیــەك گەیشتبوون، هەرلە منداڵییەوە پابەندی بیروباوەڕی ئــایینی هێتێــرۆدۆکس[1] بــوو کــە لــە ســەرچــاوە جۆراوجۆرەکانیــان وەرگرتبــوو. سیــستیمەکەی ئــەو وەهــا نەریتــەکانی ســامیو ئێرانــی لەگــەڵ یەکدی تێکــەڵاو دەکــات کــە تــاکوو ئێــستا زاناکان لەو بارەوە لە مــشتومڕ دان کــە ســەرچــاوەی بنــەرەتی راســتەقینەکەی کامەیە[31].

بەگــشتی مانەوییــەت بــە سیــستێمێکی گنووســی دەزانرێــت[32]. خاســتگاهی ئایینی گنووسی نادیارە بەڵام لەوانەیە مێژووەکــەی بگەرێتــەوە ســەردەمێکی بەرلــە چــاخی زایینــی. ئــایینی گنووســی روانگەیــەکی دووفاقــە لــە جیهــان بــە سەلمێنراو دەناسێت کــە تێیــدا ((چــاکە)) لەگــەڵ گیــان یەکسانە و ((خــراپ)) لەگەڵ مادە.

گنووسییەکان لایەنگری لێکدانەوەکانی باگنی بوون کە لە رێگــەی زانستەوە دەگاتە رزگاریو ئەم امکانــە بــۆ هەڵبــژاردە رۆشــنبیرەکان ســەرنجراکێش بــوو. تێروانینێکــی راســتەقینە بــوو نــەك تــەنیا ئــایینی، لــەناو مەســیحی، یهــودیو گروپــەکانی تریــشدا گنووســتێکی تێــدا هــەبوو. نوێنــەرانی پرۆســەی بنــەمایی هەمیشە لێکدانەوە شاراوەکانی گنووسییەکانیان وەك هەرەشــەیەك زانیــوە بــۆ دروست بیرکردنەوە و بەردەوام بە نوێگەریان دادەنان.

[1]. Heterodox

مانی خۆی وەك پیغەمبەرێك دەناسێنێت کە لە مێژووی مرۆڤایەتی دا دوابەدوای زەردەشتو بوداو عیسا دەگاتە کمال. کیهانشناسی ئەو ژمارەیەکی زۆر لە رووخسارە ئێرانییەکان وەك زۆروان، ئورمەزد (ئەهورامەزدا)، شەیتان (ئەنگرەمەینیو) و گیانە جۆراوجۆرەکانی چاکەو خراپە دەگرێتوو رەنگی لێکدانەوەکانی گنووسییان لێدەدات، ئەو گیان لەگەڵ رووناکی (کە لە شێوەی زۆروان، خودای مەزن نیشان دەدات)و مادە لەگەڵ تاریکی یەکسان دادەنێت. جیهان بە مەڵبەندی نەبەردی چاکەو خراپە دەزانیو چاکە، کە ژرات رووناکی نیشاندەری ئەون، هەوڵ دەدن تاکوو لە مادەی خراپ کە گیرۆدەی بوون، رزگاریان بێت.

بەرچاوترین رووخساری ئۆستورەناسی مانەویی، عیسایە. مانی لە تەواوی ژیانیدا خوێ بە "حواری عیسا مەسیح" دەزانی. بەلام عیسای مانی سێ رووخسار بە خۆی دەگرێت: عیسای مرۆڤ، عیسای گیانی زیندوو، عیسای درەوشاوە. یەکەمیان عیسای مێژوویی مەسیحییەکانە، بەلام مانی مردنی ئەو لەسەر خاچ بە توهم دادەنێ. دووهەم (عیسای رەنج چیژ[1])ە، هێزێکی چاکەیە کە لە هیاتی ژراتی رووناکی لە هەموو شتە زیندووەکاندا کەوتۆتە داوەوە. چەمکی عیسای درەوشاوە، کە لە مەندائیەکان وەرگیراوە، تجسمی رووناکییە کە چاوی بە یەکەمین مرۆڤ (مرۆڤی رابردوو/ هۆرمۆز دەبەغ) کەوتووە و لە اخرزماندا وەك رزگارکەر دووبارە دەگەڕێتەوە.

پەیرەوی مانی ئەوە بوو کە زاووزێ خراپەیە، چونکە لە بەرەی دواتری ژراتی رووناکی کە لە تاکدا یەخسیرن لەناو بەرەکانی دواتریدا زیاتر دابەش دەبن. هەربۆیە، ((ئایینهێنەرانی)) دەبوایە کفنفس بپارێزن. تمثیلی مانەوی خوارەوە دەربارەی نجیب زادەیەك کە تازە هاوسەرەکەی مردبوو (گێراوەیەکی تری ئەمە دەتوانین لە مەسیحییەتی سەرەتاییو پاشان لە ئیسلامدا ببینین) ئەم

[1] . Jesuo patibilis

خۆراگرییە لە بەرامبەر شهوتو هەروەها فریوی جیهانیی کە سەمبۆلەکەی سەرخۆشییە، وێنا دەکات:

ئەو جنازەکەی بینیو لەگەڵ خۆیدا ووتی ((ئەمە هاوسەری منە.)) چووە گۆرخانەو لەپاڵ جنازەکە ڕاکشاو چونکە سەرخۆشو نادان بوو، دەستی لە دەوری جنازەکە ئالاند، بەبێشەرمییەوە لەگەڵی جووت بوو. جنازەکەی بەهۆی هەولی ئەوەوە تەقی. خوێنو چلکو شتی قێزەونو ناشرینی جەستە دڵهەلهێنەرەکە ڕژایە دەرەوەو کەوتە ئەو گۆڕە. سەرتاپای جەستەو جلی نجیب زادەکە خوێناویو چلکاوی بوو. و ئەویش لەم باری سەرخۆشییەدا بەخۆی دەووت ((چیژم وەرگرت.))

بەیانی کە داهاتو خۆرهەلات، سەرخۆشی لە سەری نجیب زادەکە پەری. لەخەو ڕابوو. سەری بەرزکردەوەو خوی لە گۆرخانەکەدا بینی کە جنازەیەك لەسەر سینگییەتیو چلكو خوێنی لەبەر دەرواتو پیسایيەکی توقێنەر هەموو جێگایەکی داگیرکردووە. سەیری خۆی کردو سەرتاپای خۆی بینی کە بە خوێنو پیسایی داپۆشراوە. ترس کەوتە گیانی، هاوارێکی بەرزی کرد. هەرچەندی زیاتر هەڵدمات زۆرتری هەڵیدەهێنا. پاشان ئەو جلەی کە پێشتر ئەوەندە خاوێن بوو، دردری کردو فرێی داو درێژەی بە هەلاتندا. گەیشتە ئاودانێکو خۆی هەڵدا ناویو خۆی شوردو پاك کردەوە....[٢٣]))

بەلآم ستراتیجیەتی بانگهەشە ڕێخراوەکەی مانی زۆر زیاتر بوو لەوەی کە تەنیا چیرۆکو سەمبۆلە ئایینییەکانی هاوچەرخو واتاو لێکدانەوە نوێیەکان پەسەند بکرێ. لە زۆربەی ئایینەکاندا، پەرتووکە پیرۆزەکان بەر لەوەی بنوسرێن، ماوەیەکی زۆر لەناو صندوقی سینگەکاندا دەپارێزران‌و دەکەوتنە بەر هەرەشەی لەناوچوون‌و تحریفیان بەدەستی مرۆڤەکان. مانی کە ئاگاداری ئەم مەترسییە بوو بۆخۆی وحییەکانی نووسییەوە، بەلایەنی کەمەوە حەوت بەرهەمی کانوونی /قانونی هێنائاراوە کە بناغەی پەرتووکی پیرۆزی ئایینی ئەوی پێك دەهێنا.

هەروەها مانی زۆر بڕاوی بە هێزی وێنەکان هەبوو بۆ گەیاندنی ڕاستییەکانی ئایینی. (لەوانەیە ئەمە تاڕادەیەك امیتازیك بووبێت بە سودی ئەو ڕاستییە کە خوێندن‌و نووسین گشتگیر نەبوو.) ئەو کە نیگارکێشکێکی خاوەن قریحە بوو بۆخۆی پەرتووکە پیرۆزەکانی وێنەدار دەکرد[١]. کارامەیی ئەو وەك وێنەکێشێك ناوبانگێکی بۆ دروستکرد کە تاڕادەیەك سەرسورهێنەرەو بۆتە بۆماوەترین میراتی ئەو و تەمەنی لەو ئایینە درێژتر بوو کە بنیاتی نابوو. تاکوو ئێستا، کە باورە نوێیەکەی لە بیر نەچۆتەوە، لە جیهاندا وەك گەورەترین نیگارکێشێك باسی دەکەن کە جیهان بە خۆیەوە بینیویەتی[34٢].

---

[1]. لەلای ئێمە پەرتووکەکانی مانی بەم ناوانە ناسراون: شاهپورگان، سفر الجبابرە، کنزالاحیاء، سفر الاسرار، فرقماطیا یان بنگامیك، ئێنجیلی زیندوو یان ئێنجیلی مانی کە بە ئەرژەنگ (یان ئەرتەنگ، ئەردهەنگ). (لغت نامە دهخدا، ذیل مانی). و.

[2]. همە تافت از پرنیان روی خویش    نگاریست گویی از ارتنگ مانی    (فرخی)

سراهاش چو ارتنگ مانوی پرنقش    بهارش چو دیبای خسروی بەنگار    (فرخی)

یکی همچو دیبای چینی منقش    یکی همچو ارتنگ مانی مصور    (فرخی)

شنیدم کە مانی بە صورتگری    ز ری سوی چین شد بە پیغمبری    (نظامی)

بە تیشە صورت شیرین بر ان سنگ چنان بر زد کە مانی نقش ارژنگ    (نظامی)

اگر باور نداری رو از صورتگر ژین پرس    کە مانی نسخە می خواهد از نوك کلك مشکینم    (حافظ)

ئایینهێنــەرانی مانــەوی بــوون کــە وەك واعقــە گەرۆکــەکان بەرپرســیاریتی بڵاوکردنەوەی ئەم ئایینەیان گرتە ئەستۆو لەم ڕێگــەدا ڕەببانــەکانی مەســیحیو بووزییەکان کردە سرمشقی خۆیان. ئایینهێنەران بــە دەبــەرکردنی ردای ســپیو پێداگری لەسەر ڕووەکخۆری بەدیار دەکــەوتن. دەبوایــە زۆر ئاگــاداربن گــیرۆدەی هیچ کارێك نەبن کە اصولی ئایینەکەیان نقچ بکاتەوە تەنانەت ئەگەر ئــەو کارانــە بۆ مانەوەیان لە ژیان پێویست بێت. ئایینهێنــەرانی بــوودیزم تەنانــەت زیــاتر لــە ڕەببانەکانی بووزییش بە تەواوەتی هەڵواســراوی (نیوشــاییەکان) بــوون چــونکە پێداویستییەکانیان بۆ دابین دەکــردن. ئــەوان تەنانــەت نەیاندەتوانی خــواردنی خۆشیان ئامادە بکەن، چونکە بروایان وابوو بەم کارە زیان بــە ژراتــی ڕوونــاکی دەگەینن کە لە هــەموو گیانلەبەرەکانــدا ازجملــە لــە ڕووەکەکانــدا هەیــە، بــەر لــە خواردن دەبوایە بڵێن (من ئەوەم نەخستۆتە سەر ئاگر، کەسێکی تر ئەمــەی بــۆ من هێناوەو من بەبێ ئەوەی هەڵەیەکەم کردبێت، خواردوومە[35].))

## مانەوییەت لە ڕێگەی ئاوریشم

ئــایینی مــانی هــەر لــە کــاتی ژیــانی خــودی مــانی، بەرەبــەرە لــە جیهــانی مەدیتەرانــەدا بــاوو گشتگیر بــوو، هەرچــەند ئیمپراتــوری ڕووم بــەر لــەوەی کــە بەفەرمی ببێتە مەسیحی، دەستی دابووە ئازاردانو سەرکوتکردنی مانەوییــەکان بەم بیانووە کە مانەوییــەکان لایــەنگری ئــایینی بێگانــەی ئێرانــی بــوون. هەرکــە مەسیحییەت بوو بە ئایینی حکومی، مانەویەتیان بــە هەرشــەیەکی گــەورەتریش ژمــارد، چــونکە ئیدیعاکــەر بــوو کــە ڕووخــساری بــاگنی، کەواتــە ڕووخــساری "ڕاســـتەقینەتر" خـــودی مەســـیحییەتە. هەرچـــەند مانەوییـــەت ڕووبـــەڕووی بێبەزییانــەترین ســەرکوت بــوو بــەڵام بیرۆکــەکانی دووفاقــەو دژەدونیــایی کــە پڕۆاکی مانەوییەت بوو، لە ئەورووپا ماوەو لە ڕێگەی بزوتنەوەی کاتــار[1]/ کاتــاری

(هەمووی نمونەکان لە لغت نامەی دهخدا). و.

[1] . Cathar

لە پرۆڤانس[1]و بوگۆمیلەکان[2] لە وولاتانی بالکانەوە چووە ناو سەدەکانی ناوەڕاست.

گەشتی بەرەو رۆژهەلاتی مانەوییەت باشتر بوو، بە لایەنی کەمەوە کە لە سەرەتادا وابوو. ئەم ئایینە لە چەندین دەیەی ژیانی مانیدا پشتیوانی لیّ دەکرا کە لەو ماوەدا لە درێژایی ڕێگەی ئاوریشم بەرەو ئاسیای ناوەڕاست لەوبەری رووباری جەیحون پەرەیسەند. لێرەش سەغدییەکان بوون کە رۆڵێکی گرنگیان لەسەر شان بوو بۆ گوازتنەوەی ئەم ئایینەو پایتەختەکەیان سەمرقەند بوو بە ناوەندی کۆمەڵەیکی سەرەتایی‌و چالاکی مانوی.

سەغدییەکان بە یارمەتی وەرگرتن لە کارامەییەکانی زمانەوانیان نووسراوەکانی مانەوییان لە زمانی سۆریانی‌و پارسی ناوەڕاست‌و پارتییەوە وەرگێرایە سەر زمانی سەغدیی‌و دواتر بۆ تورکی‌و لە ئەنجامدا بۆ چینی. هەتا کۆتایی سەدەی شەشەم مانەوییە سەغدییەکان ئەوەندە بەهێز ببون کە سەربەخۆییان لە ئاراکیگۆس[3]، قۆچکەی کلیسا لە بەغدا، راگەیەنن‌و بەرەیەك بێننە ئاراوە کە چاوەروان دەکرا زۆرتر لە سەدەیەك درێژە بخایەنێت.

داعیەکی مانەوی ئێرانی بەناوی مێهرئورمەزد لە کۆتاییەکانی سەدەی حەوتەم سەفەری کردە چین[37]. کۆمەڵەیەکی لە دەور کۆبووەوە کە یەکێك لەوان وۆ[4]، ئیمپراتوریس چۆ[5]، بوو و نووسراوێکی پیّ هەدیە کرد بەناوی سۆترەی دوو اصل ((یان دوو ریشە)) کە بوو بە بەناوبانگترین پەرتووکی مانەوی لە چین[38].

---

[1] . Provence
[2] . Bogomil
[3] . Archegos
[4] . Wu
[5] . Chou

ئەم بانگهێشتە سەرکەوتووە هەستی ئیرەیی بووزییەکانی درباری وروژاندو دەستبەجێ ناکۆکییان لەگەڵ ئەم پەیڕەوە نوێیە کرد. پاش ساڵی ٨٢٠، بووزییەکان ئەم چیرۆکەیان خستەسەر زمان:

> وۆکوچیۆ[١]، پیاوێکی خەڵکی یۆئە[٢] کە لە چانگ ئان نیشتەجێ بوو... جێبەجێکردنی ئەرکەکانی مانەویەتی دەست پێکردو وانگی هاوسەریشی ئەوی کردە سرمشقی خۆی. پاش ساڵێك وانگ لەناکاو مرد. پاش سێ ساڵ هاتە خەوی مێردەکەیو ووتی ((من بەهۆی بیروباوەری هەڵەمەوە محکوم بووم کە ببمە مارو لەژێر استویەیەکم لە هۆئانگ زە پۆ[٣]. بەرەبەیانی سبەینی دەمرمو حەزدەکەم داوا لە ڕەببانەکان بکەیت بچنە ئەو شوێنەو سورەتی *ئەلماسم* بۆ بخوێنن تا شێوەکانی تری ڕەنج لە من دوور بخەنەوە.[٣١]))

مێرد داواکاری هاوسەرەکەی هێنا دیو پاش ئەم ڕووداوە دووبارە بووەوە بووزییەکی باش. سەرکردەکانی تانگ پاش گەڕانەوەیان لە ساڵی ٧٠٥ بەگومانەوە سەیری مانەویەتیان دەکرد. فەرمانی ساڵی ٧٣٢ فەغفور دەڵێ دەتوانرێ بانگەشەی ئەم ئایینە لەناو غیری چینیەکاندا بکرێ. هۆیەکی کە بۆ ئەم محدودیتە هێناویانەتەوە نیشان دەدات کە دەستی بووزییاکان لەم کارەدا بووە: ((پەیڕەوی مار مانی لە بنەڕەتەوە عقیدەیەکی هەڵەیەو لە ڕووی فێلو کەڵەکەوە گریمان لەسەر ئەوە دادەنێ کە لە قوتابخانەکانی بوودیزمەو بەم

---

[1] Wu K'o-Chiu
[2] . Yueh
[3] . Huang-Tzu P'o

پێیە جەماوەر گمراه دەکات. ڕەوایە کە اکیدا ممنوع بکرێ. بەڵام، چونکە ئایینی خۆجێیی بەربەرەکانی ڕۆژئاوایی‌و بێگانەکانی تره، ئەگەر بێتوو شوێنکەوتەکانی لەناو خۆیاندا ئەنجامی بدەن، سزا نادرێن[40].)) ئاشکرایە کە مانەوییەکان بەهەمان شێوە ی ڕۆژئاواییەکان کە هەوڵیان دەدا ئایینەکەیان بە شێوەیەکی باگنی مەسیحییەت نیشان بدەن، لە ڕۆژهەڵاتیش هەوڵیان دەدا وەك جۆرێکی بوودیزم نیشانی بدەن.

هەر وەك چۆن حکومەتی ساسانی زیاتر لە جاران گیرۆدەی مۆغەکانی زەردەشتی ببوو، مانەوییەکانی ئێرانیش بەرەبەرە بەرەو ڕۆژهەڵات کۆچیان کرد هەتا لە دەستی حکومەت‌و مۆغەکان دوور بن. پاش ئەوەی عەرەبە مووسلمانەکان لە دەیەی ٦٤٠ دا بەسەر پاشایەتی ساسانیدا سەرکەوتن، ژمارەیەکی زۆری مانەوییەکان لە ئاسیای ناوەڕاست گەرانەوە ئێران‌و بین النهرین . ئۆمەوییەکان کە بنکەکەیان دەمیشق بوو، بەگشتی بەوە رازی بوون کە دۆزەکانی ئایینیی جەماوەری شوێنکەوتەی خۆیان بەخۆیان بسپێرن. بەڵام لە ساڵی ٧٥١ شۆڕشی عەبباسی شەپۆلێکی چاکسازی ئایینی لەگەڵ خۆی بۆ وولاتانی ژێر فەرمانی موسڵمانەکان هێنا.

لە ماوەی نیوەی دووهەمی سەدەی هەشتەم، زۆربەی دیوانییەکانی ئێرانی لە حکومەتی عەبباسیدا بەربەرە شێوەیەکی بووژاندنەوەی فەرهەنگییان بەرامبەر بە توێژی دەسەڵاتداری عەرب دەگرتەبەر. ئەمە لە وێژەدا شێوەی بزووتنەوە ناسراو بە شعوبیەی بەخۆوە گرت، کە لەم ڕێگەوە زۆربەی بەرهەمە کۆنەکانی وێژەیی ئێرانی وەرگێردرانە سەر زمانی عەرەبی. لەناو هەمان بیرمەندە ئێرانیانەدا، مانەویەتی شاراوە شێوەیەکی باوی هەبوو بۆ دەرکەوتن. هێندەی پێنەچوو کە ئایینی مانی گەیشتە هەمان پێگەی گوماناوییە کە لە دوو جیهانی ساسانی‌و ڕوومیدا هەیبوو، واتە بوو بە دوژمنی سەرەکی ژمارە یەکی ئایینی فەرمی. تەنانەت کەسانێك کە تەنیا گومانی مانەویی بوونیان

(بوونە زەندقیان) لێدەکرا بێبەزەییانە سەرکوت دەکرانو ئازاریان دەبینیو زۆربەی ئیماندارەکان دووبارە ڕێگەی ڕۆژهەلاتیان گرتەبەرو ڕایان کرد.

## ئۆیغۆرەکان

ماوەیەکی کورت نزیکەی حەفتا ساڵ، لە ٨٤٠ـ٧٦٢، ئاینی بەدناوکراوی مانەویی وەك پێگەیەکی دینێکی فەرمی لەلایەن دەسەلاتەوە پشتگیری لێ کرا. ئەمەش مدیونی تورکەکانی ئۆیغور بوو کە کۆنفێدراسیونی پێشووی تورکەکانیان ملکەچ کردو ساڵی ٧٤٤ حکومەتێکیان لە تێپسی باشووری سیبریا دامەزراند.

نیشاندەری بۆنەکانی چینییەکان لەگەڵ ستێپس هەمیشە لە ڕێگەی ڕاکشانی ڕەزامەندی هۆزەکانەوە بوو، ئەویش زۆرتر لە شێوەی پێدان ئاوریشم، و لە ئەنجامدا هەندێ لە هۆزەکانی دانیشتوی ستێپس لەم ڕێگەوە توانیان سامانێکی زۆر کۆبکەنەوە.

کاتێك ئۆیغورەکان دەسەلاتیان بەدەستەوە گرت، تانگ تووشی کێشە یەك لەدوای یەکەکانی ناوخۆ ببوو و زۆرتر لە جاران پشتی بە پشتیوانی ئۆیغۆرەکان دەبەست[41].

فەخفوری تانگ لە ساڵی ٧٥٥ لەگەڵ شۆرشێك ڕووبەڕوو ببووە کە سەردارێکی دوورەگەی سەغدیی‌و تورك بەناوی ڕۆشن (بەمانای ڕووناك) کە چینییەکان بە ئان لۆشەن[1] ناویان دەبرد، سەرکردەیی شورشەکەی دەکرد. فەخفور داوای یارمەتی لە ئۆیغۆرەکان کرد تاکوو لە دامرکاندنی فتنەکە یارمەتی بدەن. پاش وەرگرتنەوەی شاری لویانگ کە لە ساڵی ٧٢٦، سەر بە

[1] . An Lu-shan

تانگ بوو، خاقانی ئۆیغۆر[١] کە لە سەرچاوەکانی چینییدا بە مویۆ[٢] ناسراوە، لەگەڵ هەندێ مانەوییەکانی سەغدیی کە لەوێ دەژیان ناسراوییان پێك هێنا. ئەم سەغدییانە کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر خاقان داناو کاتێك گەڕاویەوە پایتەختەکەی، قەرابلاساغۆن[٣]، لە باکووری زنجیرە کێوەکانی تیان شەن[٤]، چوار سەغدیی لەگەڵی هاوڕێ بوون. ماوەی چەند مانگ هانیاندا کە مانەوییەت پەسەند بکات. لە ٧٦٣ خاقان بەفەرمی ئایینی مانەویەتی کردە ئایینی دولتی ئۆیغۆرو رایگەیاند نەریتی شەمەنی ممنوعە.

ئەوەی کە بۆچی خاقان ئەم کارەی کرد لەنهێنیەکانە. دەڵێن سەردەستەی ((ئیماندارەکانی)) مانەوی کە بەناوی چینی جۆیی سی[٥] ناسراوە، لە قسەکردندا زۆر شیواو لە هانداندا زۆر شارەزا بوو. خاقان کە سوپاهی بوو پێدەچێ حەزی لە انقباتی ووشکی ڕێوەرسمی ژیانی مانەوی بووبێت. لایەنێکی تری سەرنجراکێشی ئەم ئایینە کە چینییەکان حەزیان لێ نەدەکردو ئۆیغورەکان بەدوایەوە بوون، نیشاندانی سەربەخۆییان بوو لە تانگ. لەوانەیە هۆکاری سێیەم بۆ ئاسانکاری پێوەندی بازرگانی لەگەڵ رۆژئاوا بووبێت لە ڕێگەی سەغدییەکانەوە[42].

داعییەکانی مانەوی بەتایبەتی لەناو ئۆیغۆرەکاندا لە ستراتیجییەتی هاوتاکردنی چەمکە ئایینییەکانیان لەگەڵ چەمکە تورکییەکان سودیان وەرگرت. بۆ نمونە خوداکانی مانەوی خاوەن دووکۆشکی رووناکی لەگەڵ خۆرو مانگ یەکسان کران، چونکە ئەمانە لەلای تورکەکان ڕێزدار بوون. بۆ ئەم کۆشکانەش زاراوەی (اردوی) تورکییان بەکاردەهێنا، لە رووی زمانەوانییەوە

[1] . Kaghan
[2] . Mou-yu
[3] . Qara-Blasaghun
[4] . Tien-shan
[5] . Jui-hsi

بەواتای جێگەیەکە کە خێوەتو خرگاهی خاقانیان لێی هەڵدەدا. مانەوییەکان وشەی توورکی بیلەگ[1] ((زانست))یان، کە ڕەوەندەکان هەرلە کۆنەوە هاوتای پێشەوایی‌و سەرکردایەتییان دەزانی، بەهەر پێنج فچیلتی بنەمایی پەیوەست کرد (کە ئەمانەن: زانستی خۆشەویستی، زانستی ئایین، زانستی شوق، زانستی لێبوردەیی‌و زانستی زانین). بۆ "دەروون" وشەی توركی گۆت/قۆت[2] یان ((نعمت ئاسمانی))یان بەکار دەبرد[43]. جارێکی تر گرنگی زمانو وەرگێران دەبینین لە بلاّوکردنەوەی چەمکە ئایینییەکان لە فەرهەنگە جۆراوجۆرەکاندا.

مانەوییەکانی ئێرانی‌و تورك کە لە چین دەژیان بە پشتیوانی دەسەلاّتی ئۆیغۆر توانیان کۆمەڵێك امتیازی زۆر لە دەسەلاّتی تانگ بەدەست بێنن، وەك دروستکردنی پەرستگە نوێیەکان. لە نێوان ساڵەکانی ٧٦٨و ٧٧١ فەخفوری تانگ فەرمانی دا لە چانگ ئان، لویانگ، نەن چانگ، شائۆسینگو یانگ چۆ[3] پەرستگەی مانەوی دروست بکەن. ئایینهێنەرانی مانەوی لە سەرزەوییەکانی ئۆیغوردا بوونە بەهێزترین چینەکانی کۆمەلاّیەتی. ژمارەیەکی زۆری نووسراوەکانی مانەوی کە ئێستا لەبەر دەستن، مێژووەکەیان دەگاتەوە سەردەمی حکومەتی ئۆیغۆر لە ناوچەی تاریم. نووسراوێك دەربارەی هەوڵەکانی لەناوبردنی کردارەکانی ئایینیی نەریتخوازانەی تورکەکان دەڵێ: ((دەبێ تەواوەتی پەیکەرە تاشراوە یان کێشراوەکانی شەیتانەکان بەگشتی لە ئاگردا لەناو ببردرێن، دەبێ ئەوانەی کە لەلای گیانە ناپاکەکان دوعا دەکەن یان سوجدە بۆ شەیتان دەبەن بگرێتەوە (؟)و دەبێ خەڵك ئایینی نوێ پەسەند بکەن. دەبێ وولاّت بەدابونەریتی یەکسانخوازی‌و خوێنە هەوڵماوییەکەی بگۆردرێ بە وولاّتێك کە خەڵکەکەی ڕوەکخۆری بکەن، دەبێ دەسەلاّتێك کە

[1] .bilig
[2] . Gut
[3] . Yangchow

پیاوان تێیدا خەڵك دەكوژن ببێتە هەرێمێك كە تێیدا هانی ئەنجامدانی كاری چاكە هەبێت.[44]))

وا پێدەچێ تەنانەت پاش ئەوەی چیتر مانەوییەت لە پێگەی ئایینی حكومیدا نەبوو، دیسان مانەوییەكان لەلایەن ئۆیغۆرەكانەوە پشتگیریان لێ دەكرا. ابن ندریم، نووسەری موسمان، دەنووسێ: لە سەدەی ئۆیەم سەرداری خۆراسان بیستی كە كۆمەڵەیەكی پێنج سەد كەسی لە سەمەرقەند ڕێورەسمی مانەویەت بەجێ دێنن و ویستی ئەوان بكوژێت، خاقانی ئۆیغۆر پەیامی بۆ سەرداری خۆراسان نارد كە ئەگەر هەدمەیەك بەر مانەوییەكانی سەمەرقەند بكەوێت ئەوا تەواوەتی ئەو موسلمانانە دەكوژێت كە لە ناوچەی دەسەڵاتی ئەودان[451] .

ئۆیغۆرەكان لە پێگەی مدافعانی تانگ، پاش شۆرشی ئان لۆشەن، هێزی خۆیان بەكار دەهێنا بۆ پاراستنی كۆمەڵانی مانەوی لە چین، بەڵام پاش ئەوەی گرووپێكی تری تورك لە ٨٤٠ دا هەرێمی ئۆیغۆرەكانیان تێكشكاند پەرچدانەوەیەكی هەندێك درەنگ خایەن لەلایەن تانگەوە بینرا. پاش سێ ساڵ دەسەڵاتی تانگ هەموو پەرستگەكانیی مانەویی لە چین داخست جگە لە سێ دانەیان، بە خاقانی ئۆیغۆری ڕاگەیاند هەركە ئۆیغۆرەكان دووبارە مەڵبەندەكەیان دامەزرێننەوە ئەویش دووبارە پەرستگەكان دەكاتەوە.

بەڵام لە ماوەی چەند مانگدا حكومەتی تانگ هەنگاوێكی تری ناو پەرستگەكانی دیكەشی داخست و سامان و داراییەكەشیانی داگیركردو ئایینهێنەرانی مانەویی لەناوبرد. ئێەنین[2]، زیارەتكەری ژاپۆنی، بەم شێوە باسی

---

[1] . ابن ندیم، الفهرست، نووسراوەی عەرەبی، لا ٤٠٠–٤٠١. وەرگێرانی فارسی، رضا تجدد، ١٣٦٤:٦٠٠.و.

[2] . Ennin

ئەم ڕووداوە دەکات ((فەرمانێکی شاهی شاهی دەرچوو کە تێیدا شا فەرمانی دەدا دەبێ ئاینهێنەرانی مانەویی ئیمپراتۆرییەکە بکوژرێن. دەبێ سەریان بتاشرێ‌و خرقەی بووزییان دەبەر بکەن‌و لە کاتی کوژراندا دەبێ هاوشێوەی شەرمەنەکانی (ڕەببانەکانی) بووزیی بن.[46]))

ووتوویانە پاڵنەری ئەم سەرکوتکردنە بەلایەنی کەمەوە تاڕادەیەك ئابورییە، چونکە لەوانەیە پەرستگەکانی مانەویی کاری ڕێکخراوەکانی ڕباخوریان دەکرد کە بازرگانەکانی ئۆیغۆر دەیانگێران[47]. پاش دوو ساڵ مۆدێلێکی هاوشێوە دژی سەرکەوتووترین ئاینەکانی بێگانەی چین واتە بوودیزم‌و مەسیحییەت‌و زەردەشتی بەکار هێنراو ئەمانەش لەو سەردەمەدا لەناو ئیمپراتۆرییەکەدا پشتگیرییان لە دەستداو لە ڕاپۆرتەکانی مێژوویی چینیدا بزربوون.

ئۆیغۆرەکان پاش شکەستی ساڵی ٨٤٠ بەرەو ڕۆژهەڵات بۆ ناوچەی تاریم کۆچیان کردو پایتەختێکی نوێیان لە خوچو/ قەراخۆجە[1] دامەزراند. هەرچەند زۆرینەی جەماوەری مەڵبەندی نوێی ئۆیغۆرەکان بووزیی یان مەسیحی بوون بەڵام مانەوییەکان هەر پشتیوانی فەرمییان لێ دەکرا دیرەکانیان وەك دێرەکانی بووزییەکان بە کشتوکاڵ پشکووتوو بوو.

مدایحێك کە بۆ خاقانی ئۆیغۆری خوچو دروستیان کردووە دیارە کە مانەویی‌و بووزییەکان بەقەد یەکدی ئەوانیان بە پشتیوانی خۆیان دەناسی[48]. هونەرو نووسراوەکانی ئەم سەردەمە کە زۆرتر لە دیرەکان بەدەست هاتوون، نیشاندەری ڕێبازە پێك گەیانییەکانن[49]. پێدەچێ مانەویەت لە سەدەکانی دواتردا بەرەبەرە هەوادارەکانی خۆی بە بوودیزم‌و مەسیحی دۆراندبێت‌و تا

[1] . Qocho/ ایدیقوت شهری

ســەردەمی داگیرکردنــەکانی مــەغۆل لەوانەیــە چــیتر لــەناو تۆیغورەکانــدا شوێنەوارێکان لێ نەمابێت.

بـەڵام ئـەم ئایینـە لـە چـین هـەروەك جـاران لـە کۆکردنـەوەی نویێئایینـە خۆجێییەکاندا سەرکەوتوو بوو. نووسەرانی بووزیی سـەدەی سـێزدەیەم هێـشتا لەگەڵ مانەویەت دەمەقاڵێیان هەبوو و لەگـەڵ دوو فرقـەی بـووزیی ((نیلوفـەری سپیی)) و ((هەوری سپیی)) کە ئەمانەیان بە لێکدانەوەکانی لادەرانەی بوودیزم دەناسی، ڕەخنەیان لە مانەوییەت دەگرت. لە سەدەی دواتر *یاسانامەی مینـگ* ڕایگەیاند هەر سێکیان نایاسایین[50] . ئـەم ڕکابەرییـەی بووزییـەکانی چـین بـووە هۆی ئەوەی مانەویـەت بکـشێتەوە نـاو ژێـرزەوەیو ژێرخانەکانـەوە بـەڵام ئـەم کۆمەڵە هەر ماوە.

## کاڵبوونەوەی جیاوازییەکان:

## بیرۆکەکان، سەمبۆلەکان و ووشەکانی هاوبەش

لــە ســەردەمەکانی کۆنئــاراوە مانەویــەت هــەوڵی دەدا خــۆی وەك ئــایینێکی گشتگیرو جیهانی نیشان بدات. بانگهێـشتکەرەکانی زۆر هۆشـیارانە سـەمبوڵ و ووشەی مخاگبەکانیان بەکاردەهێناو هـەوڵیان دەدا تـاکوو ئـەم پـەیرەوە نوێیـە ناسراوتر و پەسەندکراوتر بکەن.

فێرخوازێکی مانی بەناوی مار ئامۆی[1] پارتی سـەرکەوتنێکی گـەورەی بەدەسـت هێنا لە بانگهێشتەکەیدا کە بۆ پەیڕەوی نوێی دەکرد لە ووڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتیـدا کـە بـوودیزم لـەوێ زۆر بـاو بـوو. نووسـراوێکی سـەغدیی دەڵـێ کـە مـار ئـامۆ ((بەتەواوەتی بووداگی پێغەمبەری ڕوونـاکی نیـشان دەدا.[51])) لـە سـرودەیەکی

[1] .Ammo

تری پارتییدا چەمکی ئیسلامی بەکاردینریت، وەك زۆلفەقار، شمشیرەکەی (پیغەمبەر) محمد[1] لەوانەیە مەبەست لەم کارە شاردنەوەی ناوەروکەکەی بیّ لە ئازارو سەرکۆنەکردنی موسلمانەکان[52]. داعییەکی گرنگی تری سەرەتا بە ناوی مار زاکۆ[2]، ئەو مانەوییانەی کە لە ریگەی ئاوریشمدا دەژیان بە ((کاروان سالاری گەورە)) وصف دەکردو ئەمەش تایبەتییەکە کە بووزییەکانی ئاسیای ناوەراست بە ئەڤالۆکیتشڤارەیان[3] دەدا[53]. لە نامەیەکی جعلی مانییدا کە لە ئاسیای ناوەراستەوە بۆ مار ئامۆ نووسرابوو هاتووە، کەسی ئیماندار دەبیّ بیرکردنەوەی ئایینی بیّو هەولّ بدات نکوکرد (چاکە) بەدەست بینیت[54].

هەرچەند دەربارەی ئویغۆر لە تورکستانی رۆژهەلاتدا نزیکەی پینج سەدە مدافع مانەوییەت بوو بەلاّم لەوانەیە تەنیا ژمارەیەکی کەم لە جەماوەری رعایا بوون بە مانەوی. هەندیکیان هەر نەستوری مانەوەو لە ئەنجامدا زۆربەیان بوودیزمی مەهایانەیان پەسەند کرد. بەتایبەت نووسراوەو وینەکانی خەمرکی تورفان ئاویتەیەك لەم سیّ نەریتە نیشان دەدەن، ئەوەندە کە زۆرجار سەیرو سەمەرەن دەبینریّن. نمونەیەکی باشی ئەم ئاویتەیە ((هەلّبەستیکی گەورەیە بە مانوی)) کە بە زمانی تورکی پاریزراوە:

> بە دلّیکی پر لە ستایشەوە خۆمان ئامادە کردووە کە ستایشی تۆ بکەین،
> باوکی شایەنی ستایشی من، گەورەی من، مانی بوودای من...
> تۆ نەزانیت لە گیانلەبەرە پینج شیوەکانی بوون وەرگرتووە،
> معریفەت هیناوەو.

---

[1]. ئەم شمشیرە لە اصلدا هی *منبەابن الحجاج* بوو کە لە رۆژی کووژرانیدا پیغەمبەر بۆخۆیی هەلّبژاردو پاشان لە شەری *ترحوذ* دای بە عەلی. (وەرگیراو *لە لغت نامەی دهخدا*). لەناو ئیمە بە (زۆلفەقاری عەلی) ناسراوە. و.

[2]. Mar Zaku

[3]. Avalokiteshvara : "خودایەکە کە دەروانیتە خوارەوە"، لە گرنگترین بووداسەفەکانی بوودیزمی مەهایانەیە کە تجسم خەمخۆرییە. و.

تۆ ڕێگەت داوە کە ئەوان سوود لە پەریـنیروانە[١] وەرگرن.
کینەو هەندێ خۆزگەی تر، هەستو دڵەکانیانیان پەرۆش کردبوون.
ئەو کات کە تۆ، باوکی پیرۆز، لە ئاسمان دابەزیت...
نێردیوانی زانینێت برافراشت،
و بەسەر پێنج شێوەی بووندا زاڵ بووی‌و ئێمەت ڕزگار کرد...
ئێمە، گیانلەبەرە هەژارەکان... هاتێنە سەیرکردنی خۆرخودای (عیسا) بووداناسا، کە
لەگەڵ تۆ یەکسانە.
دیلی دیلەکان، ئازارکێژەرانە، لەم سەنسارە[٢]دا دەمێنینەوە.
(بەڵام) تۆ پەیڕەوە ڕاستەقینە بێهاوتاکانت فێری ئەوانە کردووە کە کۆیلەی
بازیچەهای تێپەڕن‌و تۆ بەرەو نیرۆڤانەی[٣] باش ڕێنماییت کردوون...
تۆ ئەو ڕێگەیانەت نیشانیان داوە کە دەگاتە دیارەکانی بوودا.
تۆ کرداری چاکەت کۆکردۆتەوە، چەند شاخێکی سومێرۆ[٤]...
کاتێك ئەو گیانلەبەرانەت پەیدا کرد کە ڕزگار نەبوون، بەبێ چەنە لێدان هەموویانێت ڕزگار کرد.
تۆ بەتەواوەتی گەوهەری پەیڕەوەکانی دڵخۆشکەرێت (ئێنجیل) فێری هەموو ئەو کەسانە کردووە کە وەك ئێمە لەخەو رابوون[55].

لە هەڵبەستێکی سەغدیی دا هاتووە ((پێنج انجمن پێنج بوودای مەهایانە[56])) کە ئەمە بەئاشکرا هەوڵێکی هۆشیارانەی تری مانەوییەکانە کە بە زمانی ڕێگەی

1 . Parinirvana
2 . Samsara
3 . Nirvana
4 . Sumeru

ئاوریشمی ڕۆژهەلات بدوێن. نووسراوێکی پارتی تورفانی ئەم هاندانەی تێدایە ((لەخەو ڕاپەڕن، براکان، هەڵبژێردراوەکان، لەم ڕۆژی ڕزگاربوونەی ڕوخسای چواردەی مانگی مێهر، کاتێك کە عیسای کوری خودا، چووە ناو پەری نیروانە.[57])) مانەوییەکان چەمکی مەسیحی ((تصلیب)) و چەمکی "پەری نیروانە"یان لە جیاتی یەکدی بەکار دەهێنا، هەردووك ئاماژەیەك بوو بە ڕزگاربوونی گیانی عیسا لە جەستەی مادیو گەڕانەوەی بۆ مەڵبەندی ڕووناکی[58].

کاریگەری زۆری بوودیزم لەسەر مانەوییەکانی ئۆیغۆر بەئاشکرا لە پەرتوکێکی پوتی[١] ((کەلای دار خورما)) بە شێوەی بوورزیی لە بزکلیك/ بێزقلیق[٢] لە خەمرکی تورفان دەبینرێ. لەوانەیە مێژووی ئەم بەرهەمە بگاتە سەدەی یازدەو لە کۆتاییەکەیدا باسی ئەسپاردنی کرداری چاکە یان گوازتنەوەی خێر دەکرێ. هەروەها چیرۆکێکی تێدایە دەربارەی بازرگانێك بەناوی ئارازان[٣] کە ڕەنگدانەوەی پێوەندی مانەوییەتە لەگەڵ بازرگانەکانی ڕێگەی ئاوریشم[59].

ئەم ئاوێتەی بیرکردنەوەی ئایینی بەلایەنی کەمەوە لە نمونەیەکی پرواتادا دووبارە لە ڕێگەی ئاوریشمەوە بۆ ڕۆژئاوا بردرایەوە ئەوروپا. یەکێك لە چیرۆکەکانی سەدەی ناوەڕاستی ئەورووپی چیرۆکی بەرلعام[٤]و یوئاسەف[٥] بوو کە ڕاپۆرتی چەندینو چەندجارەی ڕەنگ گرتووی ژیانی بوودایە. ناوی پاڵەوانەکەی لە ڕێگەی کۆمەڵێك وەرگێراوی سانسکریتی لە بودیسەتڤەوە[٦]

---

[1] . Pothi
[2] . Bezckilik
[3] . Arzan
[4] . Barlaam
[5] . Ioasaph
[6] . Bodhisattva

گۆراوە بۆ بۆداسەفی سەغدیی، بۆ بودیسەفی[1] ئۆیغۆریو دیسان لە بۆداسەفەوە[2] بۆ یوئاسەف[60].

لە چینیش بەلگەی پێکهێنانی چەمکەکان فراوانە. لەسەر مۆنیومێنتی سیّ مەتری بەناوبانگی سەدەی هەشتەم لە سیان خاچێکی مالتی دەبینریّ کە لەسەر هەورێکی دائۆیی دانراوە لەگەلّ گولێکی نیلوفەری بووزیی کە کەوتۆتە ژێرییەوە[61]. نووسراوەی کەتیبەی ژێرەوەی، گەوهەری مەسیحیەت بە چەمكو وێنەکانی بووزیی کە رەنگی بووزییان هەیە، کورت دەکاتەوە (بۆ نموونە ((هەشت فچیلتی سەرەکی))، پەرچدانەوەی ((رێگە هەشتیانەی جلیل))ە، ((هەلواسینی هەتاوی درەوشاوە)) و ((پاروی سفینەی رحمت)) ئامارەیەکە بە ئامیتابە کە گیانەکان دەباتە بەهەشت، لەگەلّ پشنگێك لە ئاینی کۆنفۆسیوس، ((چۆنیەتی فەرمان دەرکردنی بەسەر خێزانەکانو مەلّبەندەکان بەیەکەوە))) و دائۆییزم ((پەیرەوی نوێی بی کنشی)):

ئەو (مەسیح) بۆ جێبەجیّ کردنی یسای کۆن، هەروەك بیستوچوار فرزانە ووتوویانە، چونیەتی فەرمان راندن بەسەر خێزانەکان ومەلّبەندکان بەیەکەوە، بەپێی نەخشە گەورەکەی خۆی فێربوو. ئەو بە بنیاتنانی پەیرەوی نوێی بیکنشی بە بێدەنگی لە رێگەی روح القدسەوە، تاکی دیکەی تثلیث، لە رێگەی ئیمانی دروستەوە توانای چاکەکردن لە مرۆڤدا پدیداورد. ئەو بە بنیاتنانی معیاری هەشت فچیلتی سەرەکی، تارمایی لە سروشتی مرۆڤ سرییەوەو خووی راستەقینەی

1. Bodhisaf
2. Iudasaf

پێگەیاند. ئەو، سێ دەروازەی یەك لەدوای یەکی بەتەواوەی دەکاتەوەو ژیان دێنێتە ناو ڕووناکییەوەو مەرگ دەسڕێتەوە. ئەو، خۆری درەوشاوەی هەڵواسییو شوێنەکانی تاریکی لادا. بەم شێوە هەموو ترفندەکانی خراپەی شەیتانی بەزیو لەناوچوون. ئەوکات ئەو پاروی سفینەی رەحمەتی هەڵگرتو چووە بەرزایی کۆشکی ڕووناکی. پاشان، هەموو بوونەوەرەکانی خاوەن ژیری چوونە ئەوبەری خلیج. بەم شێوە کاتێك کارە تواناخوازەکەی تەواو بوو، نیوەڕۆ گەراوە دۆخی سەرەتای خۆی (لە ئاسمان). بیستوحەوت کاری معیاری سۆترەکانی پارێزراون. ئامێرە گەورەکانی گۆڕین (یان هەویرترش، واتە گۆڕان) زۆر پەرەیان سەندو دەروازەی ژیانی پیرۆزی مهرشدە کرایەوە. یاساکەی ئەو شۆردنە بە ئاوو بەگیانو بەم شێوە شۆرانەوەیە لە هەموو بیرۆکە پوچەڵەکانو پاکبوونەوەی مرۆڤەکانە تاکوو دووبارە سپیایی سروشتی خۆیان وەرگرنەوە.

**لە چەند دێر خوارترەوە، وێنەکان بەئاشکرا دەبنە دانۆیی:**

بەڵام، بە هەر حاڵ، ڕێگا ئەوەندە کراوە نابێ ئەگەر لەبەر فرزانە نەبێتو فرزانە ئەوەندە گەورە نەدەبوو ئەگەر لەبەر ڕێگا نەبووایە. لە کاتێکەوە کە فرزانەو ڕێگا لەگەڵ یەکدی یەکیان گرتەوە وەك دوو نیوەی

کردارێکی دوولایەنە ڕێککەوتیان هەیە، ئەوکاتە
جیهان پاکە دەبێتەوەو ڕووناك دەبێت[62].

نووسراوێکی مەسیحی کۆنتری (٦٤١؟) چینی هەمان ناونیشانی هیندی شاسترەی هەیە بۆ دەربرینی *یەك دنییوە* (یان، ئاخاوتن دەربریتی دەربارەی یکتایی خود١)[63] لە نووسراوێکی سەرەتایی دیکەدا لە سالّی ٦٣٨ نووسراوەی ئالوپێن؟) ناسراو بە *سۆترەی عیسا مەسیح* ئەم بند هاتووە کە تشبیهاتی چینی زۆری تێدا هاتووە: ((یەهوە، کە سەروەری ئاسمانە... لە "با" دەچێ لە رووخساری ئەودا. و چ کەسێك دەتوانی با ببینێت؟... سەروەری ئاسمان بەردەوام دەچێتە سەرانسەری جیهان، هەمیشە لە هەموو جێگایەك هەیە... بەم هۆیە، هەر کەسێك کە لەم جیهانە دایە تەنیا ژیان بەدەست دێنێتو ژیانەکەی بەرەو سەروەری ئاسمان درێژە پێدەدات...[64]))، هەروەها لە سۆترەی عیسا مەسیح دا هاتووە ((بووزییەکان، کیناراکان[1]و دیڤەکانی[2] چاودێر)) کە لەوانەیە هەولّێك بێت بۆ وەرگێرانی چەمکی ((فریشتەکان، فریشتە نزیکبووەکانو سوپای ئاسمان[65])).

نووسراوێکی مانەوی چینی زۆر ناسراوی سەرەتای سەدەی دەیەم وەك سورەتێکی بووزی دەست پێ دەکاتو کۆتایی پێ دێت. لەراستیدا کۆتاییەکەی وەك کۆتایی سورەتی ئەلماسە. لە نسخەی مانەویدا هاتووە: ((هەموو ئەندامانی ئەم انجمنە گەورە کاتێك ئەم سورەتەیان بیست، بە ئیمانەوە قەبوولیان کردو شادومان بوون وبریاریان دا جێبەجێی بکەن.)) سورەتی ئەلماس بەم شێوە کۆتایی پێ دێت: ((هەموو رەببانەکان، ژنو پیاو، پیشنشیانی ژنو پیاو... کاتێك ئەم ووتانەی بوودایان بیست هەموو بە یەك ئەندازە شادبوونو بە ئیمانەوە وەریان گرتو بریاریان دا جێبەجێی بکەن.[66]))

---

[1] . Kinnara
[2] . Deva

بۆ خەڵکی ئاسای کە ئامادەیی ئەوەیان نییە ووردەبابەتەکانی ئایینی لە هیلەك بدەن، دەبێ ئەم تێکەڵە ئایینییە زۆر سەرسامکەر بووبێت. نووسراوێکی چینی بەم شێوە ئامۆژگاری دەدات: ((لە بواری پەسەندکردنی بوودا، تاك دەبێ بیربکاتەوە کە گرۆیی کام بوودا بێت، نە مانی بوودا، نە بوودای نەستوری، نە بوودای زەردەشتی، بەڵکوو بوودای شاکیە مۆنی....[67]))

## بەشی پێنجەم

## بەئیسلام بوونی ڕێگەی ئاوریشم

لە مێژووی جیهاندا هیچ نەریتێکی ئایینی بە ئەندازەی ئیسلام پشتگیری لە بازرگانی نەکردووە: پیشەی پیغەمبەر محەمەد بازرگانی بووە. لە دەیەی بیستەمی تەمەنیدا ژنە بازرگانێکی دەوڵەمەندی خەڵکی مەککە، بە ناوی خەدیجە، بەخزمەتی خۆی گرت، ئەو لە ماموریتێکی بازرگانیدا کە چووە سوریا سەرکەوتوو بوو، ماوەیەکی کورت پاش ئەمە خەدیجە هاوسەرگیری لەگەڵ کرد.

پێغەمبەر محمد نزیکەی ٦١٠ زایینی، کە حەزی دەکرد لە شاخەکانی دەرەوەی مەککە خەریکی تێرامانو بیرکردنەوە بێت، لە ماوەی ئەم خلوت گزینییەدا گوێی لە نداهایی دەبوو. سەرەتا گومانی لێ کرد بەڵام خەدیجە هانی دا کە ئەم دەنگانە دەتوانن سروشتێکی خوداییان هەبێو دەبێ گوێیان بۆ رادێرێت. بەرەبەرە پێغەمبەر دڵنیا بوو کە لە لایەن خوداوە وحی پێ دەگاتو بانگهێشتی دەکات کە ((راپەرێتو هشدار بدات)) بە خەڵکی مەککە کە کاتی ئەوە هاتووە رێوو شوێنیان چاك بکەن.

مەککە شارێك بوو لەناو دڵی بیاباندا کە جگە لە ئالووگوری بازرگانی بژێوێکی وەهای بۆ درێژەدان بە ژیان نەبوو. دەبێ بازرگانە سەرکەوتووەکان دەوڵەمەندترین دانیشتوانی ئەوێ بووبێتن. زۆربەی ئەو وحیانە کە بە حەزرەتی محەمەد دەگەیشت باسی بێعدالتی کۆمەڵایەتی دەکرد کە بە ئاشکرا دۆزی ئەو سەردەمەی مەککە بوو.پەیامەکەی جەماوەرێکی زۆری پەیدا کرد کە گوێگرانێکی هاودڵ بوونو لە هەمان کاتدا زیاتر لە جاران لەگەڵ ئەو توێژە کۆمەڵاتییە بێگانە دەبوو کە ئامانجی رەخنەکانی ئەو بوون. ماوەیەکی بەسەر

تێنەپەری کە خەڵکی دەسەڵاتداری مەککە گۆڕیانیان بە محەمەدو جەماوەرەکەی بەرتەسك کرد.

لە ساڵی ٦٢٢ شەهروندانی یثرب (مەدینەی ئێستا)، شارێك کە نزیکەی دووسەدو بیست مایلی شمال مەککە هەڵکەوتووە، گیرۆدەی مشتومری جناحی بوون کە لە چارەسەرکردنیان دامابوون. ئەوان کە محەمەدیان بەکەسێکی بە انصافو امانت پارێزە بیستبوو، داوایان لێ کرد ناوبژی بکاتو ئەویش قەبوڵی کرد. پیغەمبەری ئیسلام زۆربەی شوێنکەوتووەکانی خۆی بەرلەخۆی ناردە ئەوێو پاش ڕێکخستنی کارەکانی لە کۆتاییدا بۆخۆشی شوێنی لەدایکبوونی بەجێهێشت. ئەم ڕووداوە لەلای موسلمانەکان بە کۆچ ناسراوەو سەرەتای ڕۆژمێری ئیسلامی دەستنیشان دەکات.

موسلمانەکان لە یثرب نەك تەنیا چیتر ئازاریان نەدەدیت بەڵکوو بوونە خاوەن پێگەیەکی تایبەتیش. لە بنکەکانی دەسەڵاتە نوێیەکەیانەوە چەند هێرشێکیان (رزیە[1]) کردە سەر کاروانەکانی خەڵکی مەککەو بەم کارەیان هەم خەزێنەکانیان پڕو دەوڵەمەند دەکردو هەم زیانیان بەو کەسانە دەگەیاند کە پێشتر ئازاریان دابوون. موسلمانەکان پاش چەند شەرێك لەگەڵ مەککییەکان توانیان مافی گەڕانەوە بۆ مەککە وەرگرنەوە بەمەبەستی زیارەتکردنی نەریتخوازانەی کەعبە، لە ساڵی ٦٢٨ دا مەککە لە دەستی موسلمانەکان دابوو.

هێرش کردنە سەر کاروانەکان (بەر لە ئیسلام) بەشێکی باوی ژیانی ئابووری عەرەبستان بوو. تەنیا یاسایەکی بەسەردا زاڵ بوو بەم واتایە کە هێرشکەر نەیدەتوانی هێرش بکاتە سەر ئەندامانی هۆز یان گروپێك کە پەیمانی

[1] . razzia. لەم جۆرە شەرانەدا ئەگەر خودی پێغەمبەر بەشداری کردبا ئەوا پێیان دەووت (غەزوە) ئەگەر نا پێی دەووترا (سەرییە). یك سرێە میفرستادی رسول / بهر جنگ با کافر و دفع فضول (مثنوی). و.

دەستدرێژی نەکردنی لەگەڵیان بەستبوو. ساڵ لەدوای ساڵ سەرکەوتنەکانی موسلمانەکان زیاتر دەبوو تاکوو لە کۆتاییدا هەموو هۆزەکانی نیمچەدوورگەی عەرەبستان پیکەکانیان هەناردە لای حەزرەتی موحەممەد کە پەیمانی لەگەڵ ببەستن. نووسەر موسلمانەکانی دوایی ئەم دەربرینی وەفادارییەیان ناو نا تەسلیم کە (ئیسلام)یش لە هەمان مادەیە. سەیر نییە ئەم سەرچاوانە، مێژووە ((غیر ئیسلام))ییەکانیش کە لەسەر ئەم بنەمایە نووسراون، ئەمە بەم واتایە وەرگرن کە هەموو هۆزەکانی عەرەب ئایینی نوێیان وەرگرتبێت.

بەلاّم بە تێگەیشتن لە چەمکی ((تسلیم)) لە واتە زمانەوانییە تەسکترەکەیدا، بەئاسانی روون دەبێتەوە کە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر لە ساڵی ٦٣٢ دا چی روویدا: زۆربەی هۆزەکانی عەرەب هەستانەوە. سەرچاوەکانی دواتری موسلمانەکان ئەم شۆرشانەیان ناونا ((رەدت))، بەلاّم تعبیری سادەتر ئەوەیە کە لایەنەکانی شۆرشەکە تەنیا ئەوەیان دەدیت کە پاش کۆچی دوایی پیغەمبەر پەیمانەکانی دەستدرێژی نەکردنیان رەچاو نەکردووە.

دەستبەجێ موسلمانەکان ((خەلیفە))یەکیان بەناوی ئەبوبەکر هەڵبژارد کە هۆزەکانی عەرەب بەناچاری ((تسلیم))ی پێشەوایی ئەو بوون. چونکە بەشێك لە ئابووری عەرەبستان لە رێگەی تهاجمەوە دەستەبەر دەبوو، هەروەها بەپێی گرێبەستەکانی دەستدرێژی نەکردن چیتر هیچ کەس لە عەرەبستاندا دەستدرێژی نەدەکرایە سەر، موسلمانەکان ناچاربوون تاختوتازیان لە دەرەوەی نیمچەدوورگەی عەربستان لە قلمروهای بیزانسو ئێران دەست پێ بکەن. سەرکەوتنەکانیان لە تێکشکاندنی سوپای هەردوو ئیمپراتۆرییەکە زۆربەی موسلمانەکانی بە ئەندازەی دوو ئیمپراتورییەتەکە سەرسام کردبوو.

بازشناختی لایەنی ئابووری جیهانگیری موسلمانەکان، کە نەریتی دێرینی عەرەب واتە دەستدرێژی کردنیش لە پشتییەوە بوو، گرینگە. هەرچەند موسلمان‌و غیرموسلمانەکان لە پێداچوونەوەی ئەم جیهانگیرییە سەرەتاییەدا، توخمێکی گەورەی غیرتی ئایینی دەبینن بەلآم سوپاییەکانی عەرەب لەو سەردەمەدا تەنیا کارێکیان دەکرد کە بە شێوەی سروشتی لە فەرهەنگی خۆیان فێری ببون‌و ئەمەش شتێك بوو کە باردۆخی ئابووری سەرزەوییەکەیان بە سەریانیدا سەپاندبوو. شتێك کە گۆرانی بەسەردا هاتبوو ئەوە بوو کە هەموو گرووپە عەرەبەکانی نیمچەدوورگەکە بۆ یەکەمجار توانستی هێرشکردنە سەر گروپەکانی دیکەی عەرەبیان[1] لە خۆیان ئەستاندبووەوە. هەربۆیە، بەناچاری دەبوایە هێرشبەرنە سەر شوێنێکی تر. لەوانەیە وێنایەکی ئایینی تازە کە سەبارەت بە خۆیان هەیانبوو بەراستی الهامبخشیان بوبێت کە واتای الاهی بە سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانیان بدەن، هەڵبەتە نابێ هۆکارەکانی تریش لەبەر چاو نەگیرێن.

ئێرانییەکان لە شێوەی مێدییەکان، هەخامەنشییەکان، ئەشکانییەکان‌و ساسانییەکان هەزار ساڵ لەسەر باڵادەستیی لە ئاسیای رۆژئاوا لەگەڵ ئاتێنییەکان، سلوکییەکان‌و یونانییەکانی رۆم رکابەرییان کردبوو. دوو ئیمپراتوری ئێرانی ساسانی‌و یونانی بیزانتی ئیتر بەرەو نەمان دەچوون‌و دواهەناسەکانی کۆتایان هەڵدەکێشا. لەگەڵ رعایاکانیان لە بین النهرین، سوریا یان میسر هەڵسوکەوتێکی وەهایان نەدەکرد کە ناوی خێرخوازی لێ بنرێ. دانیشتوانی زۆربەی شارەکان دەروازەکانیان بە رووی عەرەبەکان کردەوەو وەك رزگارکەر بەخێرهاتیان کردن. لەراستیدا عەرەبەکان لە زۆربەی ئەو وولاتانە کە داگیریان دەکرد لە سەرکردەکانی پێشوی ئەوان بێگانەتر نەبوون‌و لە سەرەتاشدا کەمتر لە کەسانی تر بهرەکشیان دەکرد.

---

[1]. بەهۆی (تەسلیم) یان هەمان پەیمانی دەستدرێژی نەکردن. و.

بەڵام لە دەیەی ٦٦٠ دا بنەماڵەیەکی دەسەڵاتداری عەرەب بەناوی ئەمەوییەکان خلافتیان بەدەستەوە گرت. بنکەی دەسەڵاتدارییان لە دەمیشق بوو و تارادەیەکی زۆر ببونە هاوشێوەی دەسەڵاتدارانی بیزەنتنی کە بۆخۆیان ئەوانیان وەدەرنابوو. بەرەبەرە لە درێژایی دەیەکانی دواتر غیرموسلمانەکان کە لەژێر دەسەلاتی رێژێمی نوێ بوون، بێزار بوون. جگە لەمە، ژمارەیەکی زۆری موسلمانە عەرەبەکان لە شێوازی پاشایانەو دابونەریتی ژیانی ((غیر ئیسلامی)) ئەمەوییەکان نارازی بوون چونکە زۆربەیان باشترین نەریتی روومی رابواردنیان کردبووە پیشەی خۆیان.

بەڵام ئەو گروپە کە بنابوو ببێتە هۆی دارمانی ئەمەوییەکانو بەم کارە بۆ هەمیشە ناوەرۆکی ئیسلام وەك نەریتێکی فەرهەنگی بگۆرێت. مەوالییەکان/غیر عەرەبەکان بوون کە بۆ خۆیان ببوونە ئیسلام.

لە سەرەتاو تەواوەتی سەردەمی ئەمەوی، عەرەبەکان ئایینی ئیسلامیان بە هی خۆیان دەزانی، رعایاکانیشیان ئیسلامیان بە ((ئایینی عەرەب)) (الدین العرب) دادەنا. حوکمی قورئانە کە موسلمانەکان دەبێ حکومەتی ئیسلامی لە تەواوی جیهاندا بلاّوبکەنەوە بەلام ئامرازەکانی پێویست بۆ بلاّوکردنەوەی خودی دینەکە پلان دارێژراو نەبوو. پاڵنەری سەرەکی جهاد ئەمە بوو کە هیچ مووسلمانێك نابێ ناچار بێت کە بە حکومەتی کافرەکان رازی بێت. هەرکە ناوچەیەکی دیاریکراو رازی دەبوو ملکەچی اقتداری موسلمانەکان بێتو جەزیە بدات، ئەمە بە سەر ئەو کۆمەڵگایانەدا واجب بوو کە لەژێر چاودێری بوون (واتە، ذمییکان کە ((خاوەن پەرتووك))بوون، واتە مەسیحیو یهودییەکان)، و بەم شێوە چیتر گووشار نەدەکەوتە سەر هەردوو لایەن.

لە راستیدا موسڵمانە عەرەبەکان بەڵگەی بەهێزیان هەبوو کە نەیانهەوێ غیر عەرەبەکان بێنە رێزی ئیسلامەوە چونکە، بوون بە ئیسلام کاریگەری

ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر سەرچاوەکانی درامەدو زۆربوونی دابەشکردنی دەستکەوتەکان لە نێوان مووسڵمانەکاندا. بە پێچەوانەوە هۆکاری زۆر هەبوو کە بۆچی غەیر مووسڵمانەکان دەبێ حەزبکەن لەگەڵ گروپی دەسەڵات بکەون، ئاشکراترین نمادیشی هەمان قەبوولی ئاینیەکەی ئەوان بوو. بە پێچەوەانەی خۆراگری ئاشکرای نخبگان عەرەب، تاکو سەرەتای سەدەی هەشتەم بەرەبەرە ژمارەی نوێموسلمانەکانی غیرعەرەب زیاتر لە موسلمانەکانی عەرەب بوو. ئیسلام هەوڵی دابوو تمایزاتی چینایەتی‌و نژادی لەناو هەڵگری، بەڵام تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەریشدا ئەم ئامانجە وەك پێویست نەپێکرا. زۆرجار نوێموسلمانەکانی سەرەتاو منداڵەکانیان وایان هەست دەکرد کە مافی خۆیانە ئەگەر پێگەو امتیازەکانیان زۆرتر لە نوێموسلمانەکانی دواتر بێت‌و ئەندامانی بنەماڵەی دەسەڵاتدارەکان هەرگیز لەبیریان نەچووەوە کە لە هەزارییەوە گەیشتوونەتە ئەم پێگە. بیعتهای هوزایەتی‌و عەشیرەتی کاریگەرییان لە سەر انتصاباتی حکومەتی داناو بووە هۆی ڕکابەری‌کردن.

زۆرجار ئەم ڕکابەرییانە لەو پادگان شارانەدا کە لایەنگرانی دیاریکراو تییاندا زۆرینە بوو وەك پایگاکانی دەسەڵات پەرەیان سەند. هەربۆیە، والیانی خۆجێیی سوپای شەخصیان هەبوو کە هەمیشە ئامادەو گوێرایەڵ بوون. لەو ناوچەنەدا کە عەرەبەکان لەناو جەماوەرەکانی غیرعەرەبدا نیشتەجێ بوون، نوێموسلمانەکان گووشاریان دەخستە سەر موسلمانەکان بۆ ئەوەی پێگەو مافی یەکسانیان لەگەڵ ئەواندا هەبێ.

کێشەکە لێرەدا بوو کە غیرعەرەب، تەنانەت پاش پەسەندکردنی ئیسلام، هیچ جۆرە هاوپێوەندییەکی عەشیرەتی نەبوو کە بتوانێت لەناو کۆمەڵگای عەرەبدا ناسنامەیەکی هەبێت. کەواتە ئەم ڕێگە چارەیان دۆزییەوە کە موسلمانی عەرەب بتوانێت نوێموسلمانێکی غیرعەرەب لەژێر ناونیشانی (مولی) بگرێتە ژێر باڵی خۆی‌و بەشێوەیەك لە شێوەکان بیکاتە ئەندامێکی افتخاری

هۆزەکەی خۆی. هەڵبەتە ئەم موالیانە لە اختیاری هەر کەسێکدا بوونایە وەك حامی ئەوان بەژمار دەهاتن.

بەرە بەرە نابەرامبەری نێوان موسلمانە عەرەبەکانو موالییەکان بووە بیانوێ سەرەکی بۆ گروپە جۆراوجۆرەکان کە لە دەسەلاتی ئەمەوییەکان نارازی بوون. سەیر نییە لە رۆژهەلاتی ئێران، کە لە حواشی دەسەلاتی ئەمەوی بوو، بزوتنەوەیەك توانی حکومەتی ناوەندی سەرەوژێر بکاتو بە تەواوەتی دووبارە شکل بە کۆمەڵگای موسلمانەکان بداتەوە.

جگە لەو شکایتانەی کە لە خصلتی غیرئیسلامی گەورەپیاوانی ئەمەوی و نایەکسانییەك کە لە نێوان عەرەبو موالیاندا هەبوو، بزوتنەوەی دژە ئەمەوی توانی دۆزی مشروعیتی خودی حکومەتی ئەمەوی بهێنێتە گۆرەپانی باسو خواستەوە. معاویە، یەکەمین خلیفەی ئەمەوی، بە رەت کردنەوەی بەفەرمی ناسینی هەڵبژاردنی عەلی کوری مامو زاراوی پێغەمبەر، وەك چوارەمین خلیفە، دەسەلاتی بەدەست کەوتبوو. ژمارەیەکی کەم لە موسلمانەکان هەستیان دەکرد دەبێ لە مرجعێکی کاریزماتێکدا بەدوای پێشەوا بگەرێن کە لە بنەماڵەی پێغەمبەردا بۆماوە بێت. ئەمەوییەکان (لە راستیدا سێ خلیفەی یەکەم) لە روانگەی ((شیعەی علی)) یان شوێنکەوتەکانی عەلی هەر لە سەرەتاوە داگیرکەر بوون.

هەمووی ئەم پاڵنەرە دژەدەسەلاتانە لە شۆرشی ٧٤٩ـ٧٥١ ناسراو بە شۆرشی عەبباسی کۆبوونەوە، و تێیدا سوپایەکی موسلمان کە بنکەکەی لە خۆراسان بوو، بە سەرکردایەتی سەردارێکی ئێرانی بە ناوی ابومسلم، بەناوی یەکێك لە منداڵەکانی عەبباس (ابن عبدالمطلب) مامی پێغەمبەر راپەرینو شۆرشیان کرد. شورشیان توانیان دەسەلات لە چەنگی ئەمەوییەکان دربێنینو پاشان پایتەختەکەیان بگوازنەوە بین النهرینو دەسەلاتێکی نوێی ئیسلامی

هاوشێوەی مۆدیلی پاشایەتی ساسانییان دامەزرێنن. وەزیرو عمالی راشکاوانە ئێرانی بوون، زۆرینە نوێ موسلمانانێك بوون لە ئایینی زەردەشتی یان مەسیحی یان لە خانەدانی خاوەن دەسەلاتی بەرمەکی بەلخی کە بووزیی بوون.

لەساڵی ٧٦٢ خلیفە منصور پایتەخێکی نوێی لە بەغدا دروست کرد (بەغداد، ووشەیەکی فارسیە بەواتای ((خداداد))) بە بڕوایە کە ئەم کارە لە نێوان موسلمانەکانو (ئەو سەرزەوییانەی کە بە ئەندازەی چین دوورن) پێوەندی دروست دەکات[1].

## بزووتنەوەکانی ((ئایینی)) لە ئێران و ئاسیای ناوەڕاست

لەنێوەی یەکەمی سەدەی هەشتەم، سوپاکانی موسلمان چەندینجار هەوڵیان دەدا، اقتداریان لە ناوچە هەرەدوورەکانی رۆژهەلاتی جیهانی ئێرانی، سەغدو باکتریا، نیشان بدەنو بیپارێزن. سەرکردە خۆجێییەکان بە گرتنەبەری مۆدێلی هۆزەکانی عەرەبی سەردەمی پێغەمبەر، کاتێك دەبەزان (تسلیم) دەبوون و(دەبوونە موسلمان) و پاشان دووبارە (ردت)ین دەهێنا، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە وایان دەزانی دەتوانن خوی لێ لابدەن، یەکێك وەك تۆغشادە، پاشای سەغد، کە چەندجار ئەم کارەی کرد.

ئێرانییەکان ماوەیەکی زۆر وەك چینییەکان شارستانیەتی خۆیان بە گەورەترینو کۆنترین شارستانییەت داناوە. بۆ زۆربەی ئێرانییەکان، شکەست هێنان لە بەرامبەر عەرەبەکان، کە هەمیشە بە بەربەریان ناسیبوون، گەورترین زیانی دەروونیی مێژووی ملتەکەیان بوو و هەر وەهاش مایەوە. شاهنامە، حماسەی نەتەوەیی ئێرانی، هەرچەند فێردۆسی لە سەدەی دەیەمدا بۆ حامیەکی موسلمانی (توركی) نووسیوە، وەك جۆرێك تراژیدیای کۆتایی دەروانێتە داگیرکردنی ئێران بە دەستی عەرەبەکان.

لەوێوە کە لە سەردەمی ساسانی، مۆغەکانی زەردەشتیان راستەوخۆ بە بەشێك لە دربـاری پاشـایەتی دادەنـا، دارمـانی خانـەدانی ساسـانی بەناچـار بـەواتای دارمـانی توێـژی مۆبێـدەکانیش بـوو. بـەلأم بـەو واتایـە نـەبوو کـە ئایینەکانی ئێرانی نەیدەتوانی چەقی کۆکردنـەوەی هێـزی خۆراگرێ بەرامبـەر دەسەلأتی عەرەب ئامادە بکات.

لە ٧٧٧ (سالی سەدوشەستو حەوتی کۆچی) بـەهۆی روخسارێکی ناسـراو بە مقنع[1] کە خۆی بە پێغەمبەر دادەنا بزووتنەوەیـەکی خـۆراگری هاتـە ئـاراوە. شـوێنکەوتەکانی ،وەك مانەوییـەکان، جلکـی سـپییان دەبـەر دەکـرد ((جلـك سپییەکان)). سەدەیەك پاش ئەو نەرشەخی لە *تاریخی بۆخارا*دا دەنووسـێ: ((و خەلکی کۆکردەوەو ووتی دەزانن من کێم؟ خەلك ووتیان: تۆ هاشم ابن حکیمی. ووتی هەلـەتان کـردووە، مـن خـودای ئێـوەمو خـودای هـەمووی جیهـان... مـن ئەوەم کە بە شێوەی ئادەم خۆم بە خەلك نیشان داوە، دیسان لە شێوەی نوح، و دووبارە لە شێوەی ئیبراهیمو دووبارە لە شێوەی موسیو دیسان لە شێوەی عیساو دووبارە لە شێوەی محەمەد (ص)و دیسان وەك ابومسلمو دووبـارە بـەم شێوە کە ئێستا دەمبینن. خەلك ووتیان کەسانی تر هاتنو خۆیان بە پێغەمبـەر ناساند، تۆ خۆت بە خودا دادەنێیت، ووتی ئەوانە نفسانی بوونو مـن روحـانیم، کە لە ناخی ئەواندا بوومو مـن ئـەو توانایـەم هەیـە خـۆم بەهـەر شـێوەیەك کـە دەمهەوێ، بنوێنم.))[2] ((و نامەی بۆ هەر ولایەتێك نووسـیو دای بـە داعییـەکانی خۆیو لە ناوەرۆکی نامەکەدا ئاوهای نووسی کە ((... ثم للمقنع القدرة و العزة و البرهان. گرۆیی من بنو بزانن کە پاشایەتی بۆ منە،... رێزو کردگاری بـۆ منـەو جگە لە من خودایەکی تـر نییـە.... و هەرکـەس گرۆیـی مـن بێـت بەهەشـت بـۆ ئەوە، و هەرکەس گرۆیی نەبێت ئەوا دۆزەخ بۆ ئەوە.))[3]

---

[1]. "لەبـەر ئـەوە پێیـان ووتـووە مقنـع چـونکە سـەرو رووی خـۆی دادەپۆشـی... و هەمیـشە رووپۆشێکی سەوزی بە سەروو روویدا دەدا." تاریخ بخارا، هەمان، ل٢٠٩. و.

ئەرشەخی دەنووسێت ((زۆربەی دیەکانی سەغد روویان لە ئاپینی مقنع کرد)) ((...و موسلمانەکان لەو کارەی ئەوان تێمابوون، نفیر گەیشتە بەغدا، خەلیفەی ئەو سەردمە مەهدی بوو، دڵتەنگ بوو. ژمارەیەکی زۆر لەشکری نارد بۆ شەرکردن لەگەڵی، لە کۆتاییدا بۆخۆی هاتە نەێشابوور بۆنەهێشتنی ئەو فتنە. و دەترساو ترسی ئەوەش لەئارا دابوو کە ئیسلام بروخێتو ئاپینی مقنع هەمووی جیهان داگیر بکات.[4]))

مقنع وەك زۆربەی رووخسارە سەرکەوتووەکان مامۆستاو شارەزاری شعبدە بوو (و مشعبدو زانستی گلسمات فێربوو و بەباشی شعبدەی دەزانی) کاتێك ((پەنجاهەزار کەس لە لەشکری مقنع خەڵکی ماوراءالنهر لە تورکو ئەوانەی تر لەبەر درگای حصاری مقنع کۆبوونەوەو سوجدەیان دەبردو داوای چاوپێکەوتنیان لێدەکرد... بەو ژنانەی (کە لەگەڵی لە حصاردا بوون) فەرمووی هەر ژنێك ئاوێنەیەك بە دەستەوە بگرێو بچنە سەربانی حصار، و بەرامبەر یەکدی راوەستن، کاتێك کە تیشکی هەتاو لە زەویدەدات، هەموو ئاوێنەکان بە دەستەوە بگرنو بەرامبەر یەکدی رایگرن. خەڵك کۆبیونەوە، کاتێك تیشکی هەتاو لە ئاوێنەکان درا رووناکی ئاوێنەکان تەواوەتی ئەو تاوە داگرت. پاشان بە غلامێکی ووت بە بندگانم بڵێ کاتێك خودا رووی خۆی نیشانتان دەدات، سەیری بکەن. کاتێك بینیان هەمووی جیهان پڕ بوو لە رووناکی، ترسانو هەموویان بە یەکەوە سوجدەیان بردو ووتیان خودایا ئەم هێزو گەورییەی کە بینیمان بەسە....و ئەو هۆزە فخریان بەسەر ئەوانەی تردا دەکردو دەیانووت ئێمە خودامان بینی.)) پاش نۆ ساڵ شەڕو پێکدادان لە کۆتاییدا سوپای ئیسلام مقنعیان لە حصارەکەیدا گەمارۆدا. ئەویش ((خۆی خستە ناو تەندورەوە... هۆی سوتانی ئەوە بوو کە بەردەوام دەیووت کاتێك بندگان من عاصی بن، من دەچمە ئاسمانو لەوێوە فریشتەکان دێنمو ئەوان سزا دەدەم.))

ئەرشەخی دەڵێ لە سەردەمی ئەودا ((هێشتا ئەو هۆزە لە ولایەتی کشو نەخشەبو هەندێك لە دیەکانی بۆخارا ماون ... و لەسەر هەمان ئایین دەرۆنو مەزهەبەکەیان ئەوەیە کە نوێژ ناکەن، رۆژویان نییەو غسل جنابت ناکەن، بەلام امانت پارێزن، هەمووی ئەم شتانە لە موسلمانەکان دەشارنەوەو دعوی موسلمانی دەکەن. دەڵێن ئەوانە ژنەکانی یەکدیان لەلا مباحەو دەڵێن ژن وەك گوڵە، هەرکەس بۆنی پێوەو بکات هیچی لێ کەم نابێتەوە[5] ۱.))

تەنیا بزووتنەوەی دژەئیسلامی کە زیاتر لە هەمووان لە خودی ئێراندا کاریگەری هەبوو و لە ٨١٦ـ٨٣٧ درێژەی خایاند، *خورەمدینانی* ئازەربایجان بوون. رووخسارێکی پێغەمبەرانە بەناوی بابەك رێبەری ئەو بزووتنەوە بوو. خورەمدینان گروپێك بوون لە بزووتنەوەی چاکسازی کۆمەلایەتی سەدەی شەشەم کە بە مەزدەکییەکان ناسراون‌و لە یەك خولدا بە پشتگیری قوباد، پاشای ساسانی لە٤٨٨ـ٥٣١ بە شێوەیەکی فەرمی جێگای سەرنج بوو. بەلام خوسرەوی یەکەم، زۆر بێبەزەییانە سەرکوتی کردن.

مەزدەکییەکان جۆرێك فرقەی پیشاکۆمۆنیستی‌و نەیاری خاوەنداریتی تایبەت بوون، یەك لەوانە خاوەنداریتی هاوسەرەکان. بزووتنەوەی خورەمدینان پاش لەسێدارەدانی بابەك لەبەر چاوی خەڵك، کە بەتایبەت درێژماوەو فجیع بوو، چیتر نەیتوانی هێزێکی رامیاری بێت، بەلام بە بوونە ئیسلام بە نهێنی درێژەیان بە رێبازەکەیان داو لەوانەیە ئێستاش هەر هەبێت[6].

## ئیسلام‌و بازرگانی لە سەرزەوییەکانی رۆژهەلات

بەئیسلام بوونی ئاسیای ناوەراست وەك هەر نموونەیەکی گرۆییەکی تری گشتی فەرهەنگی، پرۆسەیەکی ئالۆز بوو کە لە یەك ئاست زیاتر روویدا.

---

[1]. نرشخی، هەمان ٩٠ـ٩١، ٩٣، ١٠٢ـ١٠٣. و.

یەکەمین و بەرچاوترین ئاستیی بەرفراوانبوونی هێزی رامیاری بوو. شایەنی باسە کە بەرفراوانبوونی سەرکردایەتی ئایینێکی تایبەت و پەرەسەندنی ئیمانەکەی یەك شت نییە، هەرچەند زۆرجار مێژوونووسەکان وەهایان نووسیوە کە گویا یەك شت بووە.

دەسەڵاتداریتی موسلمانەکان بەسەر نیوەی ڕۆژئاوای ڕێگەی ئاوریشم هەرلە سەرەتاوە، لە ناوەندی سەدەی هەشتەم، دامەزراو، هەرچەند جاروبار بە خولێکی هەڵە و شکەستەوە دەستی پێدەکرد. لەمەو پاش مووسلمانەکان زیاتر بازرگانی سەروئاسیاییان لەدەستدا هەبوو، کە ئەمە بووە فاکتەری گەورەی دووهەمی بەئیسلام کردنی فەرهەنگی ئاسیای ناوەڕاست. بەرەبەرە فاکتەری سێهەم کە دزەکردنی واعقانی خاوەن کەرامەتی موسلمان بوو، هاتە ناو ئەم پرۆسەوە.

چونکە هەوڵە بێ ژمارەکانی سەدەی هەشتەم بۆ کۆبوونەوە لەژێر ئاڵای رووخسارەکانی ئاییینی غیرئیسلامی خۆجێیی لەگەڵ شکەست ڕووبەروو ببووەوە ئاشکرایە چیتر ناکرێ راستی دەسەڵاتداری موسلمانەکان لەبەر چاو نەگیرێت. بەم پێیە رامیاری کاریگەرییەکی سەرەتایی بوو کە خەڵکی ئاسیای ناوەڕاستی هاندەدا واز لە نەریتە فەرهەنگییە خۆجێییەکانیان بێنن و بێنە جەرگەی فەرهەنگی جیهانی بەرەوپێشکەوتی ئیسلامی. بەڵام ئاشکرایە تەنیا دەسەڵاتدارە خۆجێییەکان هەمیشە تابعی برگەی محکومیت بە مەرگ دەبوون، بەتایبەت ئەوانەی دژی موسلمانەکان شۆرشی چەکدارییان کردبوو، ئەمەش قالبێکە کە ماوەیەکی زۆر دەستنیشانکەری پەرەسەندنی ئیسلام بووە. بەلایەنی کەمەوە خەڵك لە سەرەتا ئیمانی دەسەڵاتدارە نوێیەکانیان لەبەر هۆکاری تر پەسەند دەکرد کە بێگوومان لە نموونە تایبەتەکاندا ئەم هۆکارانە واتایی بوون.

حمایت جویی یەکێکە لە باوترین پاڵنەرەکان کە بۆ گرۆیی بوونی فەرهەنگی ـ ئایینی ئاماژەی پێکراوە. هەر کەسێك کە ڕاستەوخۆ لەبەر ژیانی خۆی، هەڵواسراوی دەسەڵات بێ، دەبێ هەستی بە کۆمەڵێك سود کردبێ لەوەی کە دێتە ڕیزی گروپە فەرهەنگییەکانی حامی خۆیو پەسەندکردنی هنجارهاو بەهاکانی ئەو گروپە دەسەڵاتدارە. پێدەچێ نوێموسلمانەکان تاڕادەیەکی زۆر هەمان مواچعی بەر لە داگیرکردنەکانیان پاراست بێتو بوونە مووسلمان دەرفەتەکانی گەیشتن بە موچعی نوێ یان باشتری زیاد دەکرد.

کارتێکەریی دووهەمو لەوانەیە گەورەترینیان کە لە ئیسلامی بووندا کاریگەری هەبوو بالادەستی موسلمانەکان بوو بەسەر چالاکی بازرگانیی. هەر بازرگانێك دەیتوانی هەست بکات کە بوونە مووسلمان پێوەندیو هاوکارییان لەگەڵ بازرگانە موسلمانەکانی تر ئاسان دەکات چ لە ناوەوە بێت یان لە دەرەوەی وولات، هەروەها نوێئایینەکان سودیان لەو بارودۆخە گونجاوە وەردەگرت کە کاربەدەستانی موسلمان پەرەیان پێدەداو هەروەها لە یاسا چەسپاوە ئیسلامیەکان دەربارەی بازرگانی کردن.

بوونی سەرکردایەتی موسلمانەکانو زۆربوونی دەسەڵاتیان لەسەر بازرگانی بەم واتایە بوو کە ئیسلامی سەرەتا لە شارەکانی ڕێگەی ئاوریشمدا بڵاو بووەوەو لە سەدەکانی دواتردا بوو کە بەرەو گوندەکانیش پەرەی سەند. ئیسلامی بوونی وردەوردەی هۆزەکانی ڕەوەندی تورکی ئاسیای ناوەڕاستو ئاسیای ناوەکی سەدەی دەیەم، سەرەتا ڕاستەوخۆ پێوەندی بە بەشداری روو لە زیادبوونیانەوە بوو لە بازرگانی کردن[7]، و لەگەڵ چالاکییەکانی ڕامیاری سێ سلسلەی موسلمانی تورك، واتە قەراختاییەکانو غەزنەوییەکانو سەجلوقیەکان، خێراتر بوو و لەگەڵ هەوڵەکانی داعیان موسلمان تکمیل بوو[8].

هۆکارێکی گرنگی سێهەم کە ئیسلامی بوونی ڕێگەی ئاوریشم توجیە دەکات، یان بابەتێك کە دەکەوێتە پاش هۆکارەکانی رامیاری‌و ئابووری،جژبە. هۆکاری موسلمان بوونی تاك هەر شتێك بێت، موسلمان بوون لە بەرەکانی دواتردا بە قوولی (و بەناچاری) ڕوودەدات، چونکە منداڵەکانی تاکی نوێموسلمان لەناو کۆمەلگای نوێی باوکیاندا پەروەردە دەبن نەك لە کۆمەلگای سەرەکی باوکدا[9].

جگە لەمانە، بەپێی یاسای ئیسلام ئەگەر پیاوێکی موسلمان لەگەڵ ژنێکی غیرمووسلمان هاوسەرگیری بکات، پێویستە منداڵەکانی ئەم هاوسەرگیرییە تێکەلاوە بەپێی ئایینی ئیسلامی پەروەدە بکرێن‌و پێبگەیەنرێن. بەلام بە سەرنجدانی ئەو خالانە لە بەشی یەکەمدا ئاماژەیان پێکرا دەربارەی رۆڵی ژنان لە پەروەردەی ئایینی، لەوانەیە دروستتر بێت وای دانێین کە هەندێ لایەنی ئایینی خۆجێیی پێش ئیسلامی لە ڕێگەی گواستنەوەیان بەهۆی هاوسەرە غیرموسلمانەکانی موسلمانەکانەوە مابێتەوە.

گوندنشینەکانی ئاسیای ناوەڕاست زیاتر لە هاوتا شارنشینەکانیان پابەندی نەریتەکانی ئایینی خۆجێیی ئێرانی (کشتوکالی) یان تورکەکان (ڕەوەندی شوانی) بوون، چونکە بەشێوەیەکی راستەخۆ کەمتر دەکەوتنە ژێر کاریگەری ئەو هۆکارانەی کە پێشتر باسمان کرد. هەرچەند بەرەبەرە هەمان کاریگەری لە تەواوەتی ناوچەکانی گوندیش دەبینرا. کاریگەرییەکی ترو تانەت گرنگتری بە ئیسلام کردن بەتایبەتی لەناو هۆزەکانی شوانیی لە ڕێگەی چالاکییەکانی مشایخ صوفییە ڕوویدا، چونکە بە ئەرکی خۆیانیان دەزانی کە ئیسلام بۆ دوورترین ناوچەکان بگوازنەوە. تارادەیەکی زۆر کاریگەرییان لە فرەی تاکەکەسی خۆیانەوە سەرچاوەی دەگرت‌و ئەمەش زۆرجار لەبەر چاوی مریدان دەیکردن بە سەرچاوەی باوەڕپێکراوی دین‌و هەندێجار تەنانەت لە سەروی شریعتەوە دادەنران.

تعبیرەکانی تاکەکەسی خودی شیخە لە پەیامی ئیسلام، بناغەی ئیمانێك بوو کە شوانەکان دەیانبیست. زۆرجار ئەم تعبیرە تاکەکەسیانە لەگەڵ باوەڕو کردارەکانی خۆجێیی پێشوتر دەگوونجان‌و دەبووە هۆی گۆڕانی دەربرینی گشتیی دەربارەی ئیسلام کە دەیتوانی لادانێکی واتایی بێت لەو نەریتانەی کە لە شارەکانەوە هەڵقولابوو. لە هەندێ ڕووەوە ئایینی خۆجێیی لە ئاسیای ناوەڕاست، چ لە جۆری ئێرانی یان تورکی، هەرگیز بەڕاستی لەناو نەچوو بەڵکو واتاو تعبیرو ڤواهری ئیسلامی بەخۆیەوە گرت.

## چارەنووسی ئایینی زەردەشتی‌و بوودیزم لە ئاسیای ناوەڕاست

تاکوو سەردەمی داگیرکردنەکانی عەرەبەکان، لە ناوند هەتا کۆتایی سەدەی حەوتەم، ئەو توخمانەی ئایینی سەغدیی کە نووسەرە موسلمانەکان زۆرتر لە هەمووان سەرنجیان داوەو دەربارەیان نووسیوە، واتە هەندێ بابەت وەك ئاگرپەرستی‌و دانانی جنازەی مردوو لەژێر ئاسمان، کۆمەڵە توخمێك بوون کە زانا نوێیەکان بە ئایینی زەردەشتی دەبەستنەوە. لە ڕاپۆرتەکانی موسلمانەکاندا دەربارەی داگیرکردنی سێند، لە شمالی ڕۆژئاوای هیند دژبەری هەیە، چونکە واپێدەچێ دیانەتی خۆجێیی زۆر بەتووندی ڕەهەندێکی بووزی هەبوو. بەڵام تەنانەت لە ڕاپۆرتەکانی موسلمانەکانی دەربارەی ئاسیای ناوەڕاست، کۆمەڵێك لایەنی فەرهەنگی خۆجێی دەبینین کە بەتەواوەتی لەگەڵ ئایینی زەردەشتی کانونی/ قانونی ئێرانی ساسانی ڕێك ناکەوێت.

نەرشەخی دەنووسێت کە ((مزگەوتی جامعەی بۆخارام بینی کە لەسەر درگاکانی ڕووخساری ئەویان داتاشیوەو لەوەی تر گەراون.)) (هەمان، لا٦٧) ڕوونی دەکاتەوە کە ئەم نوێموسلمانانە ((درگاکانی کۆشکەکانی ئەوانیان) (دەوڵەمەندەکان) هەڵکندو هێنایان‌و لەسەر ئەو درگایانە هەرکەس ڕووخساری بۆتی خۆیان دروست کردبوو.)) (ص٦٨)

لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم نموونە، نەرشەخی لە جێگایەکی تردا بەڵگەیەك لە کرداری ئاشکرای (زەردەشتی) دەخاتە بەردەست. دەڵێ کە لە مەرگی تۆغشادەدا، سەرکردەی سەدەی هەشتەمی سەغدی کە موسڵمان بوونەکەی بە ئاشکرا لەبەر هۆکۆکاریکی رامیاری بوو- ((ژێردەستەکانی هاتنو گۆشیتان لە لاشەی کردەوەو ئیسقانەکانیان هێنایە بۆخارا.[10])) (هەمان، لا٨٥)

دەتوانین هەندێ بابەتی بەکارهێنانی شمایل نگاری لەلای سەغدییەکان لە دابو نەریتەکانی بەخاکسپاردنیاندابیبینین کە لەگەڵ هەردوو ئایینی زەردەشتی قانونیو ئیسلام ناگونجێت. هەرچەند ئێرانییەکانی ئاسیای ناوەڕاست وەك ساسانیەکان مردووکانیان لەژێر ئاسماندا دادەنا تاکوو داڵەکان ئیسقانەکانیان خاوێن بکەنەوە، بەڵام دواتر بە پێچەوانەی زەردەشتیەکانی نەجدی ئێران، ئێسقانەکانیان لەناو استودانەی قورینی نیگارکێشدا دەناشت[11].

راپۆرتەکانی بازرگانەکانی سەغدیو اجتماعاتی بازرگانییان لە رووی رۆژهەڵاتی رێگەی ئاوریشم بۆ چین بە شێوەی جۆراوجۆر وەهایان دەناسێنێت کە خاوەن کرداری بووزی یان زەردەشتی بوونە. هەرچەند لەوانەیە سەغدییەکانی هەردوو ئایینەکە بەباشی لەناو ئەم کۆمەڵەی کۆچبەرانەدا نیشان درابن، بەڵام پێویست ناکات هێڵەکان بەروونی بکێشرێنەوە، وەك بینیومانە، گروپی بیروو باوەرو کرداری ئایینی سەغدییەکان دەتوانی هەردوو نەریتەکە بگرێتەوە. جگە لەمانە، هاوسەنگی توخمەکان لەناو اجتماعاتی جۆراوجۆرنی سەغدیی یان تەنانەت لەناو تاکەکانیشدا جیاوازییان لەگەڵ یەکدی هەبوو.

چونکە سەغد لە رووی ئیدارییەوە کەوتە *دارالاسلام*، بەرەبەرە سەغدییەکان جۆیی فەرهەنگی بەرفراوانی ئێرانی بوونو زمانی فارسیان لە زمانی خۆیان بەباشتر زانیو زیاتر لە جاران بە ئێرانی ناسران. بووژاندنەوەی وێژەی

زەردەشتی لە سەدەی نۆیەم، کە لە ئێران وەك کاردانەوەیەکی لێهات بۆ گرۆیی گشتی زەردەشتییەکان بەرامبەر بەئیسلام، لەوانەیە پێوەندی شێوەی بنەرەتی ئەم ئایینەی لەگەڵ ئایینەکانی دانیشتوانی ئاسیای ناوەڕاست، کە هێشتا نەببون بە مووسلمان، باش کرد. لە ئاسیای ناوەڕاست، وەك ئێران، زەردەشتییەکانیان وەك کۆمەڵەی "ذمی" پۆلێن دەکردو لە سەمەرقەند لە جیاتی ئەوەی جزیە لە اجتماعی زەردەشتیەکان وەرگرن، کردبوویاننە پاسەوانی قناتەکان[12].

لە سەرچاوەکانی چینی سەدەی حەوتەمدا ئامازە بەزیادبوونی اجتماعاتی زەردەشتی ئەوێ کراوە. وادیارە ژمارەیەکی زۆری زەردەشتیەکان پاش داگیرکردنی ئێران بەدەستی موسڵمانەکانو دوابەدوای پیروز، کوری یەزدگێردی سێهەم، دواینترین پاشای ساسانی، بەرەو ڕۆژهەڵاتی ڕێگەی ئاوریشم ڕایان کردبوو. درباری تانگ لە چانگ ئان وەك ((پاشای ئێران)) بەخێرهاتنی پیروزی کردو کردی بە یەکێك لە سەردارانی پاسەوانی پاشا. ژمارەیەکی زۆر پنابەی لەگەڵ بوو کە ڕێگەیان پێدرا چەند پەرستگەیەکی ئاگر (ئاگرکەدە)) دروست بکەنو تێیدا نیایش بکەن.

نووسیویانە کە اجتماعاتی زەردەشتی کە وولاتیان بەجێ هێشتبوو هەتا سەردەمی مەغۆل لە چین گەشاوە بوون. ئایینی زەردەشت ئاینی بانگێشتو پەروپاگەندە نییەو پێناچێت ئەم اجتماعات نوێئاینی خۆجێییشیان گرتبێتەوە، بەڵام ئەگەری زۆرە ئەو زەردەشتیانەی کە خاستگاهیان ئاسیای ناوەڕاست بوو و پەنابەرانو بازرگانەکانی خودی ئێرانیشی گرتبێتەوە. وادیارە پەرستگە بێژمارەکانی سەردەمی تانگ لە چانگ ئان، لویانگ، کای فێنگ و شوێنەکانی تر ئاگرکەدەی زەردەشتی بوونە. چیرۆکەکانی عامیانەی چینی سەردەمی تانگ ئامازەیەکە بە ئاشنایی جەماوەری چینی لەگەڵ بازرگانەکانی زەردەشتی.

بەم پێیە، هەرچەند دەتوانین دەربارەی هەبوونی ئایینێکی زەردەشتی "قانونی" دیاریکرا لە ڕۆژهەلاتی ئێران لە سەردەمەکانی پاش ساسانی چەند گریمانێکی سنوردارمان هەبێ، بەلام ئەو هەولانەی دەدرێن بۆ پۆلێنکردنی سەرزەوییەکانی سەغدو قلمروەکانی مجاوری لە ئاسیای ناوەڕاست کە دانیشتووەکانی ئێرانین، بۆ ئەوەی ناوچەکان بەتایبەتی لە هەر سەردەمێکدا بە ((زەردەشتی)) دابنێن، توجیەپدیز نییە.

لەلایەکی ترەوە، هەمیشە بیروباوەرو کرداری ئایینی ئێرانییەکانی ئاسیای ناوەڕاست لە زۆر لایەنەوە لەگەل بیروباوەرو کرداری ئێرانییەکانی ڕۆژئاوای دوور هاوبەش بووەو ئەمە ڕاستیەکە کە هەتاکوو ئەمرۆش باوەر پێکراو بووە.

بەپێچەوانەی بێزاری تایبەتی موسلمانەکان لە بوودیزم وەك ئایینی ((بت پەرەستی))، و لاوازتر لە ئایینەکانی ((خاوەن پەرتوك))، کۆمەلێك بەلگە لەبەر دەستن کە هەبوونی ئەم ئایینە لە سەردەمی ئیسلام دەسەلمێنن. جگە لەمە، خانەدانی بەرمەکی کە چەندین وەزیری زۆر بەتواناو شارەزای بە حکومەتی سەرەتایی عەبباسی بەخشی، لە اصلدا خاندانێکی بووزی بوون کە پشتاوپشت روحانی بوون.

بەرمەکییەکان بەڕێوەبردنی دیرێکیان بەدەستەوە بوو ناسراو بە نوبێهار[1]. ئەم ووشە بەفارسیکراوی نەڤەڤیهارەیە[2]، بەواتای ((بێهاری نوێ))/ پەرستگەی نوێ، لە نزیکی بەلخ کە گویا ناوەندی توری ئەو دیرانە بووە کە لە تەواوی ئێراندا بلاوببوونەوە[14]. ووتویانە کە موسلمانبوونی بەرمەکییەکان سەرزەوییەکانی ڕۆژهەلاتی لە هێزێکی گەورەی دژەئیسلام بەتاڵ کردو بەم کارە موسلمانبوونیان لەم ناوچانەدا ئاسان کرد[15]. بەلام پاش ئەوەی کە عباسییەکان سێ ساڵ پاش ئەوەی کە سەرداری ئێرانی شۆرشەکەیانی سەرخست ابومسلمیان لە سێدارە دا، شایعاتێکی زۆر دەربارەی تجسدی دووبارەی ئەو دەماودەم دەگەرا کە ئامارەیەك بوو بۆ مانەوەی باوەری بووزی لەناو خەڵکدا[16].

تەبەری یەکێکە لە بەناوبانگترین مێژوونووسەکانی کۆنی موسلمان، دەڵێ لە کۆتایی سەدەی نۆیەم بتەکانی بووزییان لە کابۆلەوە هێنابووە بەغدا[17]. نەرشەخی زانیاری سەرنجراکێش دەربارەی بۆخارا دەبەخشێت. دەڵێ لە بازار لە قەراغ مزگەوتی ماخ - گویا سەرەتا پەرستگەیەکی بووزی بوو و پاشان بەرلە

---

[1] . نووسەر لێرەدا دەنووسێت "لە فارسیدا پێی دەڵێن ((بەهاری نوێ)) کە هاورەگی هەڵەی (faux ami) نەڤە ڤیهارەی سەنسکریتییە." جێگای باسە کە ووشەی "بێهار"، کە پێویستە لێرەدا بە بێهار bihar/ behar بخوێنرێتەوە نەك بەهار bahar، لە وێژەی فارسی ئێستادا ووشەیەکی ناسراوە، هەڵبەتە بەواتای بتخانە. هەروەها Behar/ Bihar ناوی ایالتێکە لە هیند (کە لەم سالآنەدا بە "بیهار"یش نووسییانە) ئەوەش بەهۆی هەبوونی "بێهار"ەکانی ناوەوەی. بەپێی هەندێ لە روانگەکانی، لە سەغدییدا بە "فەرخار" هاتووەکە ئەمەش لە وێژەی فارسی ئێستادا هەیە، هەروەها "بحرآباد" یان "بهرآباد"های ئێرانی کە ئەوانیشیان بە "بهارآباد" زانیوە. سەرنجی ئەم هەلبەستەی مسعود سعد سلمان بکەن:

بهارخانەی چین است یا شکفته بهار      مە دو پنج و چهار است یا بت فرخار

لە هەندێ سەرچاوەی کۆندا "نۆبێهار"یان بە ئاگرکەدە داناوە کە هەڵەیە. و.

[2] . Nava vihara

هـــاتنى موســـلمانەكان، ساســـانييەكان ئـــەوێيان كردبـــووە ئاگركـــەدەو موسلمانەكانيش كرديانە مزگەوت ـ لە ساڵێكدا دووجار دەبووە بـازار كـە تێيـدا بتەكانى بووزى بە ٥٠٠٠٠ ديرهەم دەفروشران[18][1] .

ابن حوقل، مێژوونوسێكى ترى موسلمان ، دەنووسێ كە لە سەدەى دەيـەم، هەيكەڵى دارينى ئاژەڵەكانيان لە سەمەرقەند دەفرۆشت[19] .

ســـامانييەكان كـــە خانـــەدانێكى موســـلمانى ئێرانـــى بـــوونو زۆربـــەى سەرزەوييەكانى ئاسياى ناوەڕاست كە پێشتر بـووزى بـوون بـەوان گەيـشتبوو، پێدەچێ كە لە تەلارسازييەكانياندا كاريگەرى لە هونـەرى بـووزيى وەرگرتبێـت، وەك نەخشەى چـوارتاقى سـەردرگاى خوێنـدنگا ئايينيـەكان كـە لـە سـەردەمى ئەوانـدا پـەرەىـسەند. لەراسـتيدا، لەوانەيـە بيروكـەى خوێنـدنگا لـە هـەمان خوێندنگاكانى بووزييەوە وەگـيرا بێـت چـونكە يەكـەمجار ئـەم دامەزراوانـە لـەم بەشەى جيهانى ئيسلاميدا پەيدا بوون.

لە بەشى دوورترى رۆژهەلات، كە هێزى موسلمانەكان لەو ناوچانەدا درەنگتر سەقامگير بوو و لە ئەنجامدا بووە هۆى زياتر مانەوى بووديزم لـەوێ، كۆمـەڵێك مۆديلى هاوشێوە دەبينرێت. ئۆرال ستاين لـەو هەلكۆڵينانـەى كـە لـە حـوزەى تاريم ئەنجامى داوە، گومبەزێكى توركى كۆنى تايبەت بە موسلمانانى دۆزييەوە كـە مقـبرەى چـوارەم ئيمامـە، بـەلام بـەپێى راى ئـەو ئـەم مقـبرەى لـە اصـلدا مۆنيۆمێنێكى بووزى بووە[20] . لە سيرەى موسلمانێكى سـەدەى شـانزدەيەم، لـە

[1] . "ساڵى دووجار، هەر جارە رۆژێك بازاريان دەكردو هـەر جـارێ: كـە بـازار هـەبوو، تێيـدا بتيـان دەفرۆشت." (تاريخ بخارا، ٢٩٧). هەلبەتە لەم رستانە بەتايبەت لە رەستەى كۆتاييەوە كـە پـەنجا دێرهەم بازرگانى كـرا، ناتوانرێـت بەدڵنياييـەوە بووترێـت كـە تـەنيا ٥٠٠٠٠ دێرهـەم بـت دەركـردراو دەفرۆشرا. ئەگەر ئەم بازارە تەنيا بازارى (بت فرۆشـەكان) بوايـە لەوانەيـە وەهـا دەرەنجامێك زۆر بيراهە نەدەبوو، بەلام بـازارى پـێش مزگـەوت، ئـەويش سـالى دووجـار، "بـازارى مكـارە" بـوو، كـە ئێستاش لە ئێران بە شێوەى جۆراوجۆر دەكرێتەوە. و.

حوزەی تاریم ئاماژە بە گومبەزێکی تر دەکرێت، بەناوی *مێژووی ئۆوەیسیە*، کە ئەفسانەیەك لەخۆ دەگرێ دەربارەی صوفییەك بەناوی خۆشەویستی *کیوی مارو* مارێکی پیرۆز. پێدەچێ لە رووی چیرۆکێکی بوودیی دەربارەی مارێکەوە وەرگیرابێت کە پێوەندی بە ناگارجونای[1] پیتۆلەوە هەبوو[21].

## تحولی دوایی تورەکانی بازرگانی یەهودیی

بێگومان یەهودییەکان بەشدارییان لە تورەکانی بازرگانی ڕێگەی ئاوریشم دەکرد کە مەدیتەرانەی رووەمی بە چینی سەردەمی هەنی کۆنئارا دەبەستەوە. لە سەردەمی موسلمانەکان بە بازرگانەکانی یەهودیی دەووترا رادانیە[2] (عەرەبی: الرادانیە، لەوانەیە لە فارسی (راهدان ) وەرگیرابێت واتە کەسێك کە شارەزای ڕێگەیە)، پایگاەی ممتازیان هەبوو کە ڕێگەی پێ دەدان بە ئازادی لە نێوان جیهانی موسلمان و مەسیحی دا هاتووچۆ بکەن، بەلأم ئەگەری زۆرە کە خاستگاەی سیستەمی رادانی بەلایەنی کەمەوە بگاتە چەند سەدە پێش هاتنی ئیسلام، چونکە کاتێك ناوی رادانییەکان لە نووسراوەی موسلمانەکاندا ئاماژەی پێ دەدرێ ئەم سیستێمە زۆر پەرەسەندو بووە. سەرچاوەکانی لاتینی نیشاندەری ئەوەن کە لە سەدەکانی پێشوودا بازرگانی مەدیتەرانە لە رۆژئاوا بەدەستی یەهودییەکانو لە رۆژهەلأتی بیزەنتی بەدەستی شامییەکان/ سورییەکانەوە بوو[23].

پایگاە سەرەکی رادانییەکان لە گۆلی رووەمی[3]، لە ئارێل[4] و مارسی[5] جێگیربوو[24]. ئەوانە بەتایبەتی کوێلەفرۆشییان دەکردو لە ڤێردۆن[6] پاش

---

[1]. Nagarjuna
[2]. Radanite
[3]. Roman Gaul
[4]. Arles
[5]. Marseille
[6]. Verdum

نەشتەرگەرییەك ئەم كۆیلانەیان دەكردە خواجە. هەر پیشەی كۆیلەفرۆشیی رادانییە یەهودییەكان بوو كە پێوەندی دروست دەكرد لە نێوان ئەوانو خەزرەكانی توركی شمالی ناوچەی زەریای مازەندەران. ئەم ناوچە شوێنی هێنانو بردنی كۆیلە ئێسلاوەكان بوو (Slav وەگیراو لە لاتینی Sclav "Slave"=كۆیلە، ووشەی عەرەبی صقلیبە ((صقلاب/ سقلاب/ سقلب))).

خەزەرەكان كە لقێكی شمالی گرنگی رێگەی ئاوریشمیان بەدەستەوە بوو لە باردۆخێكی زۆرباشدا بوون كە بینە دەلالانی نێوان رۆژهەلاتو رۆژئاوا. ئەمانە پێوەندی هاوژینیان لەگەلّ هۆزەكانی ئێرانی تختەقاپوشدە لە جنوبی رۆژهەلاتی رێگەی ئاوریشم هەبوو كە زۆر بەباشی لەم ووتەبەنرخەی توركییەدا هاتووە(Tatsiz Turk bolmas, bashsiz bork bolmas) یان ((نەك تورك بەبێ تاجیك دەبێتە (بازرگانی ئێرانی) نەك كلاویش بەبێسەر دەبێ)). نخبگانی خەزەر كە لە سودی بازرگانیی رادانییەكان لە رووی پایگاە ئایینی خنپی، تێگەیشتبوون لە ئەنجامدا یەهودییەتیان پەسەندكرد، هەرچەندە خاقان، سەركردەی مەزنو هەروەها زۆربەی خەلّك، ئایینی توركی شەمەنی اصلی خۆیانیان پاراست[25].

ابن خردادبە، جوگرافیناسی ئێرانی سەدەی نۆیەم،بەم شێوە باسی رادانییەكان دەكات: ((بە زمانەكانی عەرەبی، فارسی، روومی (یونانی)، فەرهەنگی، صقلبی (ئیسلاو) قسەدەكەنو لە رۆژهەلات هەتا رۆژئاواو لە رۆژئاوا هەتا رۆژهەلات لە رێگەی دەریاو ووشكاییەوە سەفەر دەكەن، لە رۆژئاواوە كۆیلەو كەنیزو دیباجو خەزو فرۆو سمۆرەو شەمشێر دینو بە سواری قایق دەچنە ناو دەریای رۆژئاواو لە فەرما دەردەچن....))[26]

---

[1] . مسالك و ممالك، ترجمه سعید خاكوند. مؤسسه مطالعات و انتشارات تاریخی، میراث ملل. تهران: ١٣٧١، ص١٤٥. و.

ابن خردادبە باسی چوار ڕێگەی بازرگانی دەکات کە رادانییەکان تێدا چالاکییان دەکرد. یەکەمیان لە گۆلەو لە قەرخەکانی مەدیتەرانەو ڕێگەی بری دەچێتە دەریای سوورو لە ڕێگەی اقیانوس هیند بۆ ئاسیای خاوری، دووهەمیان لە ڕێگەی بین النهرین، وسێیەمیان لە ڕێگەی ئەفریقای شمالی. ڕێگەی چوارەم بەرەو شمال لە ڕێگەی سەرزەوییەکانی خەزەر تێدەپەریو لەوێوە دەگەیشتەوە ڕێگەی ئاوریشم: (هەندێجار هەر بەم شێوە ڕێگای پشتەوەی رووم دەگرێتو لە وولاتی ئیسلاو تێدەپەرێ دەگاتە خام لیف (ئێتێل[1]) پایتەختی خەزەران. لە دەریای جۆرجان (مازەندران) بە سواری کەشتی دەگەیشتنە بەلخ پاشان لە جەیحون تێدەپەرینو گەشتەکەیان بەرەو یورتەکانی (تورکەکانی) تەقوز ئۆغۆز[2]و لەوێوەش بۆ چین درێژەیان پێدەدا[27].

دیارە کە گەیاندنی یەهودیەت بە پایگاهی فەرمی لە قلمروهای خەزەران برگەی شمالی ئاسان کردووە. بەهەر حال، راپۆرتەکەی ابن خردادبە روونی دەکات کە یەهودییەکان لەو سەردەمەدا لە هەموو ڕێگەکانی بازرگانییە گەورەندا چالاك بوون کە ئەمە هەروەها ئاماژەیەکە بە بوونی اجتماعاتی پراکنشی یەهودییەکان کە لە مزڵە جۆراوجۆرەکانی ئەو ڕێگەدا دەژیان.

ئاستی بەربلاوی ئەم اجتماعاتی پراکنشەو ئەم راستییە کە پەیوەندییان لەگەڵ یەکدی هەبووە، بەناوبردنی ژمارەیەکی زۆر لە شوێنەکان تایید دەبێو لە وێژەیی ڕێسپونسای گائۆنی[3] ئاماژەیان پێ کراوە (فێرکردنی خاخامی لە بواری دۆزەکانی ژیانی یەهود) کەلە سەدەی هەشتەم دەستی پێکراوە.

---

[1] . Etil

[2] . بە شێوەکانی تۆغزغۆز/ئۆغزەکان/ غۆزەکان (ئۆ هۆز)یش نووسراوە. و.

[3] . Gaonic Responsa

## ئیسماعیلییەکان

لە سەدەی یازدەو دوانزدەدا خاچییەکانی فرانکی کۆمەڵە چیرۆکێکیان لەگەڵ خۆیان بۆ ئەورووپا هێنا دەربارەی فرقەی نهێنیی توندرەو بە سەرکردایەتی شێخ الجبل کە بە ئەساسین ناسران[1]. اشتقاقی ئەم زاراوە تا ئێستاش جێگەی باس‌وخواستە، چیرۆکە عامیانەکان وای دادەنێن لە حەشاشین/ حەشاشون وەرگیراوەو مدعین کە ئەندامانی ئەم فرقە بەرلە کووشتنی رامیارەکانی ناسراوی موسلمان‌و کەسانی تر، حەشیشیان بەکار دەهێنا. اشتقاقێکی جدیتر دەیانگەیەنێتە ئەساسیون[2].

فرقەی ناوبراو لقێك بوو لە ((شیعەی عەلی)) کە بە چەند شێوەیەك ناسراو بوون: یەکێکیان شیعەکانی حەوت ئیمامی، بەهۆی لادانی سلسلەی ئیمامەکانیان لە زۆرینەی جەماوەری شیعە پاش ئیمامی شەشەم، ئەوەی تریان ئیسماعلییە بوو، بەهۆی ئیمامی حەوتەم، ئیسماعیل، یان لە سەرچاوە ئیسلامییە کۆنترەکاندا بە ((باطنیە)) ناسراون (لە ووشەی عەرەبی ((باطن)) وەرگیراوە بەهۆی کرداری پەیڕەوە نهێنییەکان.)

سلسلەیەکی حەوت ئیمامی، واتە فاطمیە، بە درێژایی سەدەی یازدەهەم لە میسرەوە فەرمانیان دەدەکردو زۆربەی پێشکەوتەکانیان لە ڕێگەی ئەو بازرگانییەوە بەدەست هێنا کە مەدیتەرانەی بە دەریای سوورەوە دەبەستەوە. فاطمییەکان پشتگیری حکومییان بۆ ئیسماعیلییەکان دەستەبەرکردو بەرنامەیەکی بانگهێشتی چالاك‌و سەرکەوتوویان هێنا ئاراوە. بەناوبانگترین داعی ئیسماعیلیی ئەم سەردەمە پیتۆلی شاعیر، ناسرخەسرەوی قوبادیانییە کە لە ڕێگەی ئاوریشم، لە شوێنی لەدایکبوونی لە خوراسانی ڕۆژهەلات هەتاکو

---

[1]. Assassin

[2]. لەوانەیە لە (اساس) وەرگیرابێت. بە زمانی ئەمڕۆ (بنیادگرایان)؟ و.

قاهیره، پایتەختی فاطمییەکان، سەفەری کردو لە درێژایی ئەم ڕێگەیەدا سەردانی ناوەندەکانی حەوت ئیمامی کرد[29].

حکومەتی سوننەی بەغدا سەرکەوتنەکانی بانگهێشتی حەوت ئیمامییەکانی هەرەشەکەر دەدیتو لەهەر جێگایەك کە اجتماعاتی ئەوانی پەیدا دەکرد سەرکوتی دەکردن. لە وەلامی ئەم ئازارو سەرکووتانەدا بوو کە فداییەکان دەستیان دایە کارەساتی کووشتنەکانی رامیاریی بەم مەبەستە کە ترسو توقین بخەنە ناو دڵی دوژمنەکانیانەوە. ئەمانە کە بە ئەساسین ناسرانو مدافعانی ئیمانەکەیان بوون، لە بەئەنجام گەیاندنی ماموریەتەکانیاندا زۆر سەرکەوتوو بوون[30]. لەوانەیە بەناوبانگترین قوربانی ئەوان خواجە نیزام الملك، وەزیری ئێرانی تورکە سوننە دەمارگرژەکانی سەلجوقی بوو کە لە ١٠٩٢ لەناو تختروانش بە خەنجەر کوژرا.

پاش دووساڵ اجتماعی حەوت ئیمامییەکان لەسەر دۆزی جێنشینی لێك هەڵبران. باڵی کەمینە بەناوی یەکێك لە سەرکردە شەهیدەکانیان، نزاریە/ نزارییەکان ناسران، حسن صباح سەرکردایەتی بزووتنەوەی نزاری گرتە ئەستۆ. ئەو خەڵکی ئێرانو پەروەردەی میسر بوو کە فەرمانی کوشتنی خواجە نیزام الملکی دەرکردبوو[31]. اجتماعی حەسەن لە قەلایەکی کوێستانی لە ئەلەموت (قەزوین) لە شمالی ئێران بەڕێوە دەچوو. ئەم ناوچە کە هەمیشە لاری دەکرد کە تابعی خلیفەکان بێتو ببوو بە هێلانەی زۆربەی بزووتنەوەکانی هێتێرۆدۆکس، زیاتر لە سەدوبیست ساڵ مامنێك بوو بۆ نزارییەکان تاکوو لە کۆتاییدا هەوڵی ڕێکخراوی مەغۆڵەکان لە ١٢٢٦ هەڵیتەکاندن.

## ئیسلامی بوونی سلسلەهای تورك

کاتێك یەکەمین بازرگانو داعییەکان موسلمان گەیشتنە حوزەی تاریم لە روانگەی ئایینییەوە لەگەڵ یەکێك لە فەرهەنگە روو لە زیادبوونەکانی جیهان رووبەروو بوونەوە. لەوانەیە لەو سەردەمەدا زۆربەی دانیشتوانی ئەو ناوچە بووزی بووبن، بەڵام اجتماعاتی مانەویی‌و مەسیحی نەستوریش لەوێ بوون. دەبێ ئایینە خۆجێییە جۆراوجۆرەکانو ئایینە نەریتخوازەکانیش نوێنەرەکانی خۆیان هەبێت.

بەپێی راپۆرتە خۆجێییەکان، ئیسلامی بوونی کاشغەر لە نیوەی یەکەمی سەدەی دەیەم دەستی پێکرد، واتە کاتێك سەتۆق بۆغرا، تورك زادەیەکی خۆجێیی عەشیرەتێك کە دواتر بە قەراخانییەکان ناسران، لەسەر دەستی نصر بن منصور لە خانەدانی سامانی بوو بە موسلمان، کە دەسلاتی بەسەر ماوراءالنهرو ئێرانی رۆژهەلاتدا هەبوو[32]. لەوانەیە نصریان بۆ گریبەستی پەیماننامەیەکی بازرگانی ناردبێت، چونکە بەپێی چیرۆکەکە، ژمارەیەکی زۆری کاروانەکانی بۆخارا لەگەڵیدا هاورێکە بوون.

لە کۆتاییدا سەتۆق بۆغرا بوو بە خانی کاشغەر پێگەیەکی فەرمی بە ئیسلام بەخشی. هەرچەند لەوانەیە چەند لایەنێکی ئەم راپۆرتە ئەفسانە بێت، بەلام لەگەڵ رامیاری بەناوبانگی سامانییەکان یەك دەگرێتەوە کە راسپاردەکانیان بۆ لای هۆزە جۆراوجۆرەکانی تورك دەنارد لە تەواوەتی ئاسیای ناوەکی، بەو هیوایە کە لە هێرشکەرەوە ببیانکاتە بازرگان.

موسلمان بوونی سەتۆق بۆغراخان، کە نزیکەی ٩٥٥ کۆچی دوایی کرد، قراخانییەکان بوون بە یەکەمین سلسلەی تورکی کە بەفەرمی لایەنگرییان لە ئیسلام کرد[33]. ابن اثیرو ابن مسکویە دوو مێژوونووسی موسلمان دەڵێن کە لە

ساڵی ٩٦٠ ژمارەیەکی زۆری تورکەکان ـ ٢٠٠٠٠٠ خێوەت ـ بوونە موسڵمان[34].
ئەم گروپە بەگشتی بەهەمان قەراخانییەکان دانراون. لە درێژایی نیوەی یەکەمی سەدەی یازدەیەم،لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ڕێگەی ئاوریشم لە ئاسیای ناوەڕاست کە لە دەستی موسڵمانەکان دابوو، گرنگی پەیدا کرد.

دوو سلسلەی دەسەڵاتداری تورك واتە غەزنەوییەکانو سەلجوقییەکانیش بوون بە موسڵمان بەر لەوەی لە سەدەی یازدەهەدا ناوچەیەکی فراوان لە ئاناتولی هەتاکو هیند داگیر بکەن. غەزنەوییەکان لە خزمەتی سامانییەکانی ئێرانی بوخارا بوون بە موسڵمان، پاشان لەگەڵ مخدومانی ڕابردویان کەوتنە ململانێو لە ئەنجامدا زۆربەی قلمروی جنوبی ئەوانیان داگیرکرد.

نزیکەی ساڵی ٩٨٥ سەلجوق، سەرۆکی تورکی ئۆغز، پێدەچێ لەبەر هۆکاری ڕامیاری بووبێتە موسڵمان. اخلافی ئەو ساڵی ١٠٤٠ سەرزەوییەکانی غەزنەوییان داگیر کرد. لە ساڵی ١٠٥٥ بەدواوە سەلجوقییەکان لە بەغدا دەسەڵاتدار بوونو تارادەیەك بەرەزامەندی لەڕووی ناچاری خلیفەوە، ڕۆڵی پاڵەوانانی ئیسلامی سوننەیان گرتە ئەستۆ. هەربۆیە، موسڵمانبوون بۆ بەخشینی مشروعیت بە ئایدیۆلۆجی ئەوان کارێکی گرنگی ڕەهەندی بوو. لە هەمان کاتدا سەلجوقییەکان هێزێکی گەورە بوون لە بەتورك بوونی جیهانی ئیسلام، بەتایبەت بە داگیرکردنی بەشێکی زۆری ئاناتولی بیزەنتیو پاشایەتی رووم[1] (واتە رۆمی[2] ڕۆژهەڵات)[35].

لە درێژایی لقی شماڵی ڕۆژئاوای ڕێگەی ئاوریشم، کە حوزەی ڤۆلگای دەگرتەوە، تورکەکانی بۆلغاریا لە سەدەی دەیەم بوونە موسڵمان. واپێدەچێ تارادەیەکی زۆر بەهۆی پێوەندییە بازرگانییەکانیانەوە بوو لەگەڵ جیهانی

[1] . Rum
[2] . Rome

ئیسلام. مێژوونووسێکی موسلمانی بۆلغاری سەدەی یازدەیەم بەناوی یعقوب بن نعمان بۆلغاری، دەنووسێ پاشای بۆلغاریا پاش ئەوەی بازرگانێکی نەخۆشی ئەوو هاوسەرەکەی چارەسەکرد گرۆیی ئیسلام بوو[36].

ئیسلام لەناو تورکەکانی ڕۆژهەلأت هەتا سەردەمی ایلغاری مەغولێ هەر هەلۆسراوی توێژی بازرگانەکان بوو. هێشتا بوودیزم لە شارەکانی حوزەی تارم بەهێز بوو، بەهەمان شێوەی ئایینی نەستوریو شەمەنی نەریتی لەناو ڕەوەندەکانی ستێپس.

ئاشتیو سەقامگیری مەغۆلی[1] کە لە ڕێگە داگیرکردنەکانی چەنگیزخانو جێشینەکانی لە سەدەی سێزدەهەیە دامەزرابوو امیتازێك بوو بۆ بازرگانی بری. بەم شێوە گومانی تێدا نییە کە مەغۆلەکان سەرەتا بەبێهیچ مەبەستێك موزعی موسلمانەکانی ڕێگەی ئاوریشمیان بەهێز کرد، بەم واتایەکە باردۆخکێکیان ڕەخساند کە ئالووێرەکانیان توانی پەرەبگرێت کە پێشتر هەرگیز نەیبوو. هەرچەند ژمارەیەکی زۆر لە نخگبانی مەغۆل چەند بەرە دواتریش پابەندی نەریتەکانی خۆجێیی خۆیان بوون، بەلأم درەنگ یان زوو ئەوانەی کە زیاتر حەزیان لە بازرگانی بوو لەوانەیە پشتیوانیان لە موسلمانەکان کردبێتو زۆربەشیان گرۆیی ئیسلام بووبێتن.

## زیاتر ئیسلامی بوون تاریم

داعیان صوفی بە پیشتوانی سەرکردەیەکی نوێموسلمان توانیان لەناو جەماوەرەکانی تورکو مەغولێ سەفەر بکەنو بە ئازادی موعقە بکەن. زۆربەی گروپەکانی ایلی تورك کۆمەلێك ئەفسانەیان دەربارەی سەرچاوەکەیان دروست کردو موسلمان بوونیان بە کەسێکی خاوەن کرامەتێکی تایبەت لە ڕۆژئاوای

[1]. Pax mongolica

موسلمان دەبەستەوە، بە یەکێك لە چینەکان کە دواتر بـە خوجگـان (وەرگـیراو لە ((خواجە)) بەواتای صاحب و مولی) ناسران.

زۆربەی ئیدیعاکەرەکانی سەرتایی صوفی کە لە ماوراءالنهر هاتبوونە ناوچەی تاریم (یان ئالتی شار، شەش شار، هەر وەك لـە سەرچـاوەکانی ئیـسلامیدا بـەم ناوە ناسراوە) زۆربەیان ئەندامانی فرقەیەکی یەسەوی تورك بـوون. بـەلاًم هـەتا کۆتاییەکانی سەدەی چواردە، فرقەی نەقشبەندی کە زۆرتر پابەنـدی شـریعەتو گـیرۆدەی رامیـاری بـوون، بەرەبـەر جێگـای ئـەوانیان گرتـەوە[37]. سـیرەو مێـژووەکانی سـەدەکانی شـانزدەو حەڤـدە، بوونـە ئیـسلامی دواتـری هـەرێمی تاریم، زیاتر بەشێوەی سەربوردەی پیاوانی ئایینی نەقـشبەندیو کـرداره الهـام بخـش و پارسـایانەی ئـەوان دەخەنـە روو کـە زۆرجـاران لەگـەڵ تورکـەکان، مغۆڵـەکانو چـینییە ناموسـلمانەکان جهادیـان دەکـرد تـاکوو پـشتیوانی لـەو نامزدانەی دەسەلأت بکەن کە لایەنگری ئیسلام بوون.

## موسلمانەکانی چینی

ئەمرۆ نزیکەی پێنج ملیۆن موسلمان لە چین دەژین کە بـە نەتـەوە چـینینو بە هۆیی[1] ناسراون. هێشتاش جێگای باسوخواستە کە هۆییەکان کێ بوونو لـە کوێوە هاتن.

بازرگانەکانی ئێرانیو عـەربی موسـلمان لـە هـەمان سـەرەتاکانی جهـانگیری موسلمانەکان، سەفەریان بۆ چین دەکرد. بـەپێی ئەفـسانە نوێیـەکان، سـەعدی وەقاص، مامۆی پێغەمبەر[2]، لە سەردەمی ژیـانی پێغەمبـەردا ئیـسلامی هێنایـە چـین، بـەلاًم ئـەم گێراوەیـە بەڵگـەدار نییـە[38]. کـۆنترین ئامـاژەی نووسـراو لـە

[1] . Hui

[2] . هەڵبەتـە ئـەم چـیرۆکە سـعد وقـاص بـە مـامۆی پێغەمبـەر دەناسـێنێت. ئـەو لـە صـحابە بەناوبانگەکانو داگیرکەری شەڕی قادسییەیە. و.

مێژووی نوێی تانگ، بەرەو ئەو موسلمانانەیە کە لە ڕێگەی ئاوریشمدا بەرەو چین سەفەریان دەکرد، کە بەپێی ئەو، وەفدێکی کە خلیفە عثمان هەناردبووی لە ساڵی ٦٥١ گەیشتە چانگ ئان[39].

لە ساڵی ٧٥٧، فەخفوری تانگ داوای یارمەتی لە گروپەکانی جۆرارجۆری بەکرێ گیراو کرد تاکوو یارمەتی بدەن لە دامرکاندی شۆرشی ئان لۆشن، گووتویانە جگە لە ئۆیغورە بت پەرستەکانی ئەو سەردەمە، موسلمانەکانیش لە ریزی ئەو کەسانەدا بوون کە یارمەتی تانگیان دا بۆ وەرگرتنەوەی دەسەلات. هەندێکیان لەوێ مانەوەو لەگەڵ ژنانی چینی هاوسەرگیریان کرد.لە ٨٠١ دا تەبەتییەکان سوپایەکی تری عەرەبەکان‌و موسلمانەکانی سەغدیان بەکرێ گرت کە لە جنوبی ڕۆژئاوای چین هێرشیان کردە سەر پۆن نەن[١]. هەرچەند تەبەتییەکان‌و موسلمانەکان شکەستیان خوارد بەلام تانگ ڕێگەی بە موسلمانەکان دا لەوێ بمێننەوە و لەگەڵ ژنانی چینی هاوسەرگیری بکەن[40]. ئەو گریمانێکە کە هۆییەکان لەم گروپە بەکرێ گیراوانەوە پەیدا بووبێتن.

موسلمانەکانی چین، وەك کۆمەلانی بێگانە، لە دەرەوەی دیارەکانی خۆیان[٢] بە سەربەستی دەژیان‌و لە هەمبەر بوونە چینی خۆراگرییان دەکرد. سیستێمی پەروەردەو ڕاهێنان‌و پێشەوای کۆمەڵەو ئابووری خۆیانیان هەبوو و بە سایەی ڕێگەی ئاوریشمەوە لەگەڵ کۆمەلانی موسلمانی ڕۆژئاوا هاوپەیوەندییان هەبوو.

بەڵگەیەکی کەم لەبەر دەستە کە نیشان بدات چینییەکان ئایینی ئیسلامیان هەڵبژاردبێت. بەلام هەرکە کۆمەڵەکانی موسلمان لە چیندا بناغەی داکوتا، ڕەهەندێکی گرنگی گەشەکردنیان وەرگرتنی نەخوازاروی منداڵانی چینی بوو کە بە ئایینی ئیسلامی پەروەردە دەکران.

---

1 . Yunnan
2 . enclave

ئەم سوورانەوەی خوێنی چینی، تێکەڵ لەگەڵ ئەم ڕاستییە کە سوپاکانو بازرگانەکانی موسلمان کە لە چین دەمانەوەو ژنی چینییان دەخوازت، یارمەتی دروستبوونی نەتەوەیەکی جیاوازی موسلمانی چینی دەدا. ڕاستییەکی تر ئەوەیە کە ئاسایی بوونی هاوسەرگیرییە تێکەڵاوەکان نیشاندەرێکی سەرنجراکێش (ئەگەرچی نەسەلمێنەر)ی ژنانە بۆ پەرەپێدانی سەرتایی ئیسلامی چینی.

لە سەردەمی سلسلەی یۆئان[1] (مەغولەکان) لە سەدەکانی سیزدەو چواردەدا، موسلمانەکانی ئێرانیو عەرەبیان وەك دیوانییەکان دەهێنایە چین. چونکە موسلمانەکان لە بازرگانیدا ئەزموونیان هەبوو نامزدی گونجاو بوون بۆ پۆستەکانی دارایی، کرکردنەوەی مالیاتو بابەتی لەم شێوە. ئەم پرۆسەیە، کلێشەکانی چینییەکانی لە موسلمانەکانی ئێرانیو عەرەب (کە چینییەکان ئەوانیان لەگەڵ یەهودییەکان لەیەك جیا نەدەکردەوە) واتە وەك بازرگانە ئاژاوەگێڕە بڕوا پێنەکراوەکان، بەهێز دەکرد. دەکرێ استشنایەکی ئەم وێنا نەرێنییە لە سەردەمی مەغۆل دەربارەی (شمس الدین عمر) سید اجل بۆخاری، والی ناوچەی یۆن نەن، ببیندرێت کە لە سەرچاوەکانی چینیدا (وەك ساڵنامە دواپینەکانی مینگ) بە بەڕێوەبەرێکی خاوەن قریحەی باانصاف و هەواداری ڕەوشتی کۆنفۆشیوسی دادەنرێت، کە ئەمەیان جێگای کنجکاوییە[41].

## هەڵگەڕانەوەی بەخت لە موسلمانەکان

لە ماوەی نێوەی یەکەمی سەدەی دوازدە، گروپێکی مەغولی ناموسلمان، بەناوی قەراختایی مەغۆل، لە ئاسیای ناوەڕاستدا موسلمانەکانی قەراخانیانیان لە شوێنی خۆیان ترازند. (ئەورووپییەکان ووشەی کەتای[2] یان لە ووشەی

[1]. Yuan
[2]. Cathay

قەراختایی دروست کردو ماوەیەکی زۆر چینیەکانیان بەم ناوە بانگ دەکرد[1].) دوو سەدە دواتر سەرکردایەتی موسلمانەکان لە رێگەی ئاوریشم دا لەگەڵ گەورترین کۆسپو گرفتێك رووبەروو دەبێتەوە.

هۆزێك یان کۆنفیدراسیونێك بەناوی جورچێن[2]، قەراختاییەکانیان لە سەرزەوی راستەقینەی خۆیان لە بەشە دوورەکانی رۆژهەلات وەدەرناو ئەوانیش بەرەو رۆژئاوا کۆچیان کردو ژمارەیەکی زۆر لە شارەکانی رێگەی ئاوریشمیان داگیرکرد کە بۆ چەند سەدە لە دەستی موسلمانان دابوو. ئاینەکانی جۆراوجۆر لەناو قەراختاییەکان دا نوێنەریان هەبوو. ابن اثیر نووسەری موسلمان دەڵێ کە یەکەمین پێشەوایان، کە ناوی *گورخان* بوو، مانەویی بوو. بەپێی هەندێ نووسراوی دیکە لەوانەیە مەسیحی نەستوری بووبێت[42]. لەوانەیە هاوتەریب لەگەڵ نەریتی ستێپس، لە تەواوی ئاینەکاندا بەهایەکی بالقوەی بینیبێت.

بەهەر حال، لە سەردەمی قەراختاییەکاندا موسلمانەکان پێگە بەرجەستەکەی خۆیانیان لە بەشی ناوەڕاستی رێگەی ئاوریشمدا بەسودی شوێنکەوتەکانی نەریتەکانی تر لەدەستدا. لە هەندێ شوێنەکان، قەراختاییەکان مزگەوتەکانیان کردبووە پەرستگەکانی بووزیی یان کەنیسەکانی مەسیحی. لە رووی بەڵگە مێژووییەکانەوە ناکرێ بزانرێ ئایا ئەمە تەنیا نیشاندەری ویستی خودی قەراختارییەکان بوو یان هەوڵی ئەوان بوو بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی جەماوەرەکانی غیرموسلمان کە لەژێر دەسەلاتی موسلمانەکاندا دەژیان. راستییەکە ئەوەیە کە نازانین رێژەی ئەو جەماوەرەی کە لەهەر شوێنێکی

---

[1]. لەوانەیە بکرێ ئاوهاش بووترێت کە خۆتا/ خۆتای/ خطای کە لە سەردەمی ئیسلامیدا زیاتر بە (لە رووی قەراختایەوە) بە چین ـ هەڵبەتە چینی شمال ـ گووترا بێت، ئەورووپییەکان وەریانگرتبێت و بەشێوەی Cathay ووتبێتیان. و.

[2]. Jurchen

دیاریکراودا چەندە بووە، جا لایەنگری ئەم یان ئەو نەریتە ئایینییە تایبەتە بێت. بەلاّم ئاشکرایە کە مەسیحییەتو مانەوییەتو بوودیزمی ئاسیای ناوەڕاست کەوتبوونە قۆناغێکی بەرگەگری مێژووەکانیانەوە. سەرەتا چالاکییەکانی قەراختاییەکانو و پاشان مەغۆلەکان ئەم ڕەوەندەی هەلّگەراندەوەو بۆ ماوەیەکی کاتی موسلمانەکانی خستە بارێکی بەرگرییەوە.

گرنگترین داگیرکردنەکانی قەراختاییەکان لە کاتی ڕۆیشتنیان بەرەو ڕۆژئاوا لە ڕووی ئایینی تێکەلاّوەوە، شارەکانی سەمەرقەندو بۆخارای ڕێگەی ئاوریشم بوو کە بە زۆرەملی لە سالّی ١١٤١ لە سولّتان سەنجەری موسلمانیان ستاندبوو[43]. ئەم هەلّگەرانەوەی بەختە لە موسلمانەکان لە بواری بالاّدەستی لە ڕێگەی ئاوریشمدا، ڕێگە خۆشکەری دووسەدە توندوتیژیو پیلانگێڕییەکی ڕکابەرانە بوو لە نێوان هەوادارانی مەسیحییەتو بوودیزمو ئیسلام کە لە سەدەی سیزدەیەم لە دەسەلاّتی مەغۆلەکان گەیشتە لووتکە. موسلمانەکان لە سەردەمی مەغۆلەکاندا جارێکی دیکە دەسەلاّتیان گرتە دەست بەلاّم لە تەواوەتی ئەم ماوەدا ڕووداوێکی وەها بابەتێکی سەلّمێنراو نەبوو.

---

[1]. "جۆزجانی نووسەری موسلمانی سەدەی سێزدەیەم، خووی دژە موسلمانێتی دەسەلاّتی قەراختایی بەم شێوە القا دەکات کە (ئەو بە نهێنی ببووە مووسلمان). (نووسەر) ﴿هەلبەتە جوزجانی دەنووسێت "هەندێك ئاوهایان گێراوەتەوە" و لە درێژەی ڕستەکەشیدا دەلێت "والله اعلم بالحقیقة" و.﴾ و دەلّێ کە قەراختاییەکان ﴿(بەلاّم سەرەتا ڕێککەوتبوون) ئەوان سەرکردەی عادل بوونو بە انصافو ڕووخۆشییەوە ڕێزیان لە مووسلمانەکان گرتو پیوانی ئایینییان بەرز نرخاندو بە ڕەوایان نەزانی کە ستەمو دەستدرێژی بەسەر بوونەوەرەکان بکرێت...﴾. (منهاج سراج جوزجانی، طبقات ناصری، تصحیح عبدالحی حبیبی. دنیای کتاب. تهران ١٣٦٢: طبقه ٢٢، ٩٦). و.

## بەشی شەشەم

## زیانی لێك نزیكی ئایینەكانی سەردەمی مەغۆلان

كاردانەوەو درۆو دەلەسەكانی نەبەزی قەراختاییەكانی گەیشتبووە گوێی خاچییەكانی فرانك لە لوان/ رۆژهەلاتی بەخت[1]، ئەوانیش بە داهێنانی ئاواناسیی، ناوی گورخانیان بە پریستێر جۆن[2] (سوریانی: یوهانان[3]) لێكداوەو ئۆستورەی پاشایەكی مەسیحییان دروست كرد كە لە رۆژهەلاتەوە دێت بۆ ئەوەی لە زەوی پیرۆزدا هێزەكان پێیەوە بلكێنو یارمەتی بدەن تاكوو لەوەێ ئیسلام سەركوت بكەن[1]. ئەم ئۆستورە نزیكەی دوو سەدە مایەوە چونكە بە شێوەیەكی گەشبینانە رووخساری پریستێر جۆن لەگەڵ كۆمەڵێ: روخساری تورك یان مەغۆلی ستێپس رێك كەوت كە پێوەندی مەسیحییان هەبوو.

بە لایەنی كەمەوە بە هیوای پێوەندی گرتن لەگەڵ وەها هاوپەیمانێكی لە نادیارەوە بوو كە كۆمەلێك بالیوزی ئەورووپای رۆژئاوایی هەناردرانە دوورترین ناوچەكانی ئاسیای ناوەكی. زۆرجار ئەم بالیوزی دەبوونە لایەنگری ململانییەك كە لە درباری مەغۆلەكان لە نێوان نوێنەرانی ئایینە گەورەكانی ئەو سەردەمە لە ئارادا بوو لەسەر دۆزی سەرتریخوازی.

سەرەتای سەدەی سێزدەیەم چیرۆكەكانی پریستر جۆن دەماودەم دەگەرا. سەرەتا سەركەوتنەكانی مەغۆلانی نایمان[4] لە بەرامبەر سوڵتان موحومەدی خارەزم شا كە زۆربەیان مەسیحی بوونو لەوانەیە لەو سەردەمەدا بەهێزترین

---

[1] . Levant
[2] . Prester John
[3] . Yuhanan
[4] . Naiman

ڕووخساری جیهانی ئیسلام بووبێت. پاشان کە بەرەبەرە ووردەکارییەکانی عزابی[1] نوێی ستێپس، واتە تێموجین[2] (کە دواتر بە چەنگیزخان ناسرا)، بەرەو ڕۆژئاوا درزەی دەکرد، زانیارییەکان سەبارەت بە ئەندامانی خێزانەکەی (بەتایبەتی هاوسەرەکانی) هیوایەکی زۆرتری دەخستە ناو دڵەکانەوە. هەڵبەتە ئەمە تایبەت بە کاتێك بوو کە هێشتا سوپای مەغۆل بە سەرکردایەتی باتۆ[3]، خۆلی ئەورووپای ڕۆژهەلاتیان نەکربووە ناو تەغارەکانەوەو هێشتا دەکرا هێرشەکانی رو لە ڕۆژئاوای مەغۆڵەکان وەها شی بکریتەوە کە ئامانجیان بەتایبەتی ناوەندەکانی دەسەلاتی ئیسلامی بوو.

لەراستیدا دەرکەوتنی نایمانەکان لە ڕۆژئاوای ئاسیای ناوەڕاست، لە ئەنجامی ئەم ڕاستییە بوو کە لە هەوڵەکانی تەموجین رایان دەکرد کە دەیویست عەشیرەتە جۆراوجۆرەکانی مەغۆلو تورك لەژێر فەرمانی خۆی وا لێبکات کە دەستیان لە یەك کاسەدا بێت. سەرکردەی نایمان بەناوی کوچلوك/ کوشلوك[4]، کە بە بووزییان ناسیووە، لە کاتێکدا هاوسەرەکەی مەسیحی بوو، یان لەوانەیە بە پێچەوانەی ئەمەش بێت[2]. بەهەرحال، یاریی موسلمانەکان نەبوو، و کاتێکی هاوپەیمانی سەرکردەی کاشغەر لە ئەنجامی ڕاپەرینێکی خۆجێییدا کووژا، ئەو دخالت کرد کە شۆرشەکە دامرکێنێتو لە ئەنجامدا بەتوندی دەستی دایە سەرکوتکردنی کۆمەڵەکانی خۆجێیی موسلمانەکانو رێگەی پێنەدەدان کە نوێژ بکەنو فەرمانی دا کە دەبێ گرۆیی ئاپینی مەسیحییەت یان بووزیی بن[3].

[1]. چەنگیز دەڵێ "من عزابی خودام. ئەگەر ئێوە تووشی گووناه گەورە نەبوونایە خودای گەورە عزابی بەسەر ئێوە نەدەهێنا." جامع التواریخ بە پێداچوونەوەو پەراوێزنووسی محمد روشنو مصطفی موسوی. نشر البرز. ١٣٧٣: ٤٩٩. و.

[2]. Temujin

[3]. Batu

[4] Kuchluk

دەبێ جەماوەری موسڵمانی کاشغەر لەو سەردەمەدا گرنگ بووبێت چون هەرکە تەموجین سوپاکەی لەدژی کوشلوك هەناردو بەڵێنی دا کە ئازادی ئایینی بە کاشغەر ببەخشێت، ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان بوونە هاوپەیمانی تەموجین. دوابەدوای وەدەرنانی کوشکوك، جەبە[1] سەرداری تەموجین ((هاتە کاشغەرو فەرمووی کە لە کۆڵانو بازاردا بانگەواز بکەن کە پێویستە هەموو تاکەکان لەسەر ئایینی بابو باپیرانی خۆیان بمێننەوەو لە یەکدی متعرج نەبن.)) [52] جۆوینی، مێژوونووسی ئێرانی، دواتر دەنووسێت کاشغەرییەکان پێیان ووتووە کە سوپای چەنگیزخان وەك ((ڕەحمەت خودایی)) هاتبوو[53].

بەڵام هەندێجار خودی ئەم موسڵمانانە دوژمنی خراپتری خۆیان بوون. وەك خواند ئەمیر، نووسەری ئەم دواییانەی ئێرانی، دەنووسێت: کاتێك کە جەبەو سوبۆدای[4] دوو سەرداری مەغۆل، گەیشتنە شاری ڕێی لە باکووری ئێران (لە باشووری تاران)، پیاوانی ئایینی خۆجێیی قوتابخانەی شیعە ((بۆ بەخێرهاتنی چوونە دەرەوەو جەبەو سوبۆدایان هان دا کە نیوەی خەڵکی شار کە حەنەفی بوون بکوژێت)). مەغۆلەکان ئەم کارەیان کرد، بەڵام پاشان بەخۆیان ووت ((خەڵکێکی کە ڕازی دەبن خوێنی هاوولاتییەکانیان بڕێژن چە سودێکیان هەیە؟ ئەوە بوو کە شیعەکانیشیان ڕاسپاری بەردەمی تیغ کرد. هەروەها کاتێك کە لە

---

[1] . Jaba

[2] . خواند امیر، حبیب *السیر*. ج۲. کتابفروشی خیام. تهران: ۱۳٦۲. ص۲۷. و.

[3] . " ئەربابەکانی کاشغەر چیرۆکیان کیراوە کە، کاتێك کە ئەوان (مەغۆلەکان) گەیشتنێ، هێشتا شێرەکانیان هەڵنەکێشابوو کە (کوچلوك)ڕایکردو پشتی هەڵگەراندەوە، هەر فەوجێکی مەغۆلەکانیش کە دوابەدوای یەکدی دەهاتنو جگە لەو داوای هیچی تریان لە ئێمە نەدەکردو ڕێگەیان دا کە تکبیرو بانگ بووترێتو نوێژ بکرێتو لە شاردا جاریان دا کە هەر کەس لەسەر ڕێو شوێنی خۆی بێتو لەسەر ئایینی خۆی بمێنێتەوە. بوونی ئەو جماودرە ودك ڕەحمەتێکی خوداییو بەخششێکی خودایی وابوو." (تاریخ جهانگشای جوینی، تصحیح محمد قزوینی، دنیای کتاب. تهران: ۱۳۸۲، ص۰۵). و.

[4] . Subodei

لایەنی باشووروەوە گەیشتنە شاری قوم، مەغۆلەکان بە هاندانی هەندێ لە سوننەکان، جەماوەری خۆجێیی ئەوێیان کوشت کە زۆربەیان شیعە بوون[6].

## ئایین لەناو مەغۆلەکان

ئایینی مەغۆلەکان‌و هۆزەکانی دانیشتوی ستێپسی سەربە ئەوان، بەگشتی لە مبحپی ئایینی شەمەنی/ شەمەنیزمدا ڕەنگ دەداتەوە کە ئەویش خستنەرووی بیروباوەڕێکی انئاشکرایەسەبارەت بە ئاسمان خودایەکی مەزن، بەناوی تەنگری[1]. بەلآم دڵبەستراوییان بە دۆزە واتاییکان زۆرتر لەسەر ویستەکانیان بۆ دۆزەکانی ژیان چڕ دەبووەوە وەك بەدەستهێنانی خواردن، سەرکەوتن لە شەڕداو تەندروستی تاکەکەسی. بەم شێوە، بۆ جێبەجێ کردنی هەر جۆرە کار یان ئایینێك ئامادەبوون بە مەرجێك یارمەتییان بدات کە لە هاتنەدی خێرای ئامانجەکانیان.

ئەمە جۆرە خۆراگرییەکی ئایینی بەدوادا هات کە تێیدا هەر ئاینێك خوازیار بوو بە شێوەیەکی بالقوە کاریگەریەتی دیار بێت، بەلایەنی کەمەوە هەتا کاتێك کە پێچەوانەکەی نیشان بدرێ. خانە یەك لەدوای یەکەکانی مەغۆل بەردەوام داویان لە نوێنەرەکانی هەر ئایینێك ـ مەسیحیەت، ئیسلام، بوودیزم، دائۆییزم ـ دەکرد کە دۆعایان بۆ بکەن، و نخبگانی مەغۆل چەندجار لە ڕێگەی دروستکردنی پەرستگەو بەخشینی خەلآت بە کیان دینی، لایەنگرییان لە هەمووی ئەم ئایینانە دەکرد. تەنیا کاتێك ڕێگەیان بە کرداری ئایینی بێگانە نەدەدا کە دەستدرێژی کردبایە سەر سنوری کردارەکانی ئەوان، وەك شێوازی سەربرینی ئاژەڵەکان لەلای موسلمانەکان بۆ بەدەستهێنانی گۆشت یان غسل

[1] . Tangri

کردن لەناو ئاوی ڕوان[1]. چەنگیزخان بەفەرمی احکام لەدژی ئەم کردارانە (لەیاسا) ڕاگەیاند بوو و هەندێجار جێگرەکانی بەهێزیان دەکرد.

مەغۆلەکان وەك داگیرکەرانی پێشووی ستێپس، مەبەستیان بەدەستهێنانی ئەو سوودانە بوو کە لە ئەنجامی چاودێریکردنی ڕێگە بازرگانییەکانی سەروئاسیایی بەدەست دەهاتن. ئەوانە لە نێوان هەموو ئەو گروپانەی کە بۆ ئەم مۆدێلە مێژووییە گونجاون، لە هەمووان سەرکەوتووتر بوون بۆ ژێردەستە کردنی بەشێکی گەورەی ئۆراسیا. واتاکەی ئەوەیە هەرکە هێزی مەغۆل بنەی خۆی داکوتا، سەفەرکردن لە ئاسیا هەرچەندە هێشتاش هەر دژوار بوو، بەڵام ئەوەندە ئاسان کرابوو کە پێشتر هەرگیز وەها نەبوون. ئەمە بووە هۆی قەلەمبازێك لە بازرگانی دژواری دوور و ئاڵوگۆڕ کردنی فەرهەنگیی کە لەگەڵێ دا دەهات. پۆلۆکان[2] بەناوبانگترین میراتی ئەم سەردەمانەیان بەجێ هێشتووە، بەڵام ڕەبیانێکی کاتولیکی ڕوومی وەك ویلیام خەڵکی ڕوبروك[3]، جۆن/ یوحنای خەڵکی پلانۆ کارپینی[4] و کەسانی تریش کە پێش یان پاش ئەوان سەفەریان

---

[1]. "ڕۆژێك ئۆگتای (قائان) لەگەڵ چەغەتای لە نەچیر دەگەڕانەوە. موسلمانێکیان دیت کە لەناو ئاودا دانیشتووەو خەریکە غسل دەکات. چەغەتای کە کتروباری یاسایی زۆر بەتوندی وەردەگرت، ویستی موسلمانەکە بکوژێت. قائان وتی ئەو بێتاوانەو ئێمە ملول... لە سەرەتادا یاسایان دەرکردبوو کە هیچ کەس مەڕو ئاژەڵە گۆشتخۆرەکانی تر سەر نەبڕێت و بەپێی ڕێو شوێنی ئەوان سینگ و شانیان هەڵقلیشێنێت. موسلمانێك مەڕێکی لە بازار کری و بردییەوە ماڵەوەو دەرگاکانی داخست و لە ناودوە بسمیلی کرد. قبچاقێك لە بازار ئەوی بینی. بە دزییەوە بە شوێنی کەوتبوو و لە سەربانی ماڵەوە هەرکە موسلمانەکە چەقۆی لەسەر قوورگی مەڕەکە دانابوو، لە سەرەوە خۆی هەڵدا ناو حەوشەکەو موسلمانەکە گرت و بردیە درباری قائان. (قائان) بۆ بەدواداچوونی ئەم بابەتە ئەوانی هەناردە دەرەوە. کاتێك کە چۆنیەتی ڕووداوەکەیان خستەڕوو، فەرمووی ئەم دەروێشە ڕەچاوی یاسای کردووە بەڵام ئەم توورکە یاسای نەپارازتووە، چونکە چۆتە سەربانی ماڵی ئەو/ موسلمانەکە ڕزگاری بوو و قبچاقەکە سزا درا." (جامع التواریخ ١٣٧٣، ٨٦٥-٦٦). و.

[2]. Polo

[3]. William of Rubruck

[4]. John of Plano Carpini

دەکرد، زۆرجار بانگهێشتیان لەگەڵ دیپلۆماسی تێکەڵاو دەکرد. چەند ڕەببانێکی بەناوبانگی وەك ڕەببان سئۆما/ ابن صوماو مارکوس ((کە دواتر بوو بە بەتریرکی نەستوری بەناوی مار یابەلاها[1])) کە لەلایەکی تری شاری نەستوری تورکی کوشەنگ[2] (هەمان تێندۆکی[3] مارکۆپۆلۆ) لە باکووری چینەوە دەهاتن، بەرەو ڕۆژئاوا سەفەریان کردو ابن صوما درێژەی بە گەشتەکەی دا بەرەو ئیتالیاو فەرەنسا. بەر لەوان ڕەببانێکی دائۆیی بەناوی چانگ چۆن[4] لە ڕێگەی ڕۆژئاوادا سەفەری کردبوو. چەنگیزخان کاتێك لەشکرەکانی هێنایە جێگایەك کە ئێستا پێی دەووترێ ئافغانستان، داوای چانگ چۆنی کردبوو[9].

چەنگیزخان دەربارەی ئەو دۆزانەی کە زیاتر دونیای بوون یارمەتی لە زانیاریی ئەو بازرگانانەوە وەردەگرت کە لە خزمەتی دابوون. ئەمانە زۆربەیان موسلمان بوون چونکە تاکوو ئەو کاتە بازرگانی ڕێگەی ئاوریشم زیاتر لە دەستی موسلمانەکاندا بوو[10]. هەر کە داگیرکردنەکانی مەغۆلەکان لە سەرزەوییەکانی ژێر دەسەڵاتیان تێدەپەری، پێویستیان بە ڕاوێژکارو وەزیر زیاتر دەبوو کە لە کاروباری حکومیدا شارەزا بن. بەم مەبەستە کەسانێکیان دادەمەزراند کە یان خەڵکی خۆجێیی ناوچە داگیرکراوەکان بوون یان خود فەرهەنگی ئەوانیان دەناسی. زۆرجار بەتایبەت لە ئاسیای ناوەڕاستو ڕۆژئاوا، ئەم کارە بە واتای پشت بەستن بە موسلمانەکان بوو، هەڵبەتە مەسیحییەکانو بووزییەکانو ئەوانەی تریش لە پێگەکانی دزەکردن بەدەر نەبوون. بازرگانە موسلمانەکان کە بەهۆی فراست داراییان بەهایان هەبوو بە ڕاوێژکاری دارایی و

---

1 . Mar Yaballaha
2 . Koshang
3 . Tenduc
4 . Ch'ang Ch'un

گەنجینە دادەنرێن[11]. (هەرچەندە ئەم کارە بووە هۆی ئەوە کە جەماوەری رعایا بە نموونەی تەماح و گەندەڵی دابنێن).

لە کۆتاییدا مەغۆل لە شەڕە خوێناوییەکانیان دا، لە خوێنی وەستا پیشەییەکان و خاوەن قریحەکان، بەبێ لەبەر چاو گرتنی نژادو ئایین، خۆش بوون و بە مەبەستی کارکردن دەیانناردنە مەغۆلستان یان هەر شوێنێکی تر کە خزمەت کردنیان پێویست بوو.

لایەنێکی تری روانگەی مەغۆلەکان بۆ ئایین، راکشاوییان بوو بۆ بە یەکگرتوو دانانی هەر ئایینێك کە سەر بەم یان ئەو کۆمەڵە بێت[12]. مەغۆلەکان لەوە تێگەیشتن کە دەبێ لەبەر چاوی رعایاکانیان مشروعیت بەدەست بێنن، بۆیە چەنگیزخان لەگەڵ پێشەوا ئایینییەکانی ناوچە داگیرکراوەکان دۆستانە رەفتاری دەکرد، بەم روانگەوە کە هەڵسوکەوتی باش لەگەڵ پیاوانی ئایینی دەگوردرێ بەرەو پێوەندییەکی باش لەگەڵ خەڵکێك کە ئەم پیاوە ئایینییانە ئامۆژگارییان دەکردن. بەتایبەتی فەرمانێکی دەرکرد ك پیاوانی ئایینی مەسیحی، موسلمان و بووزیی و زانایانی لە ماڵیات معاف دەکرد[142]. بەگشتی، تێروانینی مەغۆلەکان لەسەر بنەمای تێبینی پراکتیکیی بوو کە ئەمەش

---

[1]. "کاتێك چینتیمور بە فەرمانی قائان جێگیر بوو، شرف الدین خوارزمی کردە وەزیر لە قبل باتۆ. و بهاءالدین محمد جوینی، باوکی شمس الدین خاوەنی دیوانی کردە خاوەن دیوان. ئەمیرەکانی دیکەیان لە قبل شهرزادەیەکی بیتکچی دەنارده دیوان و کاروباری دیوان رێك و پێك بوو." (جامع التواریخ ١٣٧٣: ٦٦٢). و.

[2]. " بەڵام ئەم معافییەتە بە یەهودییەکان نەدرا. " (نووسەر) "... جگە لەو جەماوەرەی کە بە فەرمانی یەرلیغ چەنگیزخان و قائان لە ئەرك و ماندوو بوونەکان معافن، مووسلمانەکانی هۆزەکانی مەشایەخ و گەورەکان و سەیدە گەورەکان و پێشوایانی اخیار، و نصاری ئێرکائۆنان و قسیسەکان و رەبیانەکان و احبارو لە بت پەرستەکانی نوینانی ناودارو هەمووی اصنافی جەماوەرێك کە تەمەنیان لە سەرەوە بێت و نەتوانن کار بکەن..."(جامع التواریخ ١٣٧٣: ٨٨٤). و.

یارمەتیدەرە بۆ ڕوونبوونەوەی ئەگەری گرۆیی مەغۆلەکانی ڕۆژئاوای بەرەو ئیسلام‌و مەغۆلەکانی ڕۆژهەلأت بەرەو بوودیزم.

## مەسیحییەتی ستێپس

لە پێداچوونەوە بە رابردوو دا، ناتوانرێ مەسیحییەکانی ئەرووپی لەبەر ئەوە زۆر سەرزەشت بکرێن کە گۆیا هەڵسەنگاندنیان سەبارەت بە دڵبەستراوی مەغۆلەکان بۆ مەسیحییەت لە راستی دوور بووە. بەگشتی راستە کە لەوانەیە تەنیا رێژەیەکی کەمی جەماوەری ستێپس ددانیان بە مەسیحییەت دانابێت، تەنانەت لەوانەیە هۆشیارییان سەبارەت بەم نەریتە لە ئاستێکی نزمدا بووبێت. هێشتا وا پێدەچێ کە لەناو ئاینەکانی جیهاندا، مەسیحییەت لە کۆمەڵگای ستێپسدا باشترین نوێنەرایەتی هەبوو بێت.

ماوەیەکی کەم پاش بوونە مەسیحی عەشیرەتەکانی کرایت[1]و ئۆنگۆت[2] لە سەدەی یازدە، ناوە مەسیحییەکان لەناو مەرکیتەکانی[3] مەغۆلستانی ناوەڕاست‌و تەنانەت دوورتر لەویش لەناو تاتارەکاندا دەبینرێت[15]. لە ئەنجامی وەها گرۆییەکەوە، کە بە قوولایی یان واتایی ئەوان لە روانگەی ژیانی ئاینی ستێپسەوە تێدەپەرین، هەتا سەردەمی چەنگیزخان ئامادەبوونێکی مەسیحی لە ئاسیای ناوەڕاستدا دەبینین کە رەنگدانەوەی خۆشەویستی کوشلوکی نایمان‌و چەند ئەندامێکی خانەدانی پاشایەتی چەنگیزییە. سورقەقتەنی بیگی[4]، دایکی دوو ئیلخانی داهاتوو، واتە مۆنگکە[5] (قائان) و قوبیلای[6]و هەروەها

[1]. Kerait
[2]. Ongot
[3]. Merkit
[4]. Sorghaghtani Begi
[5]. Mongke
[6]. Khubilai

هۆلاکۆ[1]، دامەزرێنەری سلسلەی ئیلخانەکانی ئێران، مەسیحیی نەستوری بوو، هەرچەند پشتیوانی لە ئایینەکانی تریش دەکرد[162]. پروپاگەندەکانی هەبوونی مەسیحی لە درباری مەغۆلدا لەگەڵ چەند نامەیەکی جعلی ((کۆمەڵنامەیەك لە پرسیتر جۆن)) کە لە جیهانی مەدیتەرانەی ئەو سەردەمەدا دەستاودەست دەگەرا، پەرەی بە هیواکانی ئەورووپییەکان دەدا بۆ پەیداکردنی هاوپەیمانێکی بەهێز بۆ شەڕکردن دژی دراوسێ موسلمانەکانیان[17].

## پشتیوانی کردن لە موسلمانان

نووسەرە موسلمانەکان، وەکوو مەسیحییەکان، زۆرجار هەوڵیان دەدا یەکەمین داگیرکەرەکانی مەغۆل وەك پشتیوانی ئایینەکەیانو لە ئەنجامدا وەك نوێموسلمانی بالقوە وێنا بکەن. بەلاّم راپۆرتەکانی گرنگی موسلمانەکانی ئەم سەردەمە لە دژی سوودەکانی مەسیحی، بەپشتیوانی مەغۆلەکان نووسرا بوو، هەربۆیە گرۆییەکی ئاشکرا بۆ نوێکردنەوەی وەرگرتنی بیروڕا نیشان دەدەن. مێژوونووسی ئێرانی، خواجە رشیدالدین فضل‌الله، کە خاوەن پلەیەکی سلسلەی ئیلخانەکانی ئێرانییە دەنووسێت، ئۆگتای[2]، جێگری چەنگیز، وەك لایەنگری کۆمەڵەی موسلمانە کۆچەرییەکانی چین دەناسێنێت لە بەرامبەر دەمارگرژی خەڵکی خۆجێییو دەڵێ:

((کەم دەرۆشێك لە موسلمانەکانی تاجیك هەیە کە

---

1 . Hulegu

2 . "سور (قەقتەنی بیکی) ژیرێکی جیهانی بوو... و هەرچەندە شوینکەوتەو بەهێزکەری جەماوەری عیسەوی بوو بۆ ئاشکرا کردنی درووشمی شەرعی مستەفایی هەوڵێکی زۆری دەداو صەدەقەو پێشکەشی زۆری پێشکەش بە پێشەواکانو مەشایەخی ئیسلام دەکرد... " (جامع التواریخ، ١٣٧٣: ٨٢٢ـ٢٣). و.

3 . Ogodei

چــــەندین کۆیلـــــەی خۆتـــــایی
بەســــەریان راوەســــتابێ. و هــیچ
گـــــەورە پیـــــاوێکی خۆتـــــایی
موسلمانێکیان دیل نەبووەو ئەمە
دەتـــوانی بـــــەواتای حکمتــــی
خودایـــەك بـــێ کـــە ئاگـــاداری
پلەوپایـــەی هـــەر هۆزێکـــە لـــە
هۆزەکانی ئەو سەردەمەو یاسای
گـەورەی چـەنگیزخانیش لەگـەڵ
ئەم واتای ریککـەوتووە، چـونکە
فەرمویـــــەتی دیـــــەی خـــــوێنی
موسلمانێك چل بـالنجی ئالتونـەو
هی خۆتاییەك گۆی درێـژێك. بـە
ئاوها بەڵگەیـەکی روونو ئاشـکرا
چۆن دەتوانری شـوێنکەوتەکانی
ئیسلام بە کەم دابنرێن؟[1](18)))

ئاشکرایەکە لە پشتەوەی ئەم بندە لەحنێکی بەرگـەگری هەیـە، بـەم واتایـە کە پێدەچێ چینییەکان (شوێنکەوتەکانی ئیسلامیان بە کەمو بچووك) داناوە.

هەروەها رشـیدالدین دەربـارەی ئۆگتـای دەڵـێ ((موسـلمانێك چـوار بـالنجی زیوی لـە ئـەمیری ئۆیغـور قـەرز وەرگرتبـوو و نەیـدەتوانی بیداتـەوە. گرتنـانو مواخزەیان دەکردو ناچاریان دەکرد کـە یـان واز لـە ئـایینی پـاکی موحەمـەدی (ص) بێنێتو زنار ببەستێتو ببێتە بـت پەرسـت (لەوانەیـە ببێتـە بـوزیی) یـان ئەوەی کـە بـە رووتـی لـەناو بـازاردا بیگـەرێننو سـەد داری لێ بـدەن. سـێ رۆژ

[1]. جامع التواريخ، ١٣٧٣: ٦٨٦-٨٧.

مۆڵەتی خوازتو هاتە درباری قائانو بەسەرهاتی خۆی بۆ گێراوە. فەرمووی تاکوو غریمانی ئەویان هێناو بە هەمان ئەو داوایەك كە لە موسلمانەكەیان كردبوو، تاوانباری كردن... و سەد بالنجی بە موسلمانەكە بەخشی[١].))[19]
جۆزجانی (نووسەری طبقات ناصری) كە لە كۆتایی سەدەی سیزدە لە هیند دەنووسێت، نمونەیەكی تری پیلانگێری بووزییەكان لە دژی موسلمانەكان باس دەكات: بە دەستی چغتای قائان (كە بە دژایەتی كردن لەگەڵ موسلمانەكان بەناوبانگ بوو)، یەكێك لە روحانیان بووزیی دەیووت خەونی بە چەنگیزخانەوە بینیوەو لێی بیستووە كە دەسەلاتی مەغۆلەكان هەڵدەتەكێننو بۆ بەرگری كردن لەوان دەبێ هەموویان بكوژێن. جۆزجانی دەڵێ ئۆگتای ((ووتی وادیارە تۆ لە ژمارەی درۆزنەكانی... و ئەو كاتە ئاماژەی كرد تاكوو ئەو درۆزنە سزا بدەنو بابەتی "من حفر بئراً لاخیه وقع فیه" هێنایەدی.[٢])) (هەمان، ٥١)[20]

---

[1] . جوجانیش دەڵێ (( ئوكتای سروشتێكی زۆر بەخشندەو خۆش روو بوو و زۆر موسلمانەكانی خۆش دەویستو هەوڵێكی زۆری دەدا بۆ بەرێز دانانی مووسڵمانەكانو مووسلمانەكان لە وولاتەكەی ئەودا رێزو ژیانێكی دابینكراویان هەبوو.)) (طبقات ناصری. همان، طبقة ٢٣، ١٥١). بەلام سەرچاوەكانی مووسلمانەكان دەربارەی چۆغتای كوری چەنگیزخان وەك دووژمنی مووسلمانەكان هاودەنگن. لە طبقاتی ناصریدا هاتووە ((ثقات ئاوها دەگێرێتەوە كە چۆغتای دووژمنی مووسلمانەكان بوو و لە ناخیدا ئەوەی تێدا بوو كە خوێنی مووسلمانەكان برێژێت و هیچ كامیان بە زیندوویی نەهێلێتەوە....)) (هەمان، ١٥٢)
((ئەم (ئۆگتای) قائانە كە بە سیفاتو سیماتی پەسەندكراو و باش كردارو رەوشت بەرزو لە پاشاكان دیكە عادلترو خێركەرترو فەرمانی برەوی زیاتر بوو.)) (حبیب السیر ٤٨)

[2] . سەبارەت بە ئۆگتای، هاوشێوەی ئەم بابەتی، لە جامع التواریخ دا هاتووە ((یەكێك لە نەیارانی ئایینی پاكی ئیسلام كە بە زمانی تازی قسەی دەكرد، هاتە خزمەتی قائانو هاتە سەر ئەژنۆ و ووتی خەونی بە چەنگیزخانەوە بینیوەو ووتوویەتی: بە كورەكەم بڵێ كە ژمارەیەكی زۆر لە موسلمانەكان بكوژێك چونكە زۆر خڵكێكی خراپن. قائان ماوەیەك بیری كردەوەو فەرمووی كە لە رێگەی وەرگێرەوەی قسەی لەگەڵ كردی یان بۆخۆی راستەوخۆ؟ ووتی بە زمانی خۆی، قائان پرسیاری كرد تۆ زمانی مەغۆلی دەزانیت؟ ووتی نا. فەرمووی تۆ بە دڵنیاییەوە درۆ دەكەیت چونكە

رشیدالدین دەڵێ ((لەناو مەغۆل ئەمە گاڵتە پێکردنە کە تاژیکەکان وەها دەناسن کە کۆندامی نێرینەیان گەورەیە)) ﴿هەمان، لا٧٠٠﴾[211] و پاشان دەڵێ مونگکە قائان ((لەناو هەموو هۆزو کۆمەڵە ئایینییەکان ڕێزی بۆ موسلمانەکان دادناو زیاترین ڕێژەی هەدیەو خێرو خێراتی پێیان دەبەخشی[22]٠))

بەم شێوە، هەرچەند ڕاپۆرتەکانی مەسیحیو موسلمانەکان تارادەیەك وایان نیشان داوە کە لەگەڵ مەغۆلەکان هاوسۆزن بەڵام بەڵگە هێنانەوەکانیان جیاوازە. ڕاپۆرتەکانی مەسیحی کە خۆش خەیاڵیو بانگەشە بوو، ئامانجیان مەسیحی دوورەدەستەکان بوو، ڕاپۆرتەکانی موسلمانەکان، وەك جووەینیو رشیدالدین فضل‌الله، تەنیا بەم مەبەستە نووسرابوون کە خزمەتگووزارەکانی مەغۆل شاد بکاتو پێیاندا هەڵبڵێن. لەلایەکی ترەوە، جۆزجانی موسلمان کۆچەری خەڵکی ئاسیای ناوەڕاست، لە هیند دەنووسی، و نووسەرانی دوامەغۆل، وەك خاندئەمیر (نووسەری حبیب السیر) مێژوونووسی سەرتاکانی سەدەی شانزدەیەم، محافظەکارترن.

---

من دڵنیام باوکم جگە لە زمانی مەغۆلی هیچ زمانێکی تری نەدەزانی، پاشان فەرمانی دا کە بیکوژن.)) (لا٦٨٧) و.

[1]. نووسەر لێرەدا دەنووسێت ((رشیدالدین دەڵێ کە مەغۆلەکان بە مووسڵمانەکان دەڵکێنن کە ((ووزەی سێکسی بەهێزیان هەیە)).)) ئەگەر مەبەستی ئەو هەمان رستەیەك بێت کە لە سەرەوە ئاماژەم پێکرد، دیارە کە ئەم واتایە نادات. و.

[2]. لە جامع التواریخ (١٣٧٣: ٦١-٨٦٢) هاتووە ((کاتێکی بە پیرۆزییەوە مۆنگکە قائان لەسەر تەختی دەسەلات دانیشت، هۆزەکانی بازرگان{بازرگانەکانی سەردەمی گیوك خان}... هاتنە خزمەتی ئەو و باسی خۆیان بە گوێی ئەو گەورە ڕاگەیاند... پاشا زۆر ڕێزی لێنانو فەرمووی کە لە خزێنەی وولاتەکانی ئەو قەرەبوویان بکەنەوە، زیاتر لە پێنسەدهەزار بالنجی زیویان هێنا کە ئەگەر احتباسی کردبا، هیچ کەس نەیدەتوانی دەنگی لێوە بێتو ئەمەش نیشاندەری خوو و ڕەوشتی پاشایانەی ئەوە...)) و.

## کۆنسولەکانی سەرەتایی ئەورووپی بۆ درباری مەغۆل

لە ١٢٣٨ تێکدەرییەکانی نوێی مەغۆلەکان لە ئۆکرانیاو رووسیا دەستی پێدەکردو بەرەبەرە رووی لە ئەورووپا دەکرد. ئیلغارەکانی مەغۆلان لە لەهێستان لە ١٢٤٠ و هەنگاریا لە ١٢٤١ ئەورووپییەکانی ووریا کردەوە کە مەبەستی ئۆردوەکانی رۆژهەلات تەنیا داگیرکردنی ئەو وولاتانە نەبوو کە لە دەستی موسلمانەکاندا بوو. بەلام لەناکاو هێرشی مەغۆلەکان بۆ ئەورووپا وەلانراو هۆیەکەشی مەرگی ئۆگتای قائان بوو، چونکە پێویست بوو هەموو سەردارەکانی خانەدانی چەنگیزی بانگ بکرێنەوە مەغۆلستان تاکوو جێگرێك بۆ ئەو هەلبژێرن.

پاپ ئینوسێنتی[١] چوارەم کە لە هەلوەشانەوەی بریاری لە سێدارەدان رازی بوو، بێگوومان بە دروستی لە ناوەرۆکی بابەتەکە نەگەیشتبوو، لە ١٢٤٥ وەفدێکی بە سەرکردایەتی یوحەنای پلانۆ کارپینی، رەببان فرەنسیسکەنی[٢]، ناردە درباری مەغۆل. مەبەست لەم ماموریتە کە بانگهێشی مەغۆلەکانی دەکرد بێنو تعمید وەرگرنو ملکەچی مرجعیتی پاپ بن، ئەوە بوو کە ئامرزێك بێت بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی پلانەکانی داهاتوی هێرش کردنی مەغۆلەکان بۆ سەر ئەورووپا. بەم شێوە، یوحەناو بالیوزەکانی دواتر، نوێنەری بارێك بوون کە ئۆڤن لاتیمۆر[٣]، چین ناسو دۆزەرەوە، بە گالتەوە ناوی دەنێت ((سی ئای ئێی یان *رێکخراوی جاسوسی مەسیحی*[٤] ئەو کاتە.[23]))

[1] . Innocent
[2] . Franciscan
[3] . Owen Lattimor
[4] . C.I.A: Christian Intelligence Agency

راپۆرتی یوحنا سەبارەت بە مانەوەی لە دربـاری مـەغۆل، کـە لـەو مـاوەدا شانازی ئەوەی پەیدا کردبوو کە لە ساڵی ١٢٤٦ دا تـاج لەسـەر دانـانی گۆیـۆک[1] ببینێت لە پێگەی ئیلخان، بەڵگەیەکە بۆ پێلانگێرییەکانی فرقەیی کـە لـەوێ لـە ئارادا بوو. وادیارە گۆیـۆک لەگـەڵ مەسـیحییەت نێـوانی خـۆش بووبێـت. رشـید الدین دەڵێ هەر لە منداڵییەوە هاورێیەکی مەسیحی هەبوو بەناوی قەداق:

> ((چـونکە لـە قۆنـاغی منداڵییـەوە قـەداق کـە عیسەوی بوو لە رێگەی ئەتابەکییەوە هاورێی گۆیۆک خـان بـوو، سروشـتی ئـەو بەهـەمان شـێوەی ئـەوی لێهـاتبوو: و پـاش ئـەویش چینقای بـووە هاوکـاری ئەو، هەربۆیە هەمیشە رێگەی بـە پـەروەردە کردنـی قسیـسەکانو نـصاری دەدا، کاتێـک پەروپاگەنـدەی ئەم ناوبانگە بلاو بووەوە، لە وولاتی شام (سوریا) و رووم (بیـزانس) و ئـاس (ئۆسـیتیا[2]) و ئـۆروس[3] (رووسیا) قسیسەکان بۆلای بەرێزی هـاتنو بـەهۆی هاورێیەتی قەداقو چینقای لە انکار ئایینی ئیسلام بـە دوور نـەبوو، و کاروبـاری نـصارییەکان لـە سەردەمی دەسەلاتی ئەودا رووی لە بـەرزیو باشـی کردو هیچ موسلمانێك نەیدەتوانی بـە دەنگـی بـەرز قسەیان لەگەڵ بکات[4].[24]))

---

[1] . Guyuk
[2] . Ossetia
[3] . Oros
[4] . جامع التواريخ، هەمان، ٨٠٨.

هەر کە گۆیۆك دەسەڵاتی گرتە دەست، موسلمانێکی وەك خزانەدارەکەی (صاحب دیوان) عبدالرحمنو حاجبەاش کە ژنێکی ئێرانی بوو بەناوی فاطمە[1] لەناو برد کە لە سەردەمی نیابت سەلتەنەتی تورئاگنەی[2] دایکی، خاوەنی دەسەڵاتێکی زۆر بوون[253]. وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد چینقای کە نەستوریو وەزیری گەورەی ئۆگتای[4] بوو و تورئاگنە پۆستەکەی لێ ستاندبووەوە، گەڕاندراوە سەر پۆستەکەی[255].

چنقای چاودێری وەرگێرانی لاتینی وەڵامەکەی گۆیۆك بۆ پاپ ئینوسێنت بوو، لەوانەشە بەرپرسی بندێك بووبێت کە تێیدا خانی مەغۆل ئۆسقۆفی گەورە سەرزەنشت دەکات لەبەر ((تفرعن))ی لەم بابەتەدا کە ئەو تەنیا ئایینی کاتولیك بە شێوە ڕاستەقینەکەی مەسیحییەت دادەنێت[27]. هەرچەندە چاککردنەوەی کابینەی گۆیۆك لەوانەیە لە ڕوانگەی خۆیەوە زیاتر ڕامیاری بووبێت تاکوو پاڵنەری دینی، بەڵام پێدەچێ لەڕوانگەی نوێنەرانی فرقەکانی ئایینی ڕەقیبەوە جۆرێکی دیکە بووبێت.

جۆزجانی ئاماژە دەکات کە پیاوانی ئایینی بووزی ((توینەکان)) هەمیشە گۆیۆکیان بۆ ئازاردانی موسلمانەکان هان دەدا. دەڵێن کە وەزیرێکی بووزی

---

[1]. "حاجبەیەکی بوو بەناوی فاطمە کە لە کاتی داگیرکردنی خۆراسان لە مەشهەدی تووس بە دیلیان گرتبوو، زۆر زیرەك بوو و جێگای متمانەو نهێنی پارێزی خاتوون بوو و گەورە پیاوانی دەورووبەری ئەویان کردبوو بە ئامرازێك بۆ مەبەستەکانیان." (هەمان، ۷۹۹ـ۸۰۰) و.

[2]. "نزیکەی سێ ساڵ تەختی خانی لەژێر فرمانی تورئاگنە خاتوون بوو و قسەو فرمانی ئەو لە وڵاتدا کاری پێدەکرا."(جامع التواریخ، ۸۰۲) و.

[3]. "یەکەمجار کاری فاطمە خاتوونیان بینی،... و پاشان عبدالرحمانیان سزا دا کە تورئاگنە خاتوون لە سەردەمی خۆیدا کردوویە حاکمی خۆتای." (هەمان، ۸۰۲، ۸۰۸، ۸۰۹) و.

[4]. "کاتێك ویستیان چینقای بگرن کە وەزیری گەورەی قائان بوو، ئاگادار بووەوەو رایکرد." (هەمان، ۸۰۰) و.

[5]. "چینقای دووبارە دامەزرا بووەوە." (هەمان، ۸۰۲) و.

ناسراو بە ئیلخان ووتوویەتی ((ئەگەر دەتەویّ تەختی پاشایەتیو لەشکەری مەغۆل بۆ تۆ بمێنێتەوە لەم دوو کارە یەکێکیان ئەنجام بدە، یان هەموو موسلمانەکان بکووژە یان بەرەیان دوابراو بکە.)) پاشان گۆیۆك ((بریاری دا کە باشترە فەرمانەکەی جێبەجیّ بکریّو هەموو موسلمانەکان بخەسێنن‌و مجبوبیان بکەن، وەها کە دوابراو بن‌و بەرەیان نەمێنێت....)) ئەم بەلایە تەنیا بە موعجێزەیەك بەخێر کۆتایی پێهات، ((کاتێك ئەو نەفرەت لێکراوە (هەمان تووین) لە بارگای کیۆك (گویۆك) هاتەدەر، سەگێك کە تایبەت بوو بە بەر دەرگاو دەورووبەری تەخت‌و سوارەکان... قەپالّی بە هیلّکۆکەکانی ئەو قوربەسەر داگرت‌و بە ددانی هەلّکەندو بە هێزی ئاسمانی‌و پشتگیری خودا، دستبەجیّ کوشتی.... و وازیان لە دەستدرێژی کردنە سەر موسلمانەکان هێنا.)) (هەمان، پۆلّینی ٢٣، ١٧٣)[28]. بەلاّم لە شوێنێکی تردا جۆزجانی لایەنگری گۆیۆك لە مەسیحییەکان پشت ڕاست دەکات.[291]

یەکێك لە سەرەتاییو توانجاویترین نمونەکانی ئەو مەغۆلانە کە هەولّ دەدەن هیوای مەسیحییەکان بۆ ئامانجەکانی ڕامیاری ڕابکێشن، لە نامەیەکدا دەبینریّ کە لە ١٢٤٨ بۆ شا لویی لە قێبریس ناردرا بوو دەربارەی ناردنی *خاچییەکانی حەوتم*، خاوەن پلەیەکی مەغۆل بەناوی ئیلجیگتای[٢] لە تەبریز ئەم نامەی ناردبوو. لە نامەکەی ئیلجیگتای ((لەبەر سەرکەوتنی هێزەکانی مەسیحی دژی دوژمنەکانی خاچ لەبەر دەرگای خودا دۆعا دەکات.)) ئاوا دەلّێت کە

---

[1]. " (ثقات) ئاوا دەگێڕێتەوە کۆمەلّەی توینەکان بەردەوام کۆیۆکیان هان دەدا موسلمانکان ئازار بداتو بروادارن بخاتە رەنجەوە. لەو وولاّتە پێشەوایەکی ئایینی ئیسلام هەبوو،...جەماوەری تساکان‌و قەسیسەکان‌و عەشیرەتی بت پەرستی توینان لەبەر کێبك پارانەوە کە پیشەوای موسلمانەکان بانگ بکات تاکوو مشت‌ومڕیان لەگەلّ بکات‌و بیسەلّمێنێت کە ئایینی محەمەدو پێغەمبەری ئەو لە هەمووان بالاّدەستترە ئەگەر نەیتوانی ئەوا دەبیّ بیکوژن." (طبقات ناصری، طبقه ٢٣، ص ١٧٣)

[2]. Eljigidei

گۆیوك بۆ پاراستنی مەسیحییەکان ناردوویەتی کە دووبارە کەنیسەکانیان دروست بکەنەوەو پشت ڕاستی دەکاتەوە کە ((لاتینەکان، یونانییەکان، ئەرمەنییەکان، نەستورییەکان، یەعقوبییەکان[1]و هەموو خاچ پەرستەکان لە ڕوانگەی خوداو خانی مەغۆلدا یەکسانن.[30]))

لە ڕاستیدا ئیلجیتگای کە تازە کرابوو بە سەرکردەی سوپای ڕۆژئاوای مەغۆلەکان، پلانی هێرشکردنە سەر بەغدای دادەڕشتو هیوادار بوو کە لویی هانبدات کە هێرشێکی هەڵخەلەتێنەر بەرەو میسر ئەنجام بدات. جگە لەمە، دوو نەستوریی ئێرانی کە نامەکەیان هێنابوو بە پاشای فەرەنسایان ووت کە گویۆك نەوەی پرسیتێر جۆنەو هەر دووکیان، ئەو و ئیلجیگتای، مەسیحییەتیان پەسند کردبوو و حەزیان دەکرد یارمەتی خاچییەکان بدەن تاکوو ئورشەلیم وەرگرنەوە. وەلامی لویی، کە ڕەببانێکی دۆمینیکەن[2] بەناوی ئەندرۆ لونجۆمۆ[3] دەیهێنێتەوە، سەرئەنجام لە ١٢٥٠، ماوەیەکی کەم پاش مەرگی گۆیۆك، گەیشتە دربارەی مەغۆلو بێوەکەی ئەو ئۆغۆل قایمیش/ قەیمیش خاتوون وەلامی هەناردەوە کە تەنیا داوای باجی ساڵانەی دەکردو تێیدا هیچ ئامارەیەك بە بەڵێنەکانی ئیلجگتای نەکرابوو.[324]

ڕاپۆرتێکی کە ئەندرۆ هێنایەوە ئاماژەی بە ناوی کۆیلەکانی ئەلمانی دەکرد کە لە ئاسیای ناوەڕاست ڕەنجیان دەکێشا. ئەم هەواڵە لە مێشکی ڕەببانێکی

[1]. Jacobite
[2]. Dominican
[3]. Andrew Longjumeau
[4]. لە ساڵی ١٢٥٢، پاش ئەوەی کە مۆنگکە دەسەلاتی کەوتە دەست، لە سێدارەیان دا. ((ئیلچی هەنارد کە دەستبەسەری بکەنو بیهێنن لە بارێکدا کە هەدوو دەستیان لە خامەیەکدا پێچابوو. هەر کە گەیشتێ لەگەڵ دایکی شیرامون، قەداقاچ خاتوون، ناردیانە اردوی سورقەقتنی بیکی. مێنگاسار یارغوچی ڕووتی کردەوەو بە یارغویان بەستەوەو پرسیاریان لێ دەکرد. ئەو ووتی ئەندامێك کە جگە لە پاشا کەسێکی تر نەیبینیوە چۆن کەسێکی تر ببینێت؟ و لە تاوانەکەیان پێچاوەو لە لبادێکیانەوە پێچاوو خستیانە ناو ئاوەوە.)) (جامع التواريخ، هەمان، ٨٣٩) و.

فرەنسیسکەنی بەناوی ویلیام خەڵکی روبروك[1] بروسکەیەکی لێدا. لەو سەردەمەدا یەکێك لە ئەندامەکانی درباری شا لویی بوو. ئەم قسە دەماودەم دەگەرا کە سەرتاق نەبیرەی چەنگیزخان و سەرکردەی اردوی زێرینی جوچی کە لە رووسیا دەسەلأتدارە، مەسیحیە. ویلیام بیری کردەوە کە لە رێگەی درباری سەرتاقەوە بچێتە ئاسیای ناوەکی و ئامۆژکاری مەغۆلەکان بکات بەرەو مەسیحییەت و ئەگەر بکرێ لە خزمەتی ئەو مەسیحییانە دابێ کە لەوێ دەژیان.33

گەشتەکەی ویلیام سەرکەوتنێکی تێکەلاو بوو. هەرگیز کویلەکانی ئەلمانی پەیدا نەکردو مۆنگکە قائان، جێگری گویۆك، رێگەی پێ نەدا کە بە نەبراوەیی لە مەغۆلستان بمێنێتەوە تاکوو هەوڵ بدات بۆ بانگهێشتی مەبەستەکەی خۆی. جگە لەمە وەرگێرەکەی ولیام پیاوێکی هەمیشە سەرخۆش بوو و هاوکاری لەگەڵ نەدەکردو لەوانەشە ئەو دەرفەتانەی کە رەببان بۆ بلاو کردنەوەی بیروراکەی دەربارەی ئیجیل بەدەستی هێنابوو، بە فیرۆی دابوو بێت. لەلایەکی ترەوە، راپۆرتی ویلیام دەربارەی گەشتەکەی، کە لە ١٢٥٣ـ١٢٥٥ درێژەی خایاند، یەکێك لە چڕوپڕترین و زانیاری بەخشترین گەشتنامەکانی سەردەمی ئەوە.

ویلیام یەکەمین ئەورووپیی سەدەی ناوەڕاستە کە بەرەورووی بوودیزم بۆتەو باسی لێوە دەکات. یەکەم کاریگەرییەکەی کە لەسەری داینا ئەوە بوو کە بووزییەکان کۆمەڵێك مەسیحی لادەر بوون:

> لە شاری قایالیق (ق زاقستانی ئێستا) سی بتخانەیان هەیە، سەردانی دوو دانەیانم کرد تاکوو کردارە هەڵەکانیان ببینم. لە یەکەمیان دا پیاوێکم

---

[1] . William of Rubruk

> دیت كە خاجێكی بچووكی ڕەش لە دەستێكی دا بوو، ئەمەش وای لە من كرد كە باوەڕ بكەم ئەو مەسیحییە چونكە وەك مەسیحییەك وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی دامەوە كە ئاراستەیم كردبوو. پاشان پرسیارم لێ كرد ((بۆچی لێرە خاچ و پەیكەری عیسا مەسیحتان نییە؟)) لە وەڵامدا ووتی ((لای ئێمە باو نییە.)) لێرەوە گەیشتمە ئەم دەرئەنجامە كە ئەوان مەسیحین‌و ئەم وازهێنانە لە داب‌و نەریتە بە هۆی پەیڕەویكی هەڵەوەیە.[34]))

ویلیام هەوڵی دا كە دەربارەی ئەم فرقە موسلمانە خۆجێییە سەیرانە زانیاری زیاتر بەدەست بێنێت، بەڵام سەركەوتوو نابێت چونكە ئەمانە نەیاندەویست دەربارەی ئەو فرقە شتێك بڵێن. لە ئەنجامدا هەر كاتێك دەربارەی بوودیزم پرسیاری لە موسلمانێك دەكرد ((ئەوان بێزار دەبوون.[35]))

ویلیام روبروك دەڵێ مزگی ئەو نەستوری‌و موسلمانانەی كە لە چین دەژیان بنكەی بێگانەكان بوو. وێنای ئەو لە هاوئایینە مەسیحییەكانی لە ڕۆژهەڵاتدا ئەرێنی نەبوو:

> نەستورییەكانی ئەوێ نەزانن. ئەوان بەزمانی سۆریانی نوێژ دەكەن‌و پەرتوكە پیرۆزەكانیان دەخوێنن لە كاتێكدا ئەم زمانە نازانن، هەربویە وەك ئەو ڕەببانانە كە لەناو ئێمەدان‌و صرف‌و نحو نازانن دوعا دەخوێنن، واتە بە تەواوی گەندەڵن. جگە لە هەمووی ئەمانە سودخۆرن‌و مەی دەخۆنەوە، وانگهی، هەندێكیان كە لەناو ((تەتەرەكان)) دا

دەژین وەك ئەوان چەند ژنیان هەیە. کاتێك دێنە ناو کەنیسە وەك ساراسینەکان[1] (واتە موسلمانەکان) داوێنیان دەشۆن ((دەست نوێژ دەشۆن یان غسل دەکەن))، ڕۆژی هەینی گۆشت دەخۆنو وەك ساراسینەکان لەو ڕۆژەدا میوانی دەدەن... دەرئەنجام ئەوەیە کە هەر کات یەکێك لەوان دەبێتە ئەتابەکی کورانی گەورەکانی مەغۆل، هەرچەند بۆ خۆیان ئینجیلەکانو ئایینیان فێر دەکەن، دیسانەوە بەهۆی کرداری ناشایستو چاوچنۆکییان تارادەیەك لە ئایینی مەسیحی بێگانەیان دەکات[36].

هەروەها ویلیام دەڵێ کە نەستورییەکان ڕێگە بە ئەندامانی فرقەکانی مەسیحی تر وەك زۆربەی کۆیلەکانی مەجاری، ئالانی، ڕووسی، گۆرجیو ئەرمەنی نادەن کە بچنە ناو کنیسەکانیان ئەگەر بێتوو بەناوی نەستوری تعمید نەداربێتن.[37] جگە لەمە ئەوان گرنگی بە تالع دەدەنو تەنانەت دەچنە خزمەتی غەیبیبێژە موسلمانەکان.[38] ئەم نەستورییانە خۆیان لە نماد خاچ دوور دەگرتو کاتێك کە پیشەکارێکی کۆیلەی فەرەنسی بەناوی گیلیۆم بۆشلێر[2]، وەك هەدیە خاچێکی دروست کرد بۆ بۆلغای[3]، سەرۆکی شەحنەکان، کە قەشەکانی نەستوری دزییانو پاشان بوو بە ئاوو چووە ناو زەوی.[39]

ویلیام لە ماوەی مانەوەی لە دربارى مۆنگکە میوانی ڕەببانێکی ئەرمەنی بوو بەناوی سەرگیس[4] (سێرگئیس[5]) کە هەمیشە لە دربار نیاری موسلمانەکان

1. Saracen
2. Guillaume Boucher
3. Bulghai
4. Sargis
5. Sergius

بوو. ڕۆژێك لە بۆنەیەکی هاوسەرگیریدا لە دربار، ئاریغ بوکا[1] برای بچووکی مۆنگکە، ئاماژەی بە دوو موسلمان کردو پرسیاری لو سێرگیس کرد ئایا ئەوانە دەناسێت. لە وەڵامدا ووتی ((دەزانم کە ئەمانە سەگن.)) موسلمانەکاندا لە وەڵامی ئەودا ووتیان ((کاتێك کە ئێمە بێ‌ڕێزی بە ئێوە ناکەین ئێوە بۆ بێ‌ڕێزیمان پێدەکەن؟)) ئاریغ بوکا چیرەی مشتومڕەکەی پچراند بەڵام ڕۆژی دواتر سێرگیس لە شەقام لەگەڵ چەند موسلمانێك ئاژاوەی نایەوە. بەپێی فرمانێك ئەم ناخێرە خێوەتەکەی لە ناوەندی اردو دوور خستەوەو ویلیامیش وەك کیوانی ئەو ناچار بوو لەگەڵ ئەو بڕوات.[40]

ویلیام پێشتریش لە ڕێگەدا ڕووبەڕووی پیلانەکانی ئەرمەنییەکان لەدژی موسلمانەکان ببووەو ئەویش کاتێك بوو کە زانی وەرگێرە ئەرمەنییەکان دەستیان لە نامەی ناساندنی ئەو وەرداوە کە شا لویی نووسیبووی‌و ئەویان گۆری بوو بە بانگهێشتێك بۆ شەرێکی هاوبەش لەدژی موسلمانەکان[41]. هەروەها زانی کە سێرگیس ((بە مەنگو قائانی ووتبوو کە ئەگەر ئامادەبێت ببێتە مەسیحی ئەوا هەمووی جیهان ملکەچی ئەو دەبێت‌و فرانکەکان‌و پاپی گەورەکان گوێرایەتی فەرمانی ئەو دەبن...[42]))

فاکتەرێك کە نیشان دەدات مۆنگکە ڕێز بۆ مەسیحییەت دادەنێ، دانانی بۆلغای، مەسیحی نەستورییە لە پۆستی ((سەروەری نوسەران[432])). بەڵام هەرکە مۆنگکە دەسەڵاتی گرتەدەست، وەزیری مەسیحی پێشووی ئەو واتە

---

[1]. Arigh Boke

[2]. "فرمانی دا کە بۆلغای ئاقا ببێتە سەروەری نووسەران کە بە ئەندازەی درێژایی مافی خزمەتی تایبەت دێرین بوو تاکوو نمونەو فرمانەکانی ئەو بنووسێتەوە، لە بیتکچییە موسلمانەکان ئەم ئەرکە بە ئەمیر عمادالملك سپێردرابوو کە لە خزمەتی (ئوگتای) قائان‌و گویۆك خاندا بوو و فرمانی بە ئەمیر فخرالملك دا کە یەکێك لە نزیکانی بەڕێزی بوو کە پایزە بە بازرگانەکان نەدات بۆ ئەوەی کە جیاوازییەك هەبێت لە نێوانیاندا لەگەڵ کەسانێك کە کاروباری دیوانیان لە ئەستۆ بوو." (جامع التواریخ، ٨٤٧)

چینقای کە بە پیلانگێری تاوانبار کرابوو، سپاردە دەست زانایەکی پەردەی دربار بۆ ئەوەی لە سێدارەی بدات[1]، هەروەها مۆنگکە لە پیلانێکی بووزی لە شاری بێش بالیغ ئاگادار بووەوە کە ئامانجیی کووشتنی بە کۆمەڵی موسلمانەکانی نوێژی هەینی بوو و لە جیاتیان فەرمانی دا کە راژووی خۆجێیی ئۆیغور لەبەرچاوی خەڵك لە سێدارە بدەن.[442]

ئاشکرایە کە رامیاری مۆنگکە بەهەمان شێوازی هەمیشەیی مەغۆلەکان ئەوە بوو کە دەبێ لایەنگریو پشتیوانی لە هەر ئایینێك بکری لە رووی ئەو هێزو دەسەڵاتەی کە فراهمی دەکەن.[453] ویلیام دەنووسێ کە لە جەژنەکاندا پیاوانی ئایینی هەر دینێك بە نۆرە دێنە لای قائانو تاکوو دۆعای بۆ بکەنو جامەکەی پیرۆز بکەن. لە روانگەی تارادەیەك رەشبینانەی ویلیامەوە، قائان ((بڕوای بە هیچ کامیان نییە... لەگەڵ هەمووی ئەمانە ئەوان (پیاوانی ئایینی) لە دربارى

---

[1]. "کاتی چینقاییش هاتو کارەکەیان بەدەستی زانایەکی پەردە ئەسپارد لە مانگی رەمەزانی ساڵی خمسین و ستمائە." (فەمان، ٨٣٩)

[2]. "لە بێش بالغ، بیدی قۆت کە سەروەری بت پەرستەکان بوو لەگەڵ گروپێك بڕیاریان دا لە رۆژی هەینی کە هەموو موسلمانەکان لە مزگەوت کۆ دەبنەوە، بەدەرکەونو هەموویان لە مزگەوت بکوژن. غولامێك لەناو ئەواندا کە ئاگاداری ئەم بارودۆخە بوو، بووە موسلمانو پیلانەکەیانی ئاشکرا کردو تاوانەکەی بەسەریاندا سەڵماند. پاشان کە بیدی قۆتیان هێنایە اردو بە یارغویان بەستەوە ددانی بە تاوانەکەیدا نا، فرمان درا کە بیبەنە بێش بالغو لە رۆژی هەینی پاش نوێژ لەبەر چاوی تەواوی ئامادەبووان سزای بدەن." (هەمان، ٨٣٩ـ٤٠)

[3]. جوزجانی لە طبقاتی ناصریدا ئاماژە دەکات کە روونکەر نییە کە بەرەکەخان لە سەردەمی جێنشینی مۆنگکەدا توانیبێتی کە ئەو بکاتە موسلمان. (نووسەر)

"کاتێك کە مەنکو خانیان لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنا بەرەکا موسلمان بوو، ووتی حکومەتی یارانی کفر هەڵچووەو هەر پاشایەکی کافر کە لەسەر تەخت دادەنیشێت ئەوا حکومەتەکەی درێژە ناخایانێت. ئەگەر دەتانهەوێ حکومەتی مەنکو درێژەی هەبێت ووشەی شهادەت بڵێن تاکوو ناوی ئەو لە دەفتەری ئیسلامدا تۆمار بکرێت، (ئەو کاتە لەسەر تەخت دابنیشێتو وەهاش هاودەنگ بوون) مەنکو ووشەی شەهادەتی ووتو پاشان بەرەکا باسکی ئەوی گرتو لەسەر تەختی دانیشاند..." (طبقات ناصری، گبقەی ٢٣، هەمان، ١٧٩)

ئەودا ((مێشن لە دەوری شیرینی)) و ئەویش هەموویان خەڵات دەکاتو هـەموو لەو باوەڕەدان کە لەگەڵیدا پێوەندی دۆستانەیان هەیە...))[46]

لـە هـیچ جێگەیەکدا بـە ئەنـدازەی ڕسـتەی پێـشوو ناکـامی سـەرکردەکانی مەسیحیو موسلمانو بووزیی لە تێگەیشتنی ڕوانگەی مەغۆلەکان سـەبارەت بـە ئاین بەم ڕوونییە درك پێ ناکرێت، پێدەچێت کە تـەنیا ویلیـام ئـەم باردۆخـەی بەوردیو دروستی هەڵسەنگاندووە. ئـەو دواتـر هـەوڵی دا بـۆ مەغۆلـەکانی ڕوون بکاتەوە کە مەبەست لە هاتنی بۆلای مۆنگکە هیچ هۆیەکی دیپلۆماتیکی نەبووە بەڵکو تەنیا دەیویست ((ووتەی خودا دەربڕێت، هەڵبەتە ئەگەر حەز بکات گـوێ بگرێو ببیسێت)) کاردانەوی مەغۆلەکان ئەوە بوو کە ((پێیـان چـەقاندبوو کـە ووتەی خودا چی بوو کە من دەمویست بیڵێم، وایان دەزانی دەمەوێ پێـشگۆیی سـەرکەوتنو داگیرکردنـی بـۆ بکـەم، هـەمان کارێـك کـە کەسـانی دیکـە دەیانکرد.))[47]

مۆنگکـە، وەك گۆیـۆك، حـەزی دەکـرد کـە پیـاوانی ئـاینی ڕەقیـب لەگـەڵ یەکدی بکەونە مشتومڕی فەرمی.[48] ئەو لە مشتومڕێکدا کە لە دربار لە نێـوان ویلیام و ئەوانەی تر دروست ببوو، ووتی ((ئێوە مەسـیحییەکان، ساراسـینەکان (موسـلمانەکان)، تـۆین[1] (پیـاوانی ئـاینی بـووزیی) لێـرەنو هەریـەك لـە ئێـوە دەڵێت کە ئاینی ئەو مەزنترەو نووسراە یـان پەرتووکـەکانی ئـەو ڕاسـتییەکی زیـاتری لـەخۆ گرتـووە.))[49] تـەنیا ڕاپـۆرتێکی کـە لـەم مـشتومڕە هەمانـە ڕاپۆرتەکـەی ویلیامـە کـە بـەم شـێوە وێنـای خـۆی دەکـات کـە بووزییـەکانو موسلمانەکانو نەستورییەکانی شەرمەزار کردووە بەڵام قەبول دەکات کە لەگەڵ هـەمووی ئەمانـە هـیچ کـەس نـەیووت کـە ((ئیمـانم هێنـاو دەمـەوێ ببمـە مەسیحی.))[50]

---

[1] . Tuin

لە دواترین دانیشتنی ویلیام لەگەڵ قائان، مۆنگکە بۆی ڕوون دەکاتەوە کە ((ئێمەی مەغۆل باوەڕمان هەیە کە تەنیا یەك خودا هەیە کە ژیانو مردنی ئێمە بەدەستی ئەوەو دڵەکانمان ڕوو لەو دەکەین... بەڵام بەهەمان شێوە کە خودا پێنج پەنجەی بە مرۆڤ بەخشیوە ئاواهاش چەند ڕێگەیەکی بە مرۆڤداوە. خودا پەرتووکی پیرۆزی بە ئێوە داوەو ئێوەی مەسیحیی جێبەجێیان ناکەن.)) پاشان مۆنگکە رەخنە لە مەسیحییەکان دەگرێ لەبەر خستنەوەی ئاژاوەو جوداییو تەماحیان، هەر چەندە لە رووی زیرەکییەوە وتی کە مەبەستی ویلیام نییە.[51]

مۆنگکە لەساڵی ١٢٥٨ کۆبوونەوەیەکی مشتومڕی پێك هێنا هاوشێوەی هەمان دانیشتنەکەی کە ویلیام تێیدا بەشداربوو. بەڵام ئەم جارەیان بۆ بووزییەکانو داۆییەکان تەرخان کرابوو کە رکابەرییان لە چین دەگەراوە سەردەمی تانگ. قائان برا بچووکەکەی خوی واتە قوبیلای کردە سەرۆكو مۆنگکە کە بەشداری لە مشتومڕەکان دەکرد بوودیزمی پێ باشتر بوو وتی ئەمە وەك بەری دەست وایەو ئاینەکان دیکە وەك پەنجەن وان.[52]

لەم ناوەدا دیسان لە رۆژئاوا، پاوانخوازی مەغۆلەکان دەبووە هۆی دووبارە دروستبوونەوەی یەکێتیەکی مەسیحی مەغۆل لەدژی موسلمانەکان. بوونی مەسیحییەکان لە نزیکی هۆلاگو ئیلخانی ئێران، هەروەها دۆقوز خاتوونی هاوسەریو سەردارەکەی کیتبۆقا، پەرەی بەم هیوا نوێیە دەدا. لە ١٢٥٤، هیتۆم[1] پاشای ئەرمەنستان، رازی بوو لە بەرامبەر پاراستنی کۆمەڵەکانی مەسیحی ئاناتولی کۆمەڵێك چریك بۆ سوپای مەغۆل ئامادە بکاتو جارێکی تر بەڵێنی دا ئۆرشەلیم بگەرێنێتەوە بۆ مەسیحییەکان. دوابەودوای داگیرکردنی بەغدا بەدەستی هۆلاگو لە ١٢٥٨ کە تێیدا موسلمانەکان بە کۆمەڵ کووژران بەڵام لە خوێنی مەسیحییەکان خۆشبوون، هۆلاگو کۆشکی پاشایەتی بە

[1]. Hethum

جاسلیقی نەستوری، مار مەکیخا[1]، سپاردو فەرمانی دا کە کەنیسەیەکی جامعی نوێی بۆ دروست بکەن.[532]

لە داگیرکردنی حەلەبو دەمیشق بەدەستی کیتبۆقا لە سەرەتای ١٢٦٠ دیاربوو کە ئورشەلیم بەم زووانە دەکەوێتە دەست غۆلەکان. بەلاّم ئەم ئاواتە نەگەیشتە ئاکام چونکە لە کۆتاییەکانی هەمان ساڵدا مەغۆلەکان بەشێوەیەکی چاوەروان نەکراو لە عین جالوت لە هێزکانی ممالیکی میسر شکەستیان خوارد. سەرکەوتنی ممالێك کۆتایی بە جیهانگیری مەغۆلەکان لە باشوور رۆژئاوا هێناو بەلایەنی کەمەوە لەوانەیە بووبێتە هۆی ئەوەکە هەندێك لە مەغۆلەکان گومانیان دەربارەی هێزی مەسیحیەت پەیدا کردبێتو بیر لەوە بکەنەوە کە لەوانەیە ئیسلام ئایینێکی بەهێزتر بێت. سەقامگیری دەسەلاّتی ممالێك لەگەلّ پەیمانی یەکێتی بە *اردوی زێرین* بە سەرکردایەتی بەرەکە کوری جوچی پشتڕاست بوو چونکە ئەو ببووە موسلمان یان لەوانەیە وەك موسلمانێك پەروەردە کرابوو و دوژمنی هۆلاکو بوو.[54]

جۆزجانی چیرۆکێکی سەرنجراکێش دەگێرێتەوە کە وێنای بەرگری بەرەکە لە ئیسلام نیشان دەدات. مەسیحییەکی گەنجی خەلّکی سەمەرقەند ببوو بە ئیسلام، خاوەن دەسەلاّتێکی بێناونیشانی مەغۆل کە چوو بوو سەردانی ئەوی کردبوو، نەیتوانی هانی گەنجەکەبدات کە بگەرێتەوە سەر ئایینی مەسیحییەت،

[1] . Mar Makikha

[2] . جوزجانی دەلّێ ئەو شیعانەی کە لە خزمەتی خەلیفەدا بوون خیانەتیان لە بەغدا کرد. (نووسەر)

"و امیرالمؤمنین المستعصم بالله وەزیرێکی هەبوو بێدینو رافضی، ... نەیاری لەگەلّ امیرالمؤمنین کردو بە نهێنی کۆمەلّێك نووسراوی بۆ هۆلاکو هەناردو لەگەلّیاندا رێککەوتو بانگهێشتی کافرەکانی کردو لەشکرە کۆکراوەکانی عێراقی هەنارده دەورووبەرو لای امیرالمؤمنین وەهای نیشان دا کە لەگەلّ کافرەکان ئاشت بوونەتەوەو پێویستیان بە لەشکر نییە. پاش ئەوەی کە بەغدا لەشکری تێدا نەما لەناکاو لەشکری کافری مەغۆل گەیشتنە نزیکی بەغدا...." (طبقات ناصری، هەمان ١٩١)

((ئەو نەفرەت لێکراوە ترسایی بوو))، هەربۆیە لە سێدارەی دا. کاتێك بەرەکە ئەمەی بیست، خوێنی مەسیحییەکانی سەمەرقەندی مباح کرد کە لە کەنیسەدا کۆببوونەوە.[551] هەروها جۆزجانی باسی ئەوە دەکات کە سەرتاق بەهۆی دوعای بەرەکەوە مرد کە ئاواتی مەرگی ئەوی دەخوازت[562].

[1]. "یەکێك لە تەرساکانی سەمەرقەند ئایینی ئیسلامی پەسند کردو موسلمانەکانی سەمەرقەند کە پێگەیەکیان لە ئایینی ئیسلامدا هەیە ڕێزێکی زۆریان لێناو خەلاتێکی زۆریان دایە. لەناکاو یەکێك لە ملهۆرەکانی مەغۆڵو کافری چین کە سەروەتو سامانی هەبوو و ئەو نەفرەت لێکراوە کە تەرسایی بوو، گەیشتە سەمەرقەند. ترساکانی سەمەرقەند چوونە لای ئەو مەغۆلەو گازەندەیان کرد کە موسلمانەکان منداڵەکانمان لە ئایینی ترسایی‌و شوێنکرتنی عیسا، سلاوی خودای لێ بێت، بەرەو ئایینی ئیسلام ڕادەکێشن... مەغۆلەکە فرمانی دا تاکوو ئەو گەنجە بێنن کە بۆتە موسلمان، لەگەڵی بە نەرمی ڕەفتاریان کردو بەڵێنی سەروەتو سامانیان پێدا ئەگەر لە ئایینی ئیسلام هەڵگەڕێتەوە... کاتێك ئەو گەنجە لەسەر ئایینی حەق پێداگری کردو گرنگی بە بەڵێنەکانی ئەو جەماوەرە نەدا، ئەو نەفرەت لێکراوە فرمانی دا تاکوو سزای گەنجەکە بدەن، و بە سامانی ئیمانەوە ئەم جیهانەی بەجێهێشت،ڕەزای خوودای لەگەڵ بێت." (طبقات ناصری، هەمان ۲۱۵ـ۱٦) ﴿بەرەکا خان پاش بیستنی بارودۆخەکە یان بەهۆی پێداگری جەماوەری موسلمانی سەمەرقەند، تووڕەیی بەسەر سروشتیدا زاڵبوو... فرمانی دا ئەو جەماوەری تەرسایە کە لەو تاوانەدا بەشداریان بووە، بکوژن‌و بیاننێرنە دۆزەخ.... ئەو هۆزە ڕۆژەرەشە لە کەنیسە کۆبوونەوەو بە یەکجار هەموویان لە شوێنێکدا گرتن‌و ڕادەستی دۆزەخیان کردن‌و ئاجور بە ئاجوری کەنیسەکەیان ڕووخاند، ئەم تۆڵەسەندنەوە بەهۆی پێداگری ئەو پاشایەوە بوو لەسەر ئایینی محەمەدی‌و جەماوەری أحمدی.﴾ (طبقات ناصری، هەمان ۲۱٦ـ۱۷) و.

[2]. سید شمس الدین گێڕایەوە: کاتێك کە باتوو کۆچی دوایی کرد کوڕێکی لەپاش بەجێما بەناوی سەرتاق بەو پەڕی ستەمکاری‌و دەستدرێژی‌و دەمارگرژی لەگەڵ موسلمانەکان. سەتاق نایهەوێ بچێتە خزمەتی بەرەکا خان بەم هۆیە کە (تۆ موسلمانی‌و من ئایینی تەرسایم هەیەو بینینی ڕووخساری موسلمان شمە...) کاتێك ئەم قسە ناڕاستە گەیشتەوە گوێی پاشا موسلمان بەرەکا خان (دڵی نازداری ڕەنجاو زۆر خەمبار بوو. فرمانی دا تاکوو خەرگەیەکی بۆ دامەزرێنن لە ناوەندی لەشکردا وەها کە پێشتر هاوشێوەی نەکرابێت... زنجیری لە ملی خۆی کردو سەرەکەی تری زنجیرەکەی لەسەری خەرگەکە توونەد کردو لەسەر پێی وەستاو بە هەنیسك‌و پارانەوەوە دەگریاو دەلالاوە: خوودایە ! ئەگەر ئایینی محەمەدی‌و سەریعەتی ئیسلام لەسەر حەقە تۆڵەی من لە سەرتاق بستێنەوە. سێ شەوو ڕۆژ لەم بارەدا پاش ئەنجامدانی ئەرکەکانی دەینالاندو دەپاراوەو

بەلاّم موسلمان بوونی بەرەکە لەو کاتەدا نەبووە هۆی موسلمان بوونی *اردوی زێرین*. بانگهێشتکەرانی مەسیحی - لە بەنەرەتدا لاتینی بەلاّم ئۆرتۆدۆکسی رووسیاییش بوون - تا سەدەی چاردەیەمیش درێژیان بە رکابەرییەکانیان دا بەمەبەستی دزەکردنە ناوییەوە. پێدەچێ رکابەرە گرنگەکانیان شێخەکانی صوفیە بووبێت. سەردەمێك لە نزیکی ١٣٢٠ بانگهێشتکەرێکی دۆمێنیکێن بەناوی ویلیام ئادام نامەیەکی نووسی کە تێیدا داوای زیادکردنی چالاکی بانگهێشت دەکرد لە ناوچەی ڤۆلگا بەو ئەوەی وەلاّمدەری چالێنجی تەشەنەکردنی فراوانی موسلمانەکانی ئەوێ بێت. ویلیام موسلمان بوونی ئۆزبەك خان سەرکردەی *اردوی زێرینی* جوچی - کە موسلمانەکانی ئاسیای ناوەڕاست ئەمە بە هۆکاری ئیسلامی بوونی *اردوی زێرین* دەزانن - بە چالاکی هەژارەکانی صوفی دەبەستێتەوە کە سولتان مەملوك ناردبوونی. هەروەها دەڵێ بەهۆی هەمان ئەو صوفیانە بوو کە سەرکردی *اردوی زێرین* ((بەم دواییانە، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە تاتارەکان بوو بە شرەانگێزترین ساراسین، دوژمنو ئازاردەری مەسیحییەکان.))[57]

حکومەتی مەغۆل لە سەردەمی قوبیلای قائان گەیشتە بەرزترین ئاستی ئالۆزی. قوبیلای پاش کۆچی دوایی مۆنگکە لە ساڵی ١٢٥٩ بوو بە ئیلخان. تێروانینی سەرەتایی قوبیلای بۆ نەریتە ئایینیەکان ئامادەباشی هەمیشەیی مەغۆلەکان بوو بۆ هەر شتێکی کە دەکرا بەکاربهێنرێت. مارکۆپۆلۆ دەگێرێتەوە کە دەیووت ((چوار پێغمبەرن کە دەیانپەرستن‌و هەموو جیهان رێزیان لێ دەگرێت. مەسیحییەکان دەڵێن خودای ئەوان عیسا مەسیح بوو، ساراسینەکان موحەمەد، یەهودییەکان موساو بت پەرستەکان شاکیەمۆنی بۆرخان، کە یەکەم

---

دەگریا، هەتاکو لە رۆژی چوارەمدا ئەجەل گەیشتە سەر سەرتاقی نەفرت لێکراو لە مزلەکەی خۆیداو خودای گەورە تووشی ژانە زگی کردو رادەستی دۆزەخ کرا.) (طبقات ناصری، هەمان ٢١٧ـ١٨) و.

کەسێك بوو کە ئەویان وەك خوداو لە شێوە بت نیشان دا، و من ڕێز بۆ هەر چواریان دادەنێم تاکوو بەشکەم ڕێزم بۆ ئەویان دانابێت کە گەورەترینەو لە ئاسمانەو ڕاستەقینەترەو داوای یارمەتی لەو دەکەم.)) [58]

هەروەها خواند ئەمیر، مێژوو نووسی موسلمان، دەڵێ ((قوبلاقائان هەموو ڕۆژێك لە ڕۆژهەلاتنەوە تا کاتی ناشتاخواردن خەریکی کاروباری گرنگی پاشایەتی بوو. ئەو کات زانایانی ئیسلامو احباری یەهودیو ڕەببانەکانی ترساو زاناکانی خۆتا لە نشینگەی ئەو کۆ دەبوونەوەو گفتوگۆ و مشتومڕیان دەکردو بە گشتی حەزی لێ بوو گوێی بۆ دۆزەکانی عەقلیو نەقلی بگرێتو لە سەردەمی دەسەلاتی خۆیدا فەرمانی دا کە قۆرئانی پیرۆزو تۆریت (تەورات) و ئینجیلو پەرتووکی شاکمونی وەرگێرنە سەر زمانی مەغۆلی.[59])) (هەمان، لا ٦٦)

ئاگادار بوو کە لە ڕکابەرییە ئایینییەکانی ناو دربار دوور بێت. ڕشیدالدین دەڵێ ((پلەی فین جانیان (چینی: پینگ جانگ[1]) پێشتر بە خەڵکی خۆتای دەداو ئێستا بە مەغۆلو تاجیکو ئۆیغوریشی دەدەنو بە سەرگەورەی (فینجانەکان) دەڵێن (شۆ) فینجان.[602])) هەروەها وەك خواند ئەمیر دەڵێ ((پێشتر قائان هەمیشە پلەی وەزارتی بە چوار کەس دەدا کە هاودین بوون تاکوو بە هۆی جیاوازی ئایینییەوە کێشە نەکەوێتە نێوانیانو دارایی دیوان لە خیانەت بەدوورو پارێزراو بێت.)) (هەمان، لا ٦٧)

بەلام پێ ناچێت ئەم ڕامیارییە کاریگەر بووبێت وەك لەو نموونەی خوارەوەدا بەدەر دەکەوێ. ڕشیدالدین دەڵێ سەردەمی قوبیلای ((پۆستی وەزارتیان بە کەسێکی ئۆیغوری (بووزیی) بەخشی بەناوی سەنگە[3] و ماوەی شەش ساڵ کاروباری (ممالك) لە دەستی ئەودا بوو...)) دوژمنی موسلمانەکان

[1] . P'ing-chang
[2] . جامع التواريخ، لا ٩٠٧.
[3] . Sanga

بوو. ((بەرێکەوت رۆژێك قائان داوای چەند دانە مرواری لێ کرد. ووتی نیمە. کەسێکی دامغانی بەناوی مبارەك شا لە خزمەتی قائاندا خۆشەویستو بەرێز بوو و چاوەروانی دەرفەتێك بوو لەدژی سەنگە. لەو بارەدا باسی ئەوەی کرد کە سەنگە تەغارێك مرواری‌وگەوهەری لە ماڵەوە هەیەو من بینیومە. سەنگەیان سزا دا[62].))

بووزییەکانی تەبەتی رکابەرییان لەگەڵ دائۆییەکانی چینی پاراستو لە ئاکامدا سودیان لە کارگەرییەکەیان وەرگرت (لەرێگەی رەببانەیێك بەناوی پەگپا[2]) تاکوو هانی قوبیلای قائان بدەن کە دائۆییەکان سەرکەوت بکاتو لە ١٢٨٧ پەرتووکەکانیان لەناو ببات، تەنیا نووسراوێکی دائۆیی کە لەم پاکسازییە بەساغی دەرچوو دائۆ دە جینگ[3] بوو[63]. لایەنێکی گرنگی رامیاری بەرێوەبەرایەتی قوبیلای بێبروایی ئەو بوو سەبارەت بەو چینییە خۆجێییانەی کە لە خزمەتیدا بوون. هەرچەند ئەو دربارەکەی بردبووە چین‌و پایتەختێکی نوێی بەناوی خان بالیغ (بیجینگ/ پێکەنی ئێستا) دروست کردبوو، بەلام هەر لە دەستپێکەوە چەند خیانەتێکی کە لە راوێژکارەکانی بینیبوو وای لێ کرد زیاتر لە جاران روو لە بێگانەکان، بەتایبەت موسلمانەکان، بکات[644]. لەوێوە کە بێگانەکان هیچ پێگەیەکی پشتیوانیان نەبوو جگە لە خزمەتکارەکانی مەغۆل نەبێ، قوبیلای ئەوانی پێی سەقتەر بوو[65]. هەروەها لەوانەیە سەرکوتکردنی

---

[1]. هەمان، ٩٢و ٩٢٣.
[2] . Phags-pa
[3] . Tao te Ching
[4]. "کورەزای حەزرەتی بوخاری کە پاش یەلواچ لە خزمەتی قوبیلای قائان وەزیر بوو و قائان راژووی قەراجانگی بەو سپاردبوو... کاتێك نۆرەی پاشایەتی بە قوبیلای قائان گەیشت... پۆستی وەزارەتی بەو بەخشی‌و لە جێگەی ئەو ناصرالدینی کوری کردە راژووی قەراجانگو ئەویش ماوەی بیس‌وپێنج ساڵ وەزیر بوو... بەر لەوەش (کۆچی دوایی ناصرالدین) کوری ناصرالدین بەناوی ئەبوبەکر کە ئێستا پێی دەڵێن فنجان هەنارده شاری زەیتون وەك حاکمی ئەو شارە." (جامع التواریخ، ٩١٤ـ١٥)

دائۆییەکان‌و کۆنفۆشیوسییەکان لە لایەن قوبیلای ((بەم مەبەستە بوو کە ئەو چینیانەی کە شوێنگرتەی خانەدانی مغۆل بوون لە پالپشتی واتایی خۆی بێبەش بکات.))[66]

ناسراوترین موسلمانی درباری قوبیلای وەزیری دارایی بەدنامی ئەو ئەحمەد بوو[١] کە کارەساتی بیست ساڵەی باج ستاندی ئەو رعایای چینی قوبیلای‌و بێگانەکانیشی بێزار کردبوو. پێوەندییەکانی ئەو بەتایبەت لەگەڵ پایەبەرزانی بوودیی‌و کۆنفۆشیوسی ئیلخان تاڵتر بوو. وەزیرە چینییەکان ئەحمەدیان بە سودوەرگرتن تاوانبار دەکردو ئەویش لە وەڵامدا ئەوانی بەوە تاوانبار دەکرد کە دەست بلاو و ئەبلەخەرجن. سەرئەنجام نەیارانی چینی ئەحمەد بە دەستی ئەو لەسەر کار لادران یان کووژران، یان بە هۆی هۆکاری سروشتی مردن، یان بەنەفرەتەوە دەستیان لە کار ترازاند، کە لە ئەنجامدا لە ١٢٨٠ دەسەڵاتی ئەحمەد تارادەیەك ببەبێ‌کێشە بوو[67]. بەڵام دوو ساڵ دواتر سەردارێکی چینی بەناوی چیان هۆ کووشتی[٢]. قوبیلای ژمارەیەکی زۆری چینی کووشت کە گووماینان لێ دەکرا دەستیان لەم پیلانەدا هەبووبێت[٣]، بەڵام کاتێك ماڵەکە ئەحمەد گەران زانرا کە چ گەنجێکی گەورەی کۆکردۆتەوە، قائان ووتی کە گۆرەکەیان دەرداوەو لاشەکەیان خستە بەردەمی سەگەکان، یان بەپێی گێردراوەکانی مارکۆپۆلۆ و رشیدالدین فەرمانی دا بە گەردونە بەسەریدا برۆن[684].

---

١. امیر احمد فناکتی. و.

2. Ch'ian-hu "کەسێکی خۆتایی گائۆ فینجان وەزیری بوو." (جامع التواریخ، ٩١٦)

3. "گەورەپیاوان‌و‌ئەمیرەکانی هەنارد تاکوو بە رێزێکی زۆرەوە بەخاکی بسپێرن." (هەمان، ٩٢٠)

4. "فەرمووی کە لە گۆر دەریبێننەوەو گوریسیان لە لاقی بەستو بەسەر چوارلای بازاردا بە داریاندا کردو گەردونەیان بەسەردا لێدەخوری." (هەمان، ٩٢٠)

بەدوای بێبەزەیی قوبیلای، پاش مەرگی ئەحمە، ڕوانگەی ئەو بەرامبەر جەماوەری ڕعیەتە موسلمانکانی تەسکتر بووەوە، بۆ نموونە دووبارە سەرچاوەی کووشتنەوەی حەلالی ئاژەڵی بۆ موسلمانەکان قەدەغە کرد[69][1] . ڕشیدالدین دەڵێ کە ڕامیارییەکانی دژی موسلمانان، کە ڕێگەگرتن لە خەتەنەکردنشینی دەگرتەوە، بە دەستی کاربەدەستێکی مەسیحی بەناوی عیسا تەرسا کەلەمچی (چینی: ئای سێوئە[2])، کە ڕشیدالدین، تۆمەتباری دەکات کە غلامە موسلمانەکانی هان دەدا واز لە ئەربابەکانیان بێنن و بەجێیان بێلن. لە ئەنجامدا ئەم دەڵێ ((بارودۆخەکە وای لێهات کە زۆربەی موسلمانەکان دیاری خۆتایان بەجێهێشت[70].))

((چونکە تەرساکان لە سەردەمی قائان لەگەڵ موسلمانەکان بەتووندی دەمارگرژ بوون ئاماژەیان بەوە کرد کە لە قۆرئاندا ئایەتێك هەیە کە اقتلوا المشركين كافة[71]، و بە شێوەیەك کە قائان لێی ڕەنجا. فەرمووی کە لە کوێوە ئەم شتە دەڵێن؟ ووتیان بەپێی نووسراوێك لەلای ئاباقائانەوە هاتووە. قائان داوای ئەو نووسراوەی کردو زاناکانی بانگهێشت کردو لە بهاءالدین بهایی کە گەورەی ئەوان بوو پرسیاری کرد کە ئایا ئەم ئایەتە لە قۆرئانی ئێوەدا هەیە یان نا؟ ووتیان بەڵی هەیە. ووتی: ئەگەر خودا فەرموویەتی کە کافرەکان بکووژن کەواتە بۆچی نایانکووژن؟ وەڵامی داوە کە هێشتا کاتی نەهاتووەو بۆمان دەست نادات. قائان تووڕە بوو و فەرمووی بۆ من دەست دەداتو فەرمانی دا تاکوو سزایان دا.... داوای مۆلانا حمدالدین سابق سەمەرقەندییان

[1]. "فەرمووی لەمەو پاش موسلملنەکان و خاوەن پەرتووکەکان مەڕ سەر نەبڕن و وەك داب و نەریتی مەغۆلەکان سینگیان هەڵتلیشێنن،... عیسا تەرسا کەلەمچی و ابن معالی و بۆندوق کە لە دەستەی ناپاکان و خراپەکانی سەردەمی خۆیان بوون... غولامە موسلملنەکانیان هەڵدەخەلەتاند کە ئەگەر بێتوو جاسوسی بۆ خاجە بکەن ئەوا ئازادتان دەکەین... و بارودۆخەکە وەهای لێهات کە زۆربەی موسلمانەکان دیاری خۆتایان بەجێ دەهێشت..." (هەمان، ۹۲۱) هەروەها حبیب السیر، لا ٦٤. و.

[2] . Ai-hsueh

کرد کە دادوەر بوو هەمان پرسیاریان ئاراستەی ئەویش کرد. ووتی: ئەم ئایەتە هەیە. قائان فەرموی بۆچی ناکووژن؟ ووتی خودای مەزن فەرموویەتی کە کافرەکان بکووژن، ئەگەر قائان فەرمان بدات دەڵێم کە کافر کێیە. فەرمووی بڵێ. ووتی چونکە تۆ ناوی خودا لەسەر یەرلیغ (فەرمان) دەنووسی کافر نیت، کافر کەسێکە کە خودا نەناسێو شەریکی بۆ دابنێت‌و خودای گەورە ئینکار بکات؟ قائان ئەمەی زۆر بەلاوە خۆش بوو.... [721])) ئەم وەڵامە لەو سەردەمەدا گیانی موسلمانەکانی رزگار کرد، بەڵام حیسارەکان لەدژیان چەند ساڵی تریش درێژەی خایاند. لەو کاتەدا دەستکەوتەکانی بازرگانی موسلمانەکان زۆر کەم بووەوە هەتاکوو لە ١٢٨٧ قوبیلای ڕێگری سەربرینی حەلالی ئاژەڵی هەلوەشاندەوە [732].

ئەمە هەمان ئەو ساڵە بوو کە لە رۆژئاوا، ئیلخان ئارغون دووهەمین بالیوزەکەی هەناردە ڤاتیکان، ئەمجارەیان بەسەرپەرشتی ابن صوما، تورکی نەستوری. ئارغون لە نامەکەیدا بۆ پارپ هەمان داواکاری پێشووی دووبارە دەکاتەوە بۆ ئەوەی ئەورووپییەکان لە هێرشکردنە سەر لەوان‌و میسر یارمەتی بدەن‌و دەڵێ ئەگەر لە وەرگرتنەوەی ئورشەلیمدا سەرکەوتن بەدەست بێنێت ئەوا دەبێتە مەسیحی [74].

---

[1]. هەمان، ٢٢-٩٢٣. حبیب السیر، لا ٦٥.

[2]. "ووتیان کە بازرگانە موسلمانەکان هەموو لێرە رۆیشتن‌و لە دیاری موسلمانەکانەوە هیچ بازرگانێك نایەت‌و تەمغاکانیان (مالیاتەکان) شکاندووەو تەنگسووقەکان (شتی نادرو کەمیاب) ناهێنن، بەهۆی ئەوە کە حەوت ساڵە مەڕ سەر نابڕن، ئەگەر فەرمان بدرێت کە بتوانن مەڕ سەر ببڕن، بازرگانەکان هات‌وچوو دەکەن‌و تەمغا بەتەواوەتی بەدەست دەکەوێت. بۆیە فەرمان بە ڕێگپێدان درا." (هەمان، ٩٢٢) و.

## پیلان و ئاژاوە لە سەرزەوییەکانی ئیلخان

ئارغون کوری ئاباقا بوو کە لە سەرچاوەکانی چینیدا بە لایەنگری مەسیحییەت نیشان دەدرێ. لە ١٢٨١ ئاباقا بە ئۆردینەیشنی[1] یابلاهای سێیەم رازی بوو کە نەستورییەکان وەك جاثلیق هەڵیانبژارد بوو. تورکێکی ئۆنگوت بەناوی مار یابلاها، لە چینەوە لەگەڵ ابن صوما بە هیوای بینینی ئورشەلیم سەفەری بۆ رۆژئاوا کردبوو، بەهۆی هاوپێوەندی فەرهەنگی ئەو لەگەڵ سەرکردەنوێیەکانی مەغۆل، نەستورییەکان ئەویان بۆ سەروکایەتی کەنیسەکەیان هەڵبژارد بوو. دەڵێن ساڵی دواتر ئەباقا لە بۆنەی جەژنی پاك لە بەغدا بەشداری کردبوو[75]. بەلام پاش ماوەیەکی کورت ئەباقا کۆچی دوایی کردو تەگوداری[2] برای بوو بە جێگری ئەو کە بڕوای بە ئیسلام هێناو ناوی سولتان ئەحمەدی هەڵبژارد. یەکەمین کاری خانی نوێ لەسەر کار لادانی ئەستێرەناس و پزیشکانی مەسیحی و یەهودی دربارى ئیلخان بوو. جگە لەمە ((بتخانەکان و کەنیسەکانی رووخاندو لە جێگای ئەوان مزگەوتی دروست کرد.))

دوو کەس لە پیاوانی ئایینی پایەبەرزی شام، کە ئیرەییان دەبرد بەدانانی مار یابەلاهای ئەجنەبی لە پۆستی جاثلیق و ابن صوما وەك مەلازم گشتی، ئەم بوختانەیان بە سولتان ئەحمەد راگەیاند کە ئەو دوو تورکە دەیانهەوێ کورێکی دیکەی ئەباقا واتە ئارغون ببێتە جێگری باوکی. دەرکەوت کە ئەو بەڵگەی کە مار یابەلاهاو ابن صومای تاوانبار دەکرد راست نییە بەلام هەوڵیستیان تاکوو سەرکەوتنی ئارغون بەسەر سولتان ئەحمەد لە ساڵی ١٢٨٤ هەر ناجێگیر بوو. کاتێك ئارغون پیلانی ئەو دوو کەسەی خەڵکی شامی بیست، فەرمانی دا بیانکوژن بەلام بە ناوبژیکردنی مار یابەلاها رزگارییان بوو، و تەنیا داوای کرد ئەو دووانە لەسەر کارەکانیان لادرێن[78].

---

[1] . ordination
[2] . Tagudar

لـه سـەردەی پاشـايەتی ئـارغون پزيـشكێكی يـەهودی بـەناوی سـەعدالدوله پلـەی خەزانـەداری گشتیو پاشـان وەزيـری گـەورەی بەدەسـت هێنـا. بـەپێی سەرچـاوەی موسـلمانەكان ((سـعدالدوله ئـەو ديارانـەی بـە خزموكەسـی خـۆی دەسپاردو لەراستيدا لە سەردەمی وەزيری سعدالدوله تەواوەتی وولات لەوپەری ئاوەدانيدا بوو و هيچ كام لە ئەميرو ئەفسەرەكانی ئـارغون خـان نەيانـدەتوانی ستەمو دەستدرێژی بكاتە سەر رەعيەتو جوتيـاران[79].)) (حبيـب الـسير، ج٣، ل١٣١)

پێدەچێ كە سعدالدوله بەناو بووبێتە ئيسلام، هەرچـەند كـە دەڵێن قائـانی هان دەدا كە بانگەوازی پێغەمبـەری بكـاتو ئـاينێكی نـوێی دابێنێـت[1] ((و دابـو نەريتی رابردوو ياساكانی كۆنی لـەرووی جيهـان.سـرييەوە.)) لـە ئـەنجامی ئـەم ئامۆژگارييە، ئارغون ((فەرمانيدا رێگە بە هيچ موسلمانێك نـەدەن بێتـە ديـوانی كارو رێگـری هاتوچـووی ئـەو عەشـيرەتە بـن بـۆ نـاو اردو. سـعدالدوله لەگـەڵ ئـارغون خـان بڕيـاری دا كـە كەعبـە بكاتـە پەرسـتگەی بتـە بـەدناوەكانو موسلمانەكانو شوێنكەوتەكانی ديكەی انام لە پەرستينی خـودای بەخـشەندەی دڵوڤان هەڵگەرێننـەوە بـۆ پەرسـتينی بتـەكان)) (هـەمان، ل ١٣٢) سـەرئەنجام ئـارغون نـەخۆش كـەوتو گروپێـك لـە درباريیـەكانی سـعدالدولەيان گـرتو كووشـتيان، و ((رۆژی دواتـر ئـاوی دركـی ئاگربـاری شـەربەتی نـەمانيان بـە سعدالدولەی نەفرت لێكراوی بەخت رەش داو مەغۆلو موسـلمان دەسـتە گوڵی سـلاويان بـۆ بـاغی پـر لـە روونـاكی دانيـشتوی يثـرب نـاردو پيـاوانی ئـايينی

[1]. "سعدالدوله بەوپەری رەقدلی چەندجار بە ئارغۆن خانی راگەياند كە لـە رێگـەی چـەنگيزخانەوە پێغەمبەری گەيشتۆتە خووسرەوی دوورەدەستەكان..." (هەمان، ل ١٣-١٣٢) و.

ئەحمەدی لە خەزانەی گەورەیی خودا عەبای مانەوەیان دەبەر کرد[80].))
(هەمان، لا ۱۳۲)

لە ۱۲۹۱ ئارغون کۆچی دوایی کردو برا بچوکەکەی گیخاتۆ[۲] بوو بە جێگیری ئەو کە بەشێوازی هەمیشەیی مەغۆلەکان ((هەموو نارازییەکانی ئایینی لە پێگەی خۆیان هێشتەوەو ڕێزی لە هەموو بیروباوەرە سەرکییەکان گرت، جا مەسیحی بێت یان عەرەب یان یەهودی یان بت پەرست، و لایەنگری لە هیچ کامیان نەکرد[81].)) بەلاّم کۆمەلێك خەلاّتی بە بەهای ۲۰۰۰۰ دینار بە جاثلیقی نەستوری بەخشی. هەروەها لە مەراغە، پایتەختی ئیلخان، رایسپارد کەنیسەیەکی جامعی نوێی دامەزرێندرێت کە سالّی دواتر دووجار سەردانی ئەو شوێنەی کرد. لە ئاکامدا گیخاتۆ پێشنیاری دروستکردنی صومعەیەکی نوێی لە باکوور پایتەخت خستەروو، بە کورتی ((هەر شتێك کە مار جاثلیق دەمی داوای بۆ دەکردەوەو ئارەزووی دەکرد ئەو جێبەجێی دەکرد[82].)) دواهاتەکانی ئەم پشتیوانی کردنە ئاشکرایە، زۆر زوو لە پێوەندییەکانی لەگەلّ موسلمانەکانی ئەم هەرێمە وەدەرکەوت.

لە ۱۲۹۵ دا گیخاتۆ بە دەستی ئەمیرەکانی سەکوت کراو کوژرا[۳]. شازادە بایدۆ[٤] دەسەلاّتی کەوتە دەست بەلاّم غازانی برای گیخاتۆ نەبەردی لەگەلّ کرد. غازان تعمید درابوو و بە ئایینی مەسیحی پەروەردە کرابوو. بەلاّم سەرداری گەورەی ئەو،پیاوێك بوو بەناوی ئەمیر نەورۆز، موسلمان بوو و بەلێنی

[1]. "تووکالو طغان چوونە خێلخانەی سعدالدولەو سوپاییەکان هێرشیان کردو بەتەواوی خانووی موسلمانو جویەکانیان تالان کرد کە لەوێ دەژیانو بۆ بەدەستهێنانی خشلو شتی شاراوەی تر زەویو زارەکانیان هەلکۆلی." (جامع التواریخ، ۱۱۸۱) و.

[2]. Kaikatu

[3]. "چوونو ئەویان گرتو سپاردیانە دەست ئەمیرە توورەکان تاکوو لەناوی ببات." (لە سالّی ٦٩٤هـ.ق). (جامع التواریخ، ۱۲۰۱) و.

[4]. Baidu

پشتیوانی سوپایەکی موسلمانی پێدابوو بەو مەرجە کە غازان بەڵێن بدات پاش سەرکەوتنی بەسەر بایدۆ ببێتە موسلمان. ئەمە زۆر زوو هاتەدی غازان بوو بە موسلمان[1].

راپۆرتی موسلمانەکان لەم ڕووداوە ئەمە روون دەکاتەوە کە بەشێکی ململانێی ئایینی لەناو هەرێمی ئیلخانییەکان لە نێوان دوو گرووپی مەغۆلەکان بوو، یەکێك ئەوانەی کە گرۆیی ئیسلان ببون‌و گروپەکەی تر ئەوانەی کە گرۆیی نەببوون: (( لەو رۆژە پیرۆزەدا نزیکەی سەد هەزار کافر ئیمانیان هێناو یەکگرتوو بوون‌و لە تاریکایی کفرو بت پەرستیی رزگاریان بوو و گەیشتنە رووناکایی توحیدو عیرفان.))[84] (هەمان، لا ١٤٤)

بەڵام لە ماوەی چەند مانگدا ((عشیرەتێك لە شازادەکان‌و نوئینەکان... لەگەڵ یەکدی رێککەوتن‌و پەیماننامەیەکی بە غلاظی ئیمانیان بەست کە هەر چۆنێك بێ بتوانن غازان خان‌و ئەمیر نەورۆز شەهید بکەن‌و مزگەوت‌و پەرستگەکانی خیرالانام بکەن بە کەنیسەو ماڵی بتەکان[85].)) (هەمان ١٤٧)

لەم ناوە، لە رۆژهەلات، تەیمور قائان جێگری قوبیلای، ئانەندەی[2] کوری مامی خۆی (نەوەی قوبیلای) (لەوانەیە بووزیی بووبێت) کردە دەسەڵاتداری ناوچەی تەنگقوت[3]. جەماوەری ئەو شارە تارادەیەکی زۆر موسلمانی چینی بوون، لە کاتێکدا خەڵکی گوندەکان هەر بە بت پەرستی مابوونەوە. ئانەندە عاشقی ژنێکی موسلمان دەبێ‌و دەبێتە موسلمان‌و زیاتر ١٥٠٠٠٠ سەربازی خۆی

---

[1]. "غازان خان بەهۆی بەڵێنێکی کە بە ئەمیر نەورۆزی دابوو، لەبەر دەم شیخ صدرالدین ئیبراهیم کوری شێخ سعدالدین حموی شایەت‌وئیمانی هێناو بە دڵپاکییەوە ئایینی راستقینەی پێغەمبەری پەسند کرد." (هەمان، لا١٤٤) و.

[2]. Ananda

[3]. "تەنگقوت وولاتێکی گەورەیە کە درێژایی‌و پانتایی زۆرەو بە زمانی خۆتایی پێی دەووترێ خۆواشی واتە رووباری گەورەی رۆژئاوا." (جامع التواریخ، هەمان، ٥٠) و.

ناچار کرد ببنە موسڵمان[1]. ئەمە بووە هۆی ناکۆکی ئەو لەگەڵ تیمور قائان کە هەوڵی دەدا وازی پێ لە ئیسلام بێنێت.

((تەیمور قائان لەم چیرۆکە زۆر ڕەنجاو جیرقەلەنگو جیرتەقۆ کە دوو بڕانو سەردەستەی قوشچییەکان، هەناردی تاکوو واز لە پەرستشو یادی خودا بێنێتو سوجدە بۆ بتەکان بباتو لە بتخانە دا بخوور بسوتێنێت، ئانەندە ئینکاری کردو پشت گوێی خست... قائان ووتی: ئەو دێوەزمە ئەو ڕێگەی نیشانی تۆ دا. وەڵامی داوە ئەگەر دێوەزمە ڕێگەی نیشانی من داوە، غازان کە گەورەی منە، کێ ڕێنمایی کردووە؟... هەر چەند ئانەندە لە منداڵیەوە بیری موسڵمانی هەبوو بەڵام کاتێک زێدەڕۆیی لەم بوارەدا کرد کە بینی پاشای ئیسلامی غازان خلد ملکە بۆتە موسڵمانو پاکدینو لە ئێران تەواوەتی مەغۆلەکانی کردۆتە موسڵمانو بتەکانی شکاندوەو بتخانەکانی رووخاندوە، ئەویش لاسایی ئەوی کردەوەو بۆ بەهێزکردنی ئایینی ئیسلام هەوڵی دا.)) دەتوانرێ وێنا بکرێ کە

[1]. لە جامع التواريخ دا هیچ باس لە ئاشق بوونی ئانەندە نەکراوە: "مەنگ قەلان باوکی ئانەندە چونکە منداڵی بۆ نەدەما، ئانەندەی بە موسڵمانێکی تورکستانی سپارد کە ئەسبداری حەسەن ئاقتاجی بوو تاکوو پەروەردەی بکات. ژنی ئەو پیاوە بە ناوی زولەیخا شیری پێدەدا، هەربۆیە موسڵمانیتی لە دڵیدا چەسپابوو و فێری قورئان ببوو و زۆر بەباشی بە خەتی تاجیکی دەینووسیو هەمیشە ڕۆژەکانی بە پەرستشو یادی خودا تێدەپەراندو نزیکەی سەدوپەنجاهەزار لەشکری مەغول کە لەگەڵیدا بوون زۆربەیان بوونە موسڵمان." (هەمان، ٩٥١)

ئەویش ئەم کارەی بە بیانووی توونـدو قورس
ئەنجام داوە.

لەم بوارەدا ململانی لە نێوان خودی مەغۆلەکان هەیە کە دەبێ ئازارو سەرکوتی نەستورییەکان لە رۆژئاوا ببینین کە لە سەر چاوەکانی مەسیحیدا هاتووە. بەپێی مێژووی مار یابەلاها، ئەمیر نەورۆز بوو کە ئەم فەرمانەی دەکرد: ((کەنیسەکان بنەبرو میحرابەکانیان سەرەوژووربکەن و ڕێگری بکرێ لە ئەنجامدانی عشای ربانی و دوعاو وێردو بانگەواز بۆ نوێژکردن نامێنێت و سەرۆکەکانی مەسیحییەکان و کۆمەڵەکانی یەهودییەکان و گەورە پیاوەکانیان نامێنێت.))

دەستبەجێ موسلمانەکان رژانە ناو کەنیسەی جامعی مەراغەو تالآنیان کردو قەشەکانیان بە بارمتە گرت. هەندێکیان رووت کردەوەو بەستیانەوە، خودی مار یابەلاهایان سەراوبەن هەڵواسیبوو و لێیان دەداو لەم کاتەشدا دیلکەرەکان داوایان لێی دەکرد واز لە ئایینەکەی بێنێت و ببێتە موسلمان. لە کۆتاییشدا بۆ ئازادکردنی ئەو، مەسیحییە خۆجێییەکان ٥٠٠٠ دیناریان دا بە موسلمانەکان.سەرئەنجام هیتۆم پاشای ئەرمەنستان لەگەڵ ئەفسەرە چەکدارەکانی ناوبژی کردو تالانکردنی کەنیسەکانی مەراغە راگرت و جەماوەری بێدەنگ کرد[87]. بەڵام نەورۆز درێژەی بە ئازاردانی ماریابەلاها داو فەرمانیدا کە جاثلیق (ماریابەلاها) ئەو خەڵاتانە بگەرێنێتەوە کە گیخاتوو پێی بەخشی بوو[88]. جگە لەمانە، نەورۆز فەرمانی رووخاندنی کەنیسەکانی تەبریزو هەمەدانی دەرکرد. کەنیسەکانی موصل و بەغداد ئازادی خۆیان کرییەوە، موسلمانەکان کۆشکی خەلیفەیان وەرگرتەوە کە هۆلاگو بە بەتریرکی دابوو، جامعێکی

نەستوریان گۆڕیو کردیانە مزگەوتو ئێسقانەکانی بەتریرك مار مەکیخاو مار دێنهایان[1] لە گورەکەی دەرهێناو بردیان[89].

کاتێك غازان بیستی چ کارەساتێکیان بەسەر مەسیحییەکان هێناوە فەرمانی دا کە جەزیەیان لێ نەستێننو ووتی ((هیچ کامیان نابێ واز لە ئایینی خۆیان بێننو جاثلیق دەبێ لە دۆخێکدا بمێنێتەوە کە بۆی ڕاهێنراوەو دەبێ بەرێزێکەوە کە شایەنێتی ڕەفتاری لەگەڵ بکریو لەسەر تەختی خۆی فەرمان دەداتو گۆچانی دەسەلات لەسەر هەرێمەکەی رادەگرێت.)) جگە لەمە، ئیلخانی نوێ وەك غەرامەت ٥٠٠٠ دینار بۆ ماریابەلاها نارد[90]. بەلام جێگەی سەرسورمان نییە ((بەهەمان ڕێژەکە بەرەبەرە ئەو ڕێزە زیادی کرد کە پاشا (غازان) بۆ جاثلیقی دادەنا، نەفرەتێکیش کە لە دلی دوژمنکانی جاثلیقدا هەبوو زیادی دەکردو پیلانیان بۆ دادەرشتو هەوالی هەر ڕووداوێکیان دەگەیاندەوە لای نەورۆز.[91]))

سالی دواتر ((پیاوێك بەناوی شیناخ التیمور هاتە مەراغەو هەوالی نارد کە فەرمانێکی لەگەل خوێدا هێناوە کە ناوەرۆکەکەی دەلێ هەر کەسێك وازی لە مەسیحییەت نەهێناوەو ئایینەکەی وەلا نەخستووە، دەبێ بکوژرێت[2].)) هەرچەند ئەم هەوالانە درۆ بوون، بەلام ئەو بیرەی بە موسلمانەکان بەخشی کە دووبارە تالانکردنی کەنیسەی جامع تالان بکەن. لەناو ئەو شتانەی کە بردیان مۆرێکی ئالتونو مۆرێکی زیوی تێدا بوو کە یەکەمیان مۆنگکە قائان بە بەتریرکی بەخشی بوو و ئەوەی تریان ئارغون.

هەولی دەسەلاتدارەکانی خۆجێیی بۆ سزادانی تاوانباران بووە هۆی شۆرشێکی گشتی کە تێیدا جامعی مەسیحی بەتووندی زیانی بەرکەوتو ژمارەیەکی زۆری ڕەبیانەکان کوژران. مار یابەلاها لەگەل چەند هاوڕێی ڕایان

---

[1] . Denha

کردو پەنایان بردە بەر ماڵی یەکێك لە هاوسەرەکانی مەسیحی غازان بەناوی بۆرگیسن ئارگی[93،1] . کاتێك غازان ـ لەو کاتەدا لە سەفەر بوو ـ هەواڵی ئەم ڕووداوەی بیست، فەرمانی دا کە موسلمانەکانی مەراغە کۆبکەنەوەو ئەشکەنجەیان بدەن تاکوو هەر شتێکیان بە تاڵان بردووە بیگەڕێننەوە، بەڵام ئەوان تەنیا ((بەشێکی زۆر بچووکی شتەکانیان گەراندەوە ئەوەی تر مایەوە.))

پاش ماوەیەکی کەم لە ئەربیل، کوردەکان ئەمەیان خستە سەر زمانان کە هەندێ لە سەربازەکانی مەسیحی غازان هێرشیان کردۆتە سەریان‌و ردێن سپییەکیان کووشتووە. بەپێی مێژووی یابەلاها ((شەڕو بەدوای ئەودا ڕەق‌و ئاژاوە زۆر بوو و شەڕ دەستی پێکردو ڕەق‌و کینەی لە هەر دوو لا زۆر بوو واتە لای مەسیحییەکان‌و لای عەرەبەکان (واتە موسلمانەکان). هەر دوو لایەن داویان بۆ یەکتر ناوەو چەند شەڕیان کرد[95].)) لەم ماوەدا غازان خەریکی دامرکاندی شۆرشێك بوو کە نەورۆز لە خۆراسان هەڵیگرساندبوو. لەم ناوەدا، مەسیحییەکانی ئەربیل بەرەو قەڵا ڕایان کردو موسلمانەکان کە ژمارەیان زۆر لەوان زیاتر بوو گەمارۆیان دابوون. وەزیرە موسلمانەکانی غازان ئەم دۆخەیان وەك ئاژاوەیەکی مەسیحییەکان نیشاندا. لە وەڵامی ئەم ڕووداوەدا مار یابەلاها هاتە دربار تاکوو دۆزی مەسیحییە گەمارۆدراوەکان بخاتە ڕوو. قائان فەرمانی دا مەسیحییەکان‌و موسلمانەکانی ئەربیل لەگەڵ یەکدی بە ئاشتی بژین‌و مەسیحییەکان ناچار بوون ۲۰۰۰۰ دینار غرامە بدەن. بەڵام ڕێگەیان پێدار قەڵا لە دەستیاندا بێت[96] .

[1] . Burgsin Argi

## میسیونەکانی دواییێی پاپ

یەکەمین سەرکەوتنی ڕاستەقینەی کەنیسەی لاتین لە ڕۆژهەلاتی مەغۆلی بەهۆی هەولەکانی یوحەنا/ جۆن خەلکی مۆنتەکۆرینۆ[1] ڕەبەنێکی فرەنسیسکۆنی بوو کە لە سالی ١٢٩٠ ناردبوویانە درباری مەغۆل لە خان بالیغ.

یوحەنا لە چوار دەیە زیاتر هەتا کاتێك لە سالی ١٣٢٨ کۆچی دوایی کرد، بە نەبراوەیی ئایینی کاتولیکی لەناو مەسیحییە جۆراوجۆرەکانی ئەو هەرێمە، کە لەو کاتەدا ژمارەیان زۆر بوو، بلاو کردەوە. جگە لە کۆمەلەکانی نەستووری تورك‌و مەغۆلی خۆجێیی، بە زۆرەملی ژمارەیەکی زۆر لە ئەرمەنییەکان، ئۆسلاوەکان، یۆنانییەکان‌و مەسیحییەکانی تر لە سەرەتاکانی سەدەکە پاش سەرکەوتنەکانی مەغۆلەکان لە ئەوروپاو ڕۆژهەلاتی مەدیتەرانەوە هاوردبوویاننە ئەوێ.

یەکەمین هەنگاوی گەورەی یوحەنا ئەوە بوو کە پاشای نەستوری ئۆنگوت کوێرگویز کورگێن[2]، (پرەنس جۆرج)و رعیەتەکانی بەرەولای پاپ ڕاکێشا، هەرچەند پاش کۆچی دوایی جۆرج، قەشەکانی نەستوریی خۆجێیی خەلکیان گەراندەوە سەر ئایینی سەرەکییان. هەروەها یوحەنا کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەر ئالانەکانی قەوقاز کە شوێنگری دابونەریتی ئۆرتۆدۆکسی یونانی بوون‌و هەم لەسەر ئەو ئەرمەنییانەی کە لە ماوەی مأمورییەتەکەی پێشوی لە ئەرمەنیستان زمانیان فێرببوو. لەسالی ١٣٠٧ هەوالی هەولەکانی یوحەنا لە چین بە پاپ گەیشتەوەو ئەویش لە وەلامدا کردی بە یەکەمین ئۆسقۆفی گەورەی خان بالیغو بەتریرکی ڕۆژهەلات.

---

[1] . John of Montecorvino
[2] . Korguz Kuregen

بەلأم قەشەکانی نەستوریی کە یوحەنایان وەك رەقبێك دەدیت کە هەوڵ دەدات بەزۆری بچێتە ناو یورتی ئەوانەوە، هەمیشە بەردیان دەخستە بەرپێی. لە کۆتاییدا کار گەیشتە جێگەیەك کە بە ساختەچێتی تاوانباریان کرد وەك لە بەندی خوارەوە لە دووەمین نامەکەیدا هاتووە، ئەوەندەی نەما بوو کە لەناوی ببەن و هیوادار بوو ئەم نامە بگاتە دەستی پاپ:

> نەستورییەکان کە خۆیان بە مەسیحی دادەنێن بەلأم بە شێوازێکی زۆر نامەسیحییانە رەفتار دەکەن، لەم هەرێمانەدا وەها بەهێز بوونە کە رێگە نادەن بە هیچ مەسیحییەکی تر کە دابونەریتی تریان هەیە، جێگەیەکیان بۆ پەرستش هەبێ جا ئەو جێگە هەرچەندەش بچووك بێت و جگە لە بیروباوەری خۆیان ئامۆژگاری هیچ پەیرەوێکی تر ناکەن. چونکە هەرگیز هیچ حەواری یان خوێندکارێکی حەوارییەکان نەگەیشتونەتە ئەم هەرێمە، هەربۆیە نەستورییەکان راستەوخۆ و هەروەها پێدانی بەرتیل بە خەڵکی تر زۆر ستەمیان لەگەڵ کردووم و دەڵێن کە حەزرەتی پاپ منی نەناردووە بەڵکوو جاسوس و جادوگەر و هەڵخەڵەتێنەری پیاوانم. پاش ماوەیەك بەڵگەی درۆیینیان دروست کردوو دەڵێن کە هەناردەیەکی تر لەگەڵ زێرو خشڵێکی گەورە بۆ ئیمپراتوور هەناردرابوو کە من لە هیند کووشتومەو خەڵاتەکانیم دزیوە. ئەم پیلانە پێنج ساڵ درێژەی کێشا تا جیگایەك زۆرجار لێکۆڵینەوەیان لێدەکردم و دەیانخستمە

مەترسـی مـەرگێکی شـەرمنانەوە. بـەڵام سـەرئەنجام، بـە یارمـەتی خـودا ئیمپراتـور لـە بێتـاوانی مـنو نـاوەرۆکی بوختانـچییەکان تێگەیـشتو بـە ددان پێـدانانی هەنـدێکیان، ئەوانیان لەگەڵ ژنو منداڵەکانیان دەرکرد[7].

نەبەردی یوحەنا بۆ ئیمانی کاتولێك لە چینی مەغۆلەکاندا نەبەردێکی یەك تاکی بوو و لە نامەکەیدا دەڵێ ئەگەر تەنیا دوو یان سێ قەشەی کاتولیکی تری هەبوایە کە پێگەی ئەویان لە بەرامبەر نەستورییەکان بەهێز کردبا لەوانەیە سەرکەوتوو ببوایە کە خودی قائانیشی کردبا بە کاتولیك[98]. لەراستیدا پێدەچێ یوحەنا تەنانەت لە پشتگیری ئەندرۆ، خەڵکی پروگیا/ فریگیە[1] هاوولاتی ئیتالیایی فرەنسیسکۆنو پەیڕەوی تیۆرەکەشی بێبەش بووەو ئەمەش لەوانەیە بەهۆی بۆشاییەك بوو کە ئەو کات لە نێوان مەعنەوییەکان[2]و جەماوەر لە فرقەدا هەبوو[99*].

ئاشکرایە کە ئیمپراتوری مەغۆل درێژەی بە خۆراگری خۆی داو لەم ناوەدا پیاوانی ئایینی فرقە جۆراوجۆرەکان کە لە هەرێمەکەی ئەودا چالاکیان دەکرد نەناسراو بوون. ئەندرۆ نەویستانە ئەم جیاوازییە کورت دەکاتەوەو دەڵێ ((ئەم ئیمپراتورییەتە بەرفراوانە لەڕاستیدا پیاوانێك لەخۆ دەگرێت لەهەر نەتەوەیەك کە لەژێر ئاسماندا هەیەو لە هەر فرقەیەك کە هەنو هەموو ڕێگەیان پێدراوە کە

[1]. Andrew Perugia
[2]. Spiritual

* "مەعنەوییەکان" ڕەبەبانی فرەنسیسکۆنی بوون کە دڵبەستراوییان بە هەژاری بە زێدەڕۆیی دادەنرا. ئەوان یاساکانی فرەنسیسی پیرۆزیان لە جیاتی یاساکانی پاپ دانابوو. کەسانێك کە سەردانی کەنیسەی کاتولیکی ئاڤینیۆنیان دەکرد هەندێك مشتومڕیان لە نێواندا هەبوو و لە ئەنجامیشدا لەو کەنیسەیە دەرکران. (نووسەر)

بەپێی فرقەی خۆیان بژین. چونکە ئەو بیروباوەری ئەوان، یان دەبێ بڵێم هەڵەی ئەوانە کە هەر کەسێك بەپێی فرقەی خۆی رزگار دەبێت[100].))

هەروەها پێرێگرین[1]، کە پاپ لەگەڵ ئاندرۆ هەناردبووی تاکوو پیرۆزی پێگەی ئۆسقۆفی گەورە بە یوحنا ببەخشن، لە راپۆرتێکدا دەری دەخات کە لە حکومەتی مەغۆلەکاندا، رەببانەکانی کاتولێك رێگەیان پێدرابوو کە ئامۆژگاری بووزییەکان بکەن تەنانەت لە مزگەوتەکانی موسلمانەکاندا[101]، هەرچەند ئەندرۆ قەبولی دەکات کە ((هیچ کام لە یەهودیو ساراسینەکان گرۆیی مەسیحییەت نەبوون)) و ((زۆربەی بت پەرستەکان (بووزییەکان) تعمید درابوون، بەڵام پاش تعمیدەکە وەها بەجدی نەریتەکانی مەسیحیی پەیرەو ناکەن[102].)) لەگەڵ ئەمەشدا بەراوردیان کردووە ئەو ساڵانەی کە یوحەنا لە چین بووە، نزیکەی دەهەزار کەسی هێنایە سەر ئایینی کاتولیك کە زۆربەیان سەر بە فرقە جۆراوجۆرەکانی مەسیحی بوون[103].

لە ساڵی ١٣٣٦ ئالانەکانی خان بالیغ نامەیان بۆ پاپ نووسیو داوایان کرد کە جێگرێك بۆ یوحەنا بنێرێت، چونکە هەشت ساڵ بوو کۆچی دوایی کردبوو. ووتوویانە ئالانەکان پێویستیان بە کەسێك بوو کە بتوانێت بەرامبەر بە پیاوانی ئایینی نەستوری راوەستێت بەهەمان شێوە کە یوحەنا راوەستا بوو[104]. هەرچەند کە هەناردەی پاپ هەرگیز نەگەیشتە چین، بەڵام بالیوزێکی پاپ بە سەرپەرشتی یوحەنای مارینیۆلی[2] کە لە رێگەی ئاورێشم لە ئاسیای ناوەڕاستدا سەفەری دەکرد، گەیشتە ئەوێ. لە درێژایی رێگەکەدا شوێنەواری ئەو ستەم ئازارانەیان بینی کە موسلمانەکان، پاش بوونە موسلمان بوونی مەغۆلەکانی رۆژئاوا، بە کۆمەلەکانی مەسیحی ئاسیای ناوەڕاستیان دەگەیاند.

---

[1] . Peregrine

[2] . John Marignolli

لە ئالمالیق زانیان کە سەرکردەی جۆغتایی، نویێ موسلمانێك بەناوی عەلی سولتان، ساڵی رابردوو میسیون فرەنسیکۆنی لەوێ لا دابوو[105]. ماربنیۆلیو هاورێکانی چوونە خان بالیغو سێ ساڵ لەوێ مانەوە. ئەو دەڵێ کە لەم ماوەدا ((لەگەڵ یەهودییەکانو فرقەکانی دیکە گەڵەراوێژی زۆر شکومەندی)) ساز داوە. پێدەچێ یەهودییەکان، وەك نەستوریی‌و موسلمانەکان، حەزیان دەکرد کە پەیکەرەو شەمایلی کەسە پیرۆزەکانی کاتولیك وەك بت بپەرستن.

مارینیۆلی کە رێگەی دەریای هەڵبژارد بوو بۆ گەرانەوەی بەرەو ئەوروپا، لە شاری بەندری زەیتون ئەوەند مایەوە کە توانی دوو ناقوسی کەنسیە بە دروستکردن بدات کە لە کاتی مالآوایی بە نیشانەی بێڕێزی کردن لە گەڕەکی موسلمانەکانی دانابوو. مارینیۆلی کە لە ١٣٥٣ گەیشتە ئاڤینیۆن نامەیەکی لەلایەن ئیلخانەوە بۆ پاپ هێنا کە تێیدا داوای لە پاپ کردبوو کە ژمارەیەکی زیاتر فرەنسیکۆن بۆ چین بنێرێت. بەلآم ئەمە لە کاتێکدا بوو کە نەخۆشی تاعون تەواوی ئەورووپای گرتبووەوەو هیچ میسیونێکی تری کاتولیك تا سەدەی شانزدە نەنێردرا بە رۆژهەلآت.

## رامیاری نەهاتووە دی

هەرچەند هەندێ لە پاشاکانی مەغۆل جاروبار گوشەنیگایەکیان بە ئەم یان ئەو ئایینەی هەرێمەکەیاندا دەخشاندو گرنگییان پێدەدا، بەلآم رامیاری گشتییان لەسەر ئەم بنەمایە بوو کە هەوڵ بدەن لە نێوان نەریتە دۆنادۆنەکاندا هاوسەنگیەك دروست بکەن بۆ ئەوەی هەر کامیان بتوانێت هەتا بۆی دەکرێ لە خزمەتی ئەواندا بێت. ئەم رامیارییە بەشێوەی جۆراوجۆر رێگەی بە نوێنەرەکانی هەر نەریتێك دەدا کە باوەر بکەن دەماری رەقیبەکانیان لەدەست دایەو دەتوانن بە پارێزراوری لە سزاکانیان هەر کارێك ئەنجام بدەن، کە ئەمەش بووە هۆی رێژەیەکی گەورەی وێرانی‌و خوێنرژان.... مەغۆلەکان هیوایەکیان

بەوە نەبوو کە لەگەڵ شوێنکەوتەکانی ئایینە جیاوازەکان بە یەکسانی رەفتار بکەن چونکە کاتێك گرنگیان بە گروپێك دەدا هەستی گرینگ بوون لەلای ئەو گروپە هەڵدەماسیو ئەمەش پەرەی بە ئاگری تووڕە بوونی ئەوانەی تر دەدا.

لەراستیدا، خۆراگریو گرنگی پێدانی مەغۆلەکان بە هەر کام لە ئایینە گەورەکانی هەرێمەکەیان پەرەی بە کارتێکەری نەشیاوی دەمارگرژیو رکابەریی نێوان گروپەکان دەداو مەسیحییەکان کە لە سەرەتای حکوومەتی مەغۆلدا بنکەکانیان لەناو کۆمەڵگای ستێپس زیاتر لە بنکەی موسلمانەکانو بووزییەکان بوو، دوا قوربانیی ئەم ململانییە بوون. بەڵام هەر کاتێك بە رابردوودا دەچینەوە، دەبینین کە لە ئاکامدا مەغۆلەکان بەناچاری دەبوایە، لەهەر ناوچەیەکی ئیمپراتورییەتە بەرەو کەرتبوونەکەیاندا، ئایینی باڵادەست پەسەند بکەن، بۆ نموونە بوودیزم لە رۆژهەڵاتو ئیسلام لە رۆژئاوا، لە سەرچاوەکانی ئەو کاتە بەدیار دەکەوێ کە ئەمە چەندە بەهۆی بەختو ناوچاوانی ئەم یان ئەو کەسایەتییەوە بووە [107]. پێدەچێ کە پێگپا وەزیری تەبەتی قوبیلای قائان، بە تەنیای ئامرازێکی بەدەستهێنانی پشتگیری بوو بۆ شیوازی تەبەتی بوودیزم لە چیندا، چونکە ئەگەر وەها نەبوایە لەوانەیە هەرگیز شوێنەوارێکی لە هەرێمی رۆژهەڵاتی ئێمپراتورییەکە لەپاش بەجێ نەدەما. بە لایەنی کەمەوە هەتاکوو سەرەتای سەدەی چواردە، ئاراستەی رووداوەکان لە رۆژئاوا بەتەواوەتی نادیار بوو.

## بەشی حەوتەم

## چیتر ئینجانەی تاقیکردنەوە لە ئارادا نییە

کاتێـــك پۆرتـــەگالی‌و هۆڵەنـــدی‌و بریتانییـــەکان لـــە دەریـــادا رووبـــەروو شارستانیەتی ئاسیایی بوونـەوە، رۆڵـی دووهـەزار سـاڵەی رێگـەی ئاوریـشم لـە گوازتنەوەی نەریتەکانی فەرهەنگی کۆتایی پێهات. وێنەیەکی گـشتیی ئیـسلام، کە فرقەکانی سۆفێەتی وەك نەسـەویەو نەقـشبەندی بـەرێوەیان دەبـرد، هێـزی ئـاینی زاڵ بـوو لـە سەرانـسەری ئاسـیای ناوەڕاسـتدا، کـە تەنانـەت دەگاتـە مەتـەرێزەکانی بـت پەرسـتیی[1] لـەناو رەوەنـدەکانی سـتێپس. لـە سـەدەی شانزدەیەمدا چیتر ئینجانەی تاقیکردنەوەی ئاینی لە ئـارادا نـەبوو کـە رێگـەی ئاوریشم کاریگەرییە جۆراوجۆرەکانی خۆی تێدەرژاند.

## کۆتایی هـاتنی مەسیحییەت لە ئاسیای ناوەڕاستی سەدەکانی ناوەڕاست

مێژوونووسەکان حەز دەکەن زۆر بەئاسانی بەسەر نهێنی ئەم دۆخەدا دەرباز بن کە مەسیحیەت چۆن‌و چ کاتێك لە ئاسیای ناوەڕاست لـەناو چـووە. راپۆرتـە نوێیـەکان کـە رەنگدانەوەیـەکن لـە وێنـای هەڵبەسـتی سـەدەی شـانزدەیەمی کریستۆفێر مارلۆ[2]، بەناوی تەیموری لەنگی گـەورە، چـیتر دەربرینێکـی توونـدو کوورت بەدەستەوە نادەن دەربارەی دەرئەنجامێك کە هۆیەکەی خودی تـەیمور بوو، کە بۆخۆی دەچووە "غزا" تاکوو هەموو نەیارەکانی ئاینیی بنەبڕ بکات.

---

[1]. Paganism، لێرەدا مەبەست لە پەرەستینی بت هەمان شەمەنیزم‌و ئانیمیزمە نـەك بـوودیزم. (نووسەر)

[2]. Christopher Marlowe

مێژوونووسی بەناوبانگی فەرەنسی، ڕێنە گرۆسێت[1] نمونەی ئەو کلێشە ئەورووپییەیە لەم هەڵسەنگاندنەدا کە تەیمور ( لە رووی تقواوە خەڵکی دەکووشت. ئەو نوێنەری تێکەڵەی بەربەرییەتی مەغۆلو دەمارگرژی ئیسلامییە کە لەوانەیە لە مێژوودا بۆوێنە بێت، و نیشانەکەشی شکلی پێشکەوتووی کووشتاری سەرەتاییە کە کووشتن تێیدا لەبەر هۆی ئایدیۆلۆجی انتزاعی ئەنجام دەدرێت، واتە وەك ئەرکێك یان راسپاردەیەکی پیرۆز.)[1]

هەرچەندە بارودۆخ نووسەکانی تەیمور سەرکەوتنەکانی ئەو بەسەر سەرکردەکانی مەسیحی قەوقاز، وەك (کافرەکانی) گۆرجێستان، دەنووسن[2] بەڵام هیچ ئاماژەیان بە غزاکانی دژە مەسیحی ئەو لە ئاسیای ناوەڕاست نەکردووە[2]. لەراستیدا ئۆسقۆفی گەورە دۆمێنیکەنی سولتانییە لە ئێران، جۆن/ یوحەنای دووهەم، دەنووسێت کە تەیمور ((مەسیحییەکانی ئازار نەدەدا - بەتایبەت لاتینەکان - و بەباشی وەریدەگرتن، بەتایبەت بازرگانەکان رێگە پێدراو بوونن کە بۆ ئالوگۆری بازرگانی بچنە هەر جێگەیەك کە دەیانویستو بە شێوەیەك عبادت بکەن وەك ئەوەی کە لەناو جیهانی مەسیحییەت دان[3].))

راستە کە مێژوونووسەکانی تەیمور ناویان نا ((غازی))، بەڵام بەکگراوندی ئەم نازناوە یان بەهۆی ئەو کێشانەیە کە لەگەڵ فرقەکانی موسلمانی رەقیب هەیەتی یان لەگەڵ کافرەکان وەك گرووپە ناسازگارەکانی رەوەندی ستێپس کە بەتووندی رێگری چالاکیەکانی بوون بۆ دروستکردنی ئیمپراتوری[4]. مەسیحییەت، کە لە دەیەکانی رابردوو دا لایەنگری مەغۆلەکانی لەدەست دابوو، چیتر بە هەرەشەی رامیاری دانەدەندرا و لەوانەیە تەیموری نیگەران نەکردبێت. لەلایەکی ترەوە، نەریتی دروست بیرکردنەوە بۆ تەیموری تازە پێگەیشتووی

---

[1]. Rene Grousset

[2]. حبیب السیر، هەمان، ٣٩٦.

رامیاری، لە عەشیرەتێکی تازە موسلمانی بەرلاس[١]، ئامرازێکی پەروپاگەندە بوو کە دەبێ دژی رکابەرەکان، چ موسلمان چ شەمەنی، بەکار ببردرێت[52].

لەوانەیە هەتاکووسەردەمی تەیمور چیتر مەسیحییەك لە ئاسیای ناوەڕاست دا نەما بووبێت. لە رووی نووسراوەی بەردە گۆرەکانی نەستوری وەدەر دەکەوی کە کۆمەڵەکانی ((حەوت ئاو)) (قەزاقێستانی باشوور) لە ساڵێ ١٣٣٨-١٣٣٩ بەهۆی نەخۆشی تاعون لەناو چوو بوون[6]. لەو کاتەدا جێنکشی[٣] سەرکردەی جۆغتایی، کە ڕێگەی بە بانگهێشتکەرەکانی کاتولیلی روومی دابوو کە لە ئەورووپاوە بێنو لە قلمروی ئەودا بانگهێشتی ئایینەکەیان بکەن، لە پیلانگێری بنەماڵەییدا کوژرا. جێگرەکەی نوێموسلمانێك بوو بەناوی عەلی سولتان کە لە رووی دەمارگرژییەوە هانی جێنۆسایدی ئیسلامی دا کە تێیدا هەموو بانگهێتکەرانی کاتولیك کووژران. ئەگەری زۆرە کە نەستورییە خۆجێییەکانیش ئامانجی ئەم جێنۆسایدە بوون، بەتایبەت لە کاتیکەوە کە ژمارەیەکی زۆریان لە حکومەتی جێنکشی دا خاوەن پێگەی حکوومی بوون[7].

یەکێك لە شوێنەوارەکانی رامیاریی تەیمور بە دڵنیاییەوە ئەوە بوو کە پێگەی چینی هەڵبژاردەی موسلمانەکان وەك زانایانی ئایینیو ڕێنوێنە سۆفییەکانی توووند دەکرد. تەیمور ئەم کارەی بە چەند شێوازێك ئەنجام دەدا، پێدانی اقکاعاتو پێگەی مالی معاف لە مالیات، راسپاردنی هەندێ شوێن بەمەبەستی دروستکردنی مزگەوتو خوێندنگاکانی ئایینیو هەروەها بازارەکانو املاك دەگرێتەوە یان کۆمەڵێك خزمەتگوزاری وەك ئاو بۆ ئاودێرییو بابەتی هاوشێوەی تر.

---

[1] . Barlas

[2] . "بە لەبەر چا گرتنی ئەوەی کە ئایینی نەستووری ماوەیەکی زۆر لەناو هۆزەکانی ستێپس هەبوو، دەشێت کە هەندێ لە رکابەرەکانی رەوەندی تەیمور هاوپێوەندی مەسیحییان هەبووبێت، بەڵام لە هیچ جێگایەکی ئەم سەرچاوانە بە روونی ئەم بارە وەك هۆکارێك باس ناکەن." (نووسەر)

[3] . Jenkshi

مجێوریێتی ئەم شوێنانە بە مەرجێك لە دەستی بنەماڵەکاندا دەبوو کە بۆ چەند بەرە داهاتی ئابووریو پێگەیانی دابین دەکرد. لە سەردەمی جێگرەکانی تەیموور، چەندین خانەدانی زانایانی ئایینی بوونە ڕاژوری ئابووری زۆربەی شارەکانی ڕێگەی ئاوریشم وەك سەمەرقەندو بۆخارا.

واپێدەچێ لە چین پاش کۆتایی حکومەتی مەغۆلەکان لە ١٣٦٨، مەسیحییەت لە هاونشینی لەگەڵ ئەو سلسلە دەرکراوە ڕەنجی کێشابێت. مەسیحییەکانی ئۆنگۆت، کرایتو هۆزەکانی تری تورکو مەغۆل بۆ هەمیشە لەهەر جۆرە پشتگیرییەکی دەسەلاتێکی هاودڵ لەگەڵ نەریتەکەیان بێبەش بوون. واپێدەچێ کە بە تێپەربوونی کات، مەسیحییەکانی ستێپس زیاتر لە جاران بۆ هاتنەدی پێداویستییە واتاییەکانیان پەنایان بۆ لاماکانی بوودیی ڕوومی هێنا بێت. لە سەرەتای سەدەی بیستەم، بانگهێشتکەرەکانی کاتولیکی ئەورووپی هەستیان دەکرد کە دەنگدانەوەی نەریتێکی بزر بووی مەسیحیيان (تعمید، دان پێدانان، تدهینی کۆتایی) لەناو هەندێ لە گرووپەکانی مەغۆل وەك ئێرکۆتەکانی[1] ئۆردۆس[2] لە مەغۆلستانی ناوەکی دۆزیبێتەوە[8].

## شکستی مەسیحییەت لە ڕێگەی ئاوریشم

زیاتر لە یەك هەزارە، مەسیحییەت بەشێك بوو لە فەرهەنگی ئایینی ڕێگەی ئاوریشم بەلام لە ئەنجامدا بەشێوەکی سەیر کەمترین نیشانەیەکی لەپاش بەجێ نەما. جگە لە سەرزەوی پەراوێزو لەڕووی رامیاری بێبایەخی ئۆنگۆت لە باکووری چین، ئیتر هیچ وولاتێکی تر لەژێر دەسەلاتی نەستورییەکان دا نەبوو کە بتوانرێ لەگەڵ کاریگەرییە کورت خایەنەکانی پشتیوانی حکومی بەراود بکرێ کە مانەویەتی سەدەی نۆیەم هەیبوو. هەتا سەدەی چواردەیەم ئەم

---

[1] . Erkut
[2] . Ordos

نەریتە سڕابووەوەو چیتر نیشانەیەکی وەهای لەپاش بەجێ نەما بوو، لە بارێکدا هەتاکوو ئێستاش کۆمەڵە گەورەکانی مەسیحییەت لە ناوچە گرنگەکانی ئیسلام لە ئاسیای رۆژئاواو ئەفریقای باکوور، هەر ماون، بەتایبەت نەستورییەکان لە عیراقی باکوورو ئێران. بۆچی چارەنووسی ئەوانەی کە لە ئاسیای ناوەراستدا بوون بەشێوەیەکی تر نووسرابوو؟

ئەمە دۆزێکە کە مێژوونووسە مەسیحییەکانی - کە کەم تا کوورتێك تەنیا مێژووی مەسیحییەتی ئاسیاییان نووسیوە - نیگەران کردووە. لەحنیان تازییەبارانەیە، لەحنی بەڵێنییەکە کە نەهاتۆتەجێ. زۆربەی روونکردنەوەکانیان لەسەر ((چۆنیەتی)) مەسیحییەت چڕ بۆتەوە کە یان وەك تازەگەرییەکی دەبینن (لە روانگەی مەسیحییەکانی رۆژئاوایی) یان لە باشترین باردا زۆر بە سادەو رواڵەتی هەژماری دەکەن. نەستورییەکان بەوە تاوانبار کرابوون کە خەڵکی نوێئاین وەردەگرن بەبێ ئەوەی لەوە دڵنیا بنەوە کە مەسیحییەت لە ژیانی ئەو نوێئاینانە دا راستییەکی واتاییە.[9]))

ئاینی نەستوری لەناو هۆزەکانی ستێپس لە قەراغەکانی شارستانییەتی رێگەی ئاوریشم سەرکەوتووتر بوو وەك لە ناوەندەکانی شاردا، هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە بە ئاینێك بە ((شارستانیەتی لاوان)) ناوی ببەن[10].

ئەم دادوەرییانە پێشتریش لە راپۆرتەکانی سەدەی ناوەراستی ویلیام روبروكو یوحەنا مۆنتە کورڤینو دەبینرێ، کە لە زۆربەی لایەنەکانەوە روانگەی رۆژئاواییەکانی دەربارەی نەستورییەکانی رۆژهەلات بنیات نا. مەسیحییەکانی رۆژئاوایی نەبراوە ئەو نەستورییانەیان تاوانبار دەکرد کە حەزێکی فرقەییان هەبوو، پێدەچێ کاتولیکەکانی روومی سەدەی ناوەراست تارادەیەك لەهاوکاری کردندا راستگۆتر بووبێتن (( بەپێی راپۆرتەکانی روبروكو مۆنتەکۆرڤینو وەها نەبوون)).

راپۆرتە دوایینەکانی دوور روانتر ئالۆزی ئایینی مەسیحی بەبیر دێننەوە، کە پێناچێت هۆزەکانی ستێپس هەرگیز بە تەواوەتی بەسەریدا زاڵ بوو بن، هەروەها ئاماژەیان بە ناوەرۆکی بێگانەی زۆربەی چەمکەکانی مەسیحی کردووە لە ژینگەی ئاسیای ناوەڕاستدا[11]. بەڵام بوودیزم نەك کەمتر ئالۆزر بوو، نەك بەلایەنی کەمەوە لە سەرەتادا، لەگەڵ زەینیەتی خەڵکی ئاسیای ناوەڕاست یان چین گوونجاوتر بوو، پێویست بوو ئەم ئایینە گۆرانی بەسەردا بێت. مەسیحییەتیش لە رۆژهەلاتدا گۆڕا بوو، لەگەڵ هەمووی ئەمانەشدا دیسان نەیتوانی جێ پێی خۆی توونڊ بکات.

لایەنێکی کە جەختی لەسەر نەکراوە لەدەست چوونی کۆمەڵەیەکی بەهێزی نەستورییە کە چاودێری بازرگانی بکات. تەنانەت لە جێگەیەك کە بەفەرمی پشتگیری لە ئایینی نەستوری دەکراو لەگەڵی بەنەرمی رەفتار دەکرا، بۆ نموونە لە پاشایەتی ساسانیدا، دیسان بازرگانەکانیان هەرگیز ئەو پوانانەیان پێ نەبەخشرا کە سەرکردەکانی بووزیی یان موسلمانی رێگەی ئاوریشم بە ئەندامانی نەریتەکەی خۆیانیان دەبەخشی. ئەم رەچاوکردنە تەنیا لە حکومەتی هەندێ لە مەغۆلەکاندا هەبوو و ئەمەش کاتێك بوو کە رامیارییەکانی پشتگیری کردن لە نەستورییەکان لەگەڵ پەرچدانەوەی دژەمەسیحی موسلمانەکان دەرئەنجامی پێچەوانەی هەبوو.

سەرکەوتنە گرنگەکانی بانگهێشتکەرانی نەستوری لە مەسیحی کردنی خەڵکی ئاسیای ناوەڕاست لەناو هۆزەکانی ستێپسدا روویدا چونکە بۆ خۆیان لە سیستەمی بازرگانی رێگەی ئاوریشمدا بەشداریان دەکرد. بە لەبەر چاوگرتنی گورانکارییە ئاشکراکان لە شێوازی ژیان کردنو ئەو بەهایانە کە زۆرجار بۆ وەرگرتنی نەریتێکی فەرهەنگی ئایینی پێویستن، لەوانەیە سەرکەوتنی مەسیحییەت لە ئاسیادا سەرسورهێنەر نەبێت کە شانازی پێوە بکەین کە زیاتر

لە دووهەزار ساڵ لەگەڵ هەمووی ئەو هۆکارانەی کە پێشتر ئاماژەمان پێ کردن، گەشەی کرد،نەك ئەوەی کە بۆ شکەستەکەی بناڵێنین[12].

## دوایین کۆمەڵەی مانەویی

مانەوییەت کە لە چین بە "ئایینی ڕووناکی" ((مینگ جیائۆ[١])) ناسراوە دوابەدوای ئەشکەنجەو ئازارەکانی ٨٤١ ـ ٨٤٦ بوو بە ئایینێکی نهێنیی و لە ژێرخانەکاندا ماویەوە. لەو سەردەمەدا مامۆستایەکی مانەویی بەناوی هۆلۆ[٢] (لەوانەیە تورکی ئۆلۆغ[٣]، بەواتای ((گەورە)) بێت) لە پایتەختەوە لە چانگ ئان سەفەری کرد بۆ فۆجۆ[٤] لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی فۆچیان[٥] و لەوێ کۆمەڵێك جەماوەری پەیداکرد. مارکۆپۆلۆ لە درێژەی گەشتەکانی لە سەدەی سێزدەدا لەگەڵ ئەم کۆمەڵەی مانەوییە ڕووبەڕوو بووەوە هەرچەند بەهەڵە وای زانی مەسیحین[13].

نەریتێکی چینی دەڵێ لائۆتزۆ[٦]، کە بە دامەزرێنەری دائۆییزم بەناوبانگە، بەرەو ڕۆژئاوا سەفەری کردو لەوێ وەك هەناری لێ هات، چەند سەدە دواتر مەلەکەیەکی ئێرانی ئەم میوەی خواردو لێی دووگیان بوو و پێغەمبەر مانی لێ لەدایك بوو. بەپێی ئەم نەریتە، مانی پەیڕەوەکانی لائۆزەو بوودا کردە یەك[14]. ئەمە یارمەتی مانەوییەکانی چینی دا کە پەرستگەکانیان دائۆییو ئایینەکەیان بە قوتابخانەیەکی دائۆییزم نیشان بدەن. ئەم ستراتیجییە نیشانی دا کە لە بەخشینی توانا بە مانەوییەت بۆ مانەوەی لە سەردەمی دەسەلاتداری سۆنگدا بەسوودە چونکە ئەمانە بە گومانەوە دەیانڕوانییە ئایینی بێگانەو

[1] . Ming Chiao
[2] . Hulu
[3] . Ulugh
[4] . Fu-chou
[5] . Fu-ch'ian
[6] . Lao Tzu/ Lao Zi

پەرستگەکانی مانەوییان بە نافەرمی ڕاگەیاندبوو[15]. لەگەڵ ئەم بارەشدا زۆرجار لە سەردەمی سۆنگ بە خراپە باسی مانەوییەکانیان دەکردو پێیان دەووتن ((شەیتان پەرستە ڕوەکخۆرەکان)) - بەداخەوە ووشەناسی یەکەم ئاوانووسیی چینی ناوی مانی، مۆ[1]، بەواتای ((شەیتان))ە[16].

وەك مەسحییەکان لە سەردەمی بت پەرستی، بە چاوێکی هەرەشەوە دەیانڕوانییە ئەم فرقە نەك لەبەر بیرو باوەرەکەیان بەڵکو بەهۆی ناوەڕۆکە نهێنییەکەیەوە[17]. ڕەنجو ئازاریان لە سەردەمی مەغۆلەکان دا کەم بووەوە چونکە مانەوییەکانیان خستبووە سنوری دەسەڵاتی ئۆسقۆفی نەستورییەوە[18]، بەڵام سلسلەی مینگ کە لە سەدەی پانزەدەدا مەغۆلەکانی وەدەر نا، جارێکی تر ئایینی مانەوییەکانی چینی ڕاکێشاوە ژێرخانەکانەوە.

بە پێچەوانەی ئەم هێرشە نوێیە ئەم ئایینە هەتا کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدە لە فۆچیان ماویەوە[19]، و نیشانەکانیشی تاکوو ئەمرۆش هەر ماوەتەوە. پەرستگەیەکی مانەویی لە تسائۆئان[2] نزیکەی پانزدە مایلی باشووری شاری نوێی چیوئان چۆ[3]، بندر گەورەی سەدەی ناوەڕاست کە لەلای ڕۆژئاواییەکان بە زەیتون ناسراوە. ئەم بقعە هەڵگری پەیکەرێکی بەردینە کە یەکەمجار وا دەردەکەوێ کە بوودایە بەڵام لە وورد بوونەوەیەکی زیاتردا، بەپێی تایبەتییە زۆرەکانییەوە دەردەکەوێت کە مانی پێغەمبەرە. جگە لەمە کتیبەیەك لە حەوشەکە دایە کە دەڵێ ((مانی، بوودای ڕووناکی.))[20] لەم دواییانە، لەو نزیکانە قاپو کەوچکی خواردن لەگەڵ نووسراوەی مانەوییان لەژێر خۆڵ دەرهێناوە[21]. بەپێی ڕاپۆرتێك، تاکوو ئێستاش هەر پەرستگەی تسائۆئان کراوەیە، پیرێژنی پارسا مجێوری ئەونو عیبادەتی تێدا دەکەنو پارێزگاری لە

---

[1] . Mo
[2] . Ts'ao-an
[3] . Ch'uan-chou

نەخشی بەرجەستەی مانی دەکەن‌و بە وێنەی بوودای شاکیەمۆنی بەژمار دێنن[22].))

## زیاتر ئیسلامی بوونی ڕۆژهەلات

سوپای چەنگیزخان یەکتییەك بوو لە هۆزەکانی تورك‌و مەغۆل کە توانیبووی لە ماوەیەکی کورتدا بیانهێنێتە ژێر دەسەلاتی خۆی ﴿بیانکات بە "ئیل"﴾، پاش مەرگی چەنگیز ئەو ئیمپراتورییەتە گەورەی کە پێکی هێنابوو بەرەبەرە پرۆسەی دوورودرێژی شیتەل بوونی دەست پێ کرد. بەدرێژایی ساڵەکان، دەیەکان‌و سەدەکانی دواتر ئەم گرووپە عەشیرەتییانە یەکدییان دەگرتەوەو دووبارە جیا دەبوونەوە بۆ ئەوەی بتوانن وەلامدەری پێداویستیەکانی کات‌و شوێن بن، جا چ پێداویستی بەرگری کردن لە خۆیان بێت لە هەمبەر هێرشی هۆزەکانی تر یان خود بەری خستنی ئیلغار بێت بۆ دەسەلاتەکانی واحە[23].

خوازیارانی دەسەلات زۆرجار دەبوونە موسلمان بەم مەبەستە کە اقتداریان لەناو بازرگانەکان‌و دانیشتوانی شارەکان پتەوتر بکەن، بەلام ئەم ڕەوەندە هەندێجار دەرئەنجامی پێچەوانەی دەبوو بە شێوەیەك کە زۆرێك لە ڕەوەندکانی ستێپسەکان لەگەلّ ئەم نویّ ئایینانە ڕکابەرییان دەکرد[24]. بەپێی مێژووی ڕشیدی، لە نێوەی سەدە پانزدە نوێموسلمانێك بەناوی تەغلەغ تەیمور چۆغتایی، هەرکام لە هاوڕێیەکانی کە نایاندەویست ببن بە موسلمان دەیکوشتن: ﴿تەغلغ‌و ڕێنماییەکارە واتاییەکەی﴾ ((بڕیاریان دا بۆ بلاوکردنەوەی ئیسلام یەکەبەیەکەی ئەمیرەکان ووت‌و وێژ بکەن‌و ئەمەش دەبێ

بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە باش بێت بەڵام ئەوانەی کە ملکەچ نەدەبوو دەبێ وەك کافرو بت پەرست بکوژرێن.[25] [1]))

دواتر، پاش ئەوەی کە بانگهێشتکەرێکی کە سوێندی سۆفایەتی شکاندبوو وەك موعجیزەیەك لە نەبەردێکی ڕووبەڕوودا شەرکەرێکی بەناوبانگی شکەست دا ((خەڵك هاواری بەرزی ئافەرینیان دەکێشاو لەو ڕۆژە ١٦٠٠٠٠ کەس سەریان تاشیو بوون بە موسلمان.[26]))

لە دواترین دەیەی سەدەی چواردەیەم، بچووکترین کوری تۆغلەغ تەیمورو جێگری داهاتووی ئەو بەناوی خێرخاجە ((غەزای خۆتای گرتە ئەستو)) ( لێرەدا پێدەچێ خۆتای بەواتای ناوچەی تاریمە). شاری قەراخۆجەو تورفانی لە ڕێگەی ئاوریشم داگیرکردو گووشاری خستە سەر دانیشتوانی کە ببنە موسلمان، ئێستا پێی دەڵێن دارالسلام[27].

موحەمەد خان کوری خێرخواجە بە نۆرەی خۆی رامیاری زۆرەملی موسلمانکردنی رعیتەکانی درێژە پێدا. دەڵێن ئەم رامیارییەی وەها بەهێزەوە درێژە پێدەدا ((کە لە سەردەمی پیرۆزی ئەودا زۆربەی هۆزەکانی مەغۆل بوون بە ئیسلام.)) پێدەچێ ئەم هەولانە بەرەنگاری لەگەڵ کراو بێت چونکە ((هەموو دەزانن کە چەندە پرۆسەی توندی جێبەجێ کرد تاکوو مەغۆلەکان بە شێوەی کەسانێك لێبکات کە بڕوایان بە ئیسلام هەیە. ئەگەر بۆ نموونە مەغۆلێك کەشیدەی نەبەستبا، ئەوا بزماری نالی ئە سپیان لە سەری دادەکووتا: رەفتاری لەم شێوە باوبوو.[28]))

---

[1] . محمد حیدر دوغلات. تاریخ رشیدی. چونکە نووسراوەی تاریخ رشیدی بە دەست نەکەوت نووسراوە ئینگلیزییەکەی وەرگێردرا. و.

ئەو گرووپانەی کە ئێستا بە قەزاق و قیرقیز ناسراون و ناوی دوو کۆماری ئێستای ئاسیای ناوەڕاست لەوانەوە وەرگیراوە، دواییترین یەکێتی عەشیرەیی هەمیشە لە گۆڕاندا بوون کە بوونە موسلمان، گروپێکی تر کە مۆلفەی ئەم یەکێتییە بوو، قەلموق/ قەلمەقاقەکانی[1] مەغۆل بوون کە هەرگیز نەبوون بە موسلمان بەڵکوو بوودیزمیان پەسەند کرد.

ناوی قیرقیز (قەزاقەکانی ئێستا بەر لە سەدەی بیستەم بەم ناوە ناسراو بوون و بە قیرقیزەکانی ئێستایان دەووت ((قەراقیرقین))) یەکەمجار لە سەرچاوەکانی ئیسلامی سەدەی دەیەم ئاماژەیان پێکراوە وەك داگیرکەرانی شاری ئاق سو (ئاوی سپی) لە ناوچەی حەوت ئاوی قەزاقیستانی باشوور[29].

لە ڕاپۆرتەکانی چینی دا هاتووە کە کاروانەکانی موسلمان هەر سێ ساڵ جارێك لە کۆچەوە ئاوریشمیان بۆ ئەم هۆزە دەبرد. بەڵام لەوانەیە زیاتر قیرقیز/ قەزاق لەم گروپە یەکجێ نیشتەجێکراوە جودا بوو بێتن، چونکە سەرچاوەکانی موسلمان هەتا ناوەندەکانی سەدەی شانزدەیەم ئەمانەیان بە کافر دادەنا[30]. یەکێك لەم سارچاوانە قیرقیزەکان بە((دروستکەری هەموو ئاژاوەکانی مەغۆلستان)) دەزانی و ڕوونی دەکاتەوە کە ((ئەوانە هێشتا کافرن و دووژمنایەتییان لەگەڵ ئیسلام هەر لەمەوەیە.[31]))

موسلمانێکی تر لە ١٥٨٢ دا دەنووسی و بەم شێوە هاوتای دەکات کە ((ئەوان نە کافرن نە موسلمان.[32])) نووسەرێکی سەدەی حەڤدەیەم دەڵێ قیرقیزەکان بت دەپەرستن و موسلمانی (ڕاستەقینە) نین[33]. لەم ڕستانەی دواییەوە دەتوانین تێبگەین ئەو هۆزەی باسیان کرا هەندێ لە کردارو نیشانکان و زاراوەکانی ئیسلامیان وەرگرتبوو و لە هەمان کاتیشدا زۆربەی میراتی ئایینی نەریتەکەی خۆیانیان پاراستبوو یان کردبوویانە ((ئیسلامی)).

[1]. Qalmaq

لەراستیدا ئەمە هەمان ئاوێتەبوونی نەریتەکانە کە ئەمڕۆ دەتوانرێ لەناو ئەم هۆزانەدا ببینرێ.

ئەو ناوەرۆکە ئیسلامییەی کە ئەم هۆزانەی دانیشتووی ستێپس لە درێژەی سەدەکانی پێش‌وپاش سەردەمی مەغۆل وەریان گرت تارادەیەکی زۆر پێوەندی بە کاری بانگهێشتکەرانی سۆفییەوە هەبوو وەك ئەحمەد یەسەوی (١١٦٧ــ١١٠٣)، نجم الدین کبری (فت١٢٢١) و مریدەکانیان کە ئەوانیان بەخاوەن کرامت دەزانی، وەك مەسیحییەکان‌و ئەوانەی کە بەرلەوان بوون، زۆربەی جار رۆڵێکیان دەگرتە ئەستۆ کە بەشێوەیەکی نەریتییانە شەمەنەکان ئەنجامیان دەدا، هەندێجار لەو باوەردا بوون کە یش دەتوانن وەك شەمەنەکان هەڵفرن[34]. ئەمرۆکەش لەناو قەزاقەکاندا دەتوانین کۆمەڵێك شەمەن هە کە بەسودوەرگرتن لە قۆرئان‌و نووسراوەی عەرەبی‌و شتی لەم شێوە ئایینەکانی نەریتی شەمەنی بەکاردێنن[35]. هەمیشە ((کەراماتەکان)) فێڵی سەرکەوتووی بانگهێشتکەرەکان بوو لەناو هۆزەکانی ستێپس‌و ئەو رێنماییکارە سۆفییانە کەم بوون کە بەپێی نەریتەکەیان بەلایەنی کەمەوە پاش مردنیان خاوەنی هێزی موعجیزە یان هێزی شفابەخش نەبووبێتن[36].

ابن بطوطە، گەریدەی سەدەی چواردە دەڵێ کە رەوەندەکانی دەورووبەری سەمەرقەند (تاتارەکان) تەنانەت پێش موسلمان بوونیش سەردانی گۆری قثم بن عباس (کورە مامی پێغەمبەر کە لە ٦٧٦ شەهید بوو) دەکرد کە ((بە هۆی نیشانەکانی موعجیزە کە لێیان بینیبوو خێرو چاکە وەرگرن[371].))

پێدەچی کە هەندێ لە پیاوانی ئایینی وەك گەرنتییەکی کارەکانیان، سوودیان لە هەڵخەلەتاندنی زارەکیش وەرگرتبێت. ابن بطوطە دەگێڕێتەوە

[1]. ابن بطوطه، سفرنامه، ترجمه محمد علی موحد، بنگاه ترجمه و نشر کتاب. تهران ١٣٣٧: ٣٨٤.

کێبێك[1]، کە لە ١٣٠٩ـ١٣٢٦ لە ماوراءالنهر سەرکردەی *ئۆردوی* سپی چۆغتایی بوو لە ئامۆژگاریکەرێك بەناوی بدرالدین مەیدانی پرسیاری کە موسلمانەکان دەڵێن کە هەموو شتێك لە قورئاندا هەیە، پێم بڵێ ئایا ناوی منی تێدایە. ئامۆژگارەکە لەوەلامدا ووتی: بەڵێ. ووتەی ئەوە ((فی ایّ صورة ماشاء رکّبك)) لە ئەنجامی ئەم زمان شیرینییە کێبێك ((نەرمو نیانییەکی زۆری نیشان داو ڕێزی موسلمانەکانی زیاتر کرد[382].))

ئامۆژگارە سۆفییەکان وەك ئامۆژگارەکانی نەستوریو مانەویی پێش خۆیان، وەك بەشێك لە راسپاردە بازرگانییەکان سەفەریان بوستێپسەکان دەکرد. بەم پێیە، ئەو ڕەوەندانەی کە زیاتر بیرۆکەی بازرگانیان هەبوو، لەوانەیە لە بانگهێشتی ئەم بانگهێشتکەرە خاوەن کەرامتانە سودیان بینیبێت کە بەهۆی پەسندکردنی نەریتی ئایینی ـ فەرهەنگی بازرگانەکانەوە بوو کە لە شارەکانو بۆنە تایبەتەکان سوودی زۆری بازرگانییان دەست دەکەوت.

[1] . Kebek

[2] . هەمان، لا ٣٧٥.

## دەرئەنجام

مێژوو نووسانی ئەورووپی، دروستکەرانی چەمکی ڕێگەی ئاوریشم، بەگشتی هاودەنگن کە ئەم چەمکە لە سەدەی شانزدە دا واتاکەی لە دەست دا. نەبوونی مرجعیتی ڕامیاری یەکگرتوو بووە هۆی ئەوە کە لە ئاسیای ناوەڕاستی دژواری دووری ووشکایی دا بازرگانی کالا بەنرخەکان کەمتر ئەنجام بدرێت[39]، هەرچەند بازرگانی کالا پێویستەکان بەهەمان شێوەی جاران لە ناوچەکەدا چالاکانە ئەنجام دەدرا[40].

لە بەرامبەردا، بازرگانی دژواری دور جارێکی تر خۆی لەگەڵ ڕەهەندێکی نوێ هاوئاهەنگ کردەوە کە هیندی لە بەشی باشووری ڕۆژهەڵات بە دەسەڵاتی تازە سەرهەڵداوی ڕووسیا لەباکووری ڕۆژئاوا دەبەستەوە[٤١]. بەلایەنی کەمەوە، خەڵکی بەشی ڕۆژئاوای ئاسیای ناوەڕاست توانیان لە تەواوەتی سەدەکانی حەڤدەو هەژدەیەمدا ڕۆلی خۆیان وەك دلالەکانی نێوان ئیمپراتورییەتەکانی تێزاریو مەغۆل (گورکانی هیند) بپارێزن. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هیندوەکان ڕۆڵی گرنگتریان دەگێڕا، ئەمانە لە سەرتاسەری ئێرانو ئاسیای ناوەڕاست کۆمەڵەی بازرگانیان دامەزراندو تۆرەکانیان تاکو مۆسکۆ و ئامستێردام پەرەی سەند.

لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەیەم، ئیمپراتۆرییەکانی بریتانیاو ڕووسیا لە ئاسیای ناوەڕاست یەکگرتوو بوونو ئەو شوێنەیان کردە ناوچەیەکی نێوانگرو یەکجاری پرۆسەی بازرگانیان بەهۆی نائارامی قاچاغچییەکان ڕاگرت. چینیەکان پەتەکەیان لە ملی تورکستانی ڕۆژهەڵاتدا توند کردو ئاسیایان وەك کێکێکی ئیستعماری کردە سێ پارچە. ماوەیەکی زۆری سەدەی بیستەم، هۆزەکانی ئاسیای ناوەڕاست جیا لەیەکدیو لەژێر دەسەڵاتی حکوومەتەکانی بێگانەدا

ژیاون، تەنیا لە دوو دەیەی رابردوودا دووبارە سنورەکانی ئیستعماری بەرەبەرە کرانــەوەو پێوەندییــەکانی بازرگــانیو فەرهــەنگی رێگــەی ئاوریــشم وردەوردە دەستی پێکردەوە *.

لە روانگەی فەرهەنگی ئاینییەوە، ئاسیای ناوەڕاستی سـەدەی شـانزدەیەم یەکێك لە ناوچەکانی جیهانی ئیسلام بوو کە زۆرتـر لـە بەشـەکانی تـر ببـوو بـە ئیسلامی، ئیسلامیتر لـە ناوچـە گرنگـەکانی عـەرەبو ئێرانـی ئاسـیای رۆژئـاواو میـسر، کـە لەمـە دواییـدا تەنانـەت تـاکوو ئیـستاش کەمینـەی غیرئیـسلامی بـە نادیاری هەر مـاون. تـەنیا ئـەفریقای بـاکوور، کـە ئـەویش لـە رووی گرنگییــەوە ناوچەی بەنرخی شارستانییەتی پەراوێزی ئیسلامییە، تارادەیەك لە رووی پلەی بوونە ئیسلامی لەگەڵ ئاسیای ناوەڕاست رکابەری دەکات.

ووتوویانە کە دەکرێ ئەم پارادۆکسە ئاشکرایە بەم راستییە روون بکرێتــەوە کە ئاسیای ناوەڕاست لـە ناوەنـدەکانی ئـایینی رکابـەر وەك مەسـیحییەت دوور بوو، ئەو ناوەندە ئاینییانەی کە پێشتر لەوێ هەبوون، لاواز بوونو پێوەندییان لەگەڵ مرجعیتی ئاینی ناوەندی دژوار بوو یان هەر هیچ پێوەندییــەك لـە ئـارادا نـەبوو[42]. بـەڵام ئـەم روونکردنـەوە لـە وەڵامدانـەوە هەنـدێ پرسـیارەکان خـۆی لادەدات. بۆ نموونە بۆچی مەسیحییەت لە هیندی باکوور ماوەو چۆن ناوەرۆکی مانەوییــەت ماوەیــەکی زۆر لــە فۆچـیان وەك نـاوەرۆکێکی جیاکــەرەوە لــەناو زەریای ئاینی گشتی چینی دا پارێزرا؟

روونکردنەوەیــەکی دیکــە، کــە رێگــەری گوونجـان لەگــەڵ روونکردنەوەکــەی پێـشوو نییــە، ئەوەیــە کــە هۆزەکـانی ئاسـیای ناوەڕاسـت بەشـێوەکی گـشتی،

---

* " مەبەسـت لـە سـنوورەکانی ئیـستعماری، هەرێمـەکانی ئیـستعماری بریتانیـاو رووسـیایە کـە نەتەوەکانی ئاسیایی، لە ناوەندەکانی سەدەی نۆزدەیـەم هـەتاکوو کۆتاییـەکانی سـەدەی بیستەم (لەگەڵ رووخانی ئێمپراتۆری یەکێتی سۆڤییەت)، لە یەکدی جیا دەکردەوە." (نووسەر)

ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، هەڵواسراوی بازرگانییەك بوون کە لە دەستی موسلمانەکاندا بوو. ئەمە تەنانەت دەربارەی ڕەوەندەکانی قەزاق و قێرقیزیش ڕاستە کە داویین هۆزەکان بوون کە بوونە موسلمان. هەروەها ئیسلامی بوونی ناوچەکانی دیکەی جیهان کاتێك بەشێوەیەکی زۆر تەواو ڕووی دەدا کە ڕاستەوخۆ بەو ڕێگە بازرگانیانەوە بەسترابوە کە بەدەست موسلمانەکانەوە بوو، وەك کەنارەکانی ئەفریقاو باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا. بە پێچەوانەوە لە هیندو سپانیا کە جەماوەری غیر ئیسلامی زۆرینە بوون، وەها کە هەڵواسراوی ئابووریيان گشتاندووە، لە بازرگانی دژواری دوور نزیك نییە.

زۆرەملی ڕاستەوخۆ گەورەترین هۆکاری لایەنێکی بچووکی ئیسلامی بوونی ڕێگەی ئاوریشم بوو. هۆکاری گەورە، کە هۆکارەکانی دیکە لەوەوە وەرگیراون، هەمان یەکەمین و دوایین ململانێی موسلمانەکان بوو لە بازرگانی دژواری دووردا.

چیرۆکی ئابینەکانی ڕێگەی ئاوریشم بەشێکە لە مێژووی بەرینی گفتوگۆی فەرهەنگەکان، گفتوگۆیەك کە بە چالاکی کەسانێك مەیسەر بوو کە کارامەیی بازرگانی و هەستی دۆزەرانەیان هەبوو تاکوو بتوانن بە جۆرێکی سودهێنەر بەسەر دژوارییە گەورەکان و مەترسییەکانی سەفەر کردندا زاڵ بن لە ناوەڕاستی دوورگەی پان و بەرینی ئوراسیا.

# پێرست

## بەشی یەکەم

ڕێگەی ئاوریشم و ڕێبوارەکانی.......... ٥
زاناکان یاخود هەڵخەڵەتێنەرەکان.......... ١١
ئایین و بازرگانی .......... ١٤
سەغدییەکان .......... ٢٤

## بەشی دووەم

ئایینو بازرگانی لە ئۆراسیای کۆن .......... ٣٨
زەردەشت .......... ٤٤
ڕووبەڕووبوونەوەی ئایینی ئێرانیو یەهودیی .......... ٥٠
کاریگەرییەکانی ئێرانی لەسەر یەهودییەت .......... ٥٣

## بەشی سێهەم

بوودیزمو ڕێگەی ئاوریشم.......... ٦٢
قوتابخانەکانی بووزیی ڕێگەی ئاوریشم.......... ٦٦

## بەشی چوارەم

لیزگەی داهێنەران: .......... ١٠١
نەستورییەکانو مانەوییەکان لە ڕێیوبانەکانی ئاوریشم.......... ١٠١

## بەشی پێنجەم

بەئیسلام بوونی ڕێگەی ئاوریشم.......... ١٤٥

## بەشی شەشەم

زیانی لێك نزیکی ئایینەکانی سەردەمی مەغۆلان .......... ١٧٨

## بەشی حەوتەم

چیتر ئینجانەی تاقیکردنەوە لە ئارادا نییە .......... ٢٢٤
دەرئەنجام .......... ٢٣٧




لە کۆتایی

دەیەکانی سەدەی نۆزدەهەم دا، سەرسامی ئەوروپییەکان بە ئەوپەری جیهان گەیشتە لوتکە. ئیمپراتۆرییەکانی بەریتانیاو فەرەنسا جیهانیان بەرفراوان کردبوو و کاربەدەستەکانیان لە شوێنە داگیر کراوەکانەوە شت ومەك و چیرۆکی سەیرو سەمەرەیان بۆ دەناردن. شاعیرو وێنەکێشەکانیش لەسەر لاپەڕەو بومەکانیان، خەون و ئاواتەکانیان دەربارەی ڕۆژهەڵاتی سەرنجڕاکێش تۆمار دەکرد.

ROJHELAT
دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی
ڕۆژهەڵات